**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **جیهانگیریی میدیا**
- **ئامادەکردنی:** محەمەد عەبدوللا کەلاری
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال ڕەواندزی
- **بابەت:** ڕاگەیاندن
- **بەرگ:** ئاسۆ مامزادە
- **چاپ:** یەکەم ٢٠٠٩
- **ژمارەی سپاردن:** ٥١٦
- **نرخ:** ٢٥٠٠ دینار
- **تیراژ:** ٧٥٠
- **چاپخانە:** چاپخانەی خانی (دهۆک)

**زنجیرەی کتێب (٣٦٣)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com



## ناوەرۆک

## پێشەکی:

لەم کوردستانە، ئەگەر ڕێت بکەوێتە کتێبخانەیەك و بتەوێ لە بارەی میدیا بە شێوەیەکی گشتی و میدیای کوردستان بەتایبەتی کتێبێکت دەستبکەوێ، زەحمەتی زۆر دەبینی و لەوە ناچێت هەوڵەکەت سەرکەوتوو بێت. ئەوەش لەبەر هەژاریی کتێبخانەی کوردییە لەم ڕووەوە، نەخاسمە پرسی میدیا لە چەرخی جیهانگیریدا، چەرخێك کە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا وەرچەرخانێکی گەورەی لەدونیادا هێنایە کایەوە. ڕەنگە ئێمەی کورد ئەمجارەیان بەخت یاوەرمان بێت کە لە دەروازەی دەرکەوتنی ئەم ئاسۆ نوێیەی میدیادا، میللەتیش ئازادیی سیاسی وەدەستهێناو، ئیدی کەم تا زۆر هەوڵیداوە خۆی لەگەڵ بگونجێنێ و سوودی لێوەربگرێ.

نەبوون یان کەمیی کتێبی زانستیی لە بارەی میدیا، پێموایە گوناهە سەرەکییەکەی ناگەڕێتەوە بۆ ڕۆشنبیرانمان، هێندەی بۆ ئەو ڕژێمانەی پێشوو دەگەڕێتەوە کە هەمیشە ویستوویانە ئەم بوارە لە ڕووی ئەکادیمییەوە لەبەردەم تاکی کورددا زۆر تەسك بکەنەوە، ئەگەر نەڵێین دایبخەن، ئەمەش لە ڕوانگەی گرنگی و هەستیاری ئەم بوارەیە لە ژیاندا، بۆیە ئەوەشی کە بەرهەم هاتووە، لە ئاکامی هەوڵی تاکلایەنانە و هێزی ئارەزووی پەنگخواردووی ناخ بووە بۆ کاری ڕۆژنامەنووسی.

بەندە هەستی بە بوونی ئەو بۆشاییە کرد، بۆیە لە هەوڵێکدا بە سوودبینین لە وەرگێڕانی چەند سەرچاوەیەکی نوێی عەرەبی لە کتێب و لە تۆڕی ئینتەرنێت، هەروەها لە کۆمەڵێك گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردی، بەرهەمێکی لەم چەشنەم ئامادەکرد، کە سەرەڕای کەموکوڕیی هاوکات دڵنیام تێرو پڕیش نییە. بەوپێیەی بابەتەکە زۆر هەڵدەگرێ و پەرەسەندنەکانیش



لەمبارەیەوە جۆرێکە، کە عەقڵ ناتوانێ وێنای بکات. لەکاتێکدا کە ئامادەکردنی بابەتێکی لەم چەشنە زۆر زەحمەتە، بەتایبەتی کە پشکی شێری زانیارییەکانی نێو ئەم باسە لە زمانی عەرەبی وەرگیراون، ئاشکراشە کە زۆر لە نووسەرانی عەرەب بە چ تێڕوانینێکی نەرێنیانە دیاردەی جیهانگیری بە هەموو ڕەهەندەکانییەوە شەن و کەو دەکەن، بۆیە هەوڵمداوە لە ڕوانگەیەکی واقیعییەوە بڕوانمە پرسەکە و تیشك بخەمە سەر ئەرك و ڕۆڵی میدیا لەم جیهانە بە گوندبووەدا، دەخوازم جێی سوود بێ. هاوکات دانیش بەوەدا دەنێم کە ئەم کارەی من ئەکادیمی نییە و زیاتر لە ڕوانگەی ڕۆژنامەنووسیکەوە داڕێژراوە، نەك توێژەرێکی ئەکادیمی.

نووسەر

ئایاری ٢٠٠٨/ هەولێر

# بەشی یەکەم

## جیهانگیری

"ئێمە لەبەردەم جەنگێکی سیاسی و شارستانی ترسناکداین. لە رابردوودا گەورە بچووکی دەخوارد، بەڵام ئێستا ئەوەی خێرایە خاو و خلیچکەکان دەخوات".

(تۆماس فریدمان)

جیهانگیری زاراوەیەکی ورد نییە بۆ ئەو گۆڕانەی لە بواری سیاسی و میدیا و ئابووری و بازرگانی و کوولتورو شێوازی ژیاندا بەسەر جیهاندا هاتووە. بەپێی ئەو رەخنانەش بێ، کە لە جیهانگیری دەگیرێ، ئەوا جیهانگیری رەوتێکی پڕ لە مشتومڕییە و جیهان بەرەو زیاتر ئاوێتەبوون و یەکگرتوویی ئابووری دەبات. هەندێ وای دەبینن کە پەیدابوونی جهانگیریەتی هاوکات بوو لەگەڵ شۆڕشی گەیاندن کە هەستی ئێمەی لە بارەی هەبوونی سنوور و درککردنمان بە جیهان خامۆش کرد. گەیاندنی نوێ و میدیای (بینراو و بیستراو و خوێنراو) گرنگترین ئەو هۆکارانە بوون، کە بەشداربوون لە زووتری تێکەڵبوونی ئابوورییە جیهانییەکان، هەروەها رۆڵی کاریگەریشی هەبوو لە هێنانە ئارای سیستمێکی تازەی جیهانی، بەپێی ئەمە بە تەکنۆلۆژیای گەیاندن و کۆمپیوتەر دەوترێ (دایبابی جیهانگیری).

جیهانگیری هەوڵی پەخشکردنی یەك ناسنامەی باڵاو یەك رۆشنبیری جیهانی دەدات. سەرکەوتنی ئەم هەوڵە، بەندە بەوەی کە مرۆڤەکان هەموو وەك یەك بیر بکەنەوە و لە شتەکان بڕوانن. پرۆسەی بەجیهانیکردن و وێناکردنی جیهانێکی گشتگیر، پشت ئەستوورە بە باکگراوندێکی تەکنەلۆژی و زانستی و ئابووری، کە لە رێگەی پێکهاتەی رێکخراوە جیهانییەکانەوە هەوڵدەدات یەك بەهای باڵاو یەك سیاسەت و یەك بەهای کۆمەڵایەتی و کوولتوری باڵادەست جێی شتە جیاوازەکان بگرێتەوە. هەر بۆیە جیهانگیری بە واتای "گواستنەوەی شتەکان لە سنووری بچووکەوە (دەوڵەت) بۆ بێ سنووری گەورە (هەموو جیهان)" هاتووە.

لە دنیای ئەمڕۆدا هەڵوێست لە بارەی جیهانگیری جۆراو جۆرە، هەندێکیان (بەتایبەتی موسڵمانان) وای دەبینن شاڵاوێکی ترسناکی پڕ زیانە. مەسەلەی رەتکردنەوەی جیهانگیری بە شێوەیەکی رەها، وەك رەتکردنەوەی رەهای هەموو شتەکان وایە، ئەمەش ئەگەر لە ڕووی فکری و تیۆرییەوە بگونجێ، بێگومان لە رووی واقیع و پراکتیکەوە کارێکی راست و ئاسان نییە، چونکە جیهانگیریش وەکو هەر دیاردەیەکی دیکەی جیهانی سنووری سیاسی و جوگرافی نازانێ، سەرەنجام دەبێ مامەڵەی ژیرانە و واقیعیانەی لەگەڵدا بکرێ، بۆیە هەڵوێستی راست و واقیعی لە جهانگیریەتی و هەر دیاردەیەکی تری جیهانی ئەوەیە کە بیانناسین، پاشان مامەڵەی خۆمانی لەگەڵدا بکەین، باشووری جیهان (وڵاتانی جیهانی سێیەم) بە گشتی ترسێکیان لە جهانگیریەتی هەیە، بەڵام هەرچییەك بێ زادەی عەقڵە.



## چەمکی جیهانگیری :

جیهانگیری زاراوەیەکی نوێیە، لە زمانی ئینگلیزی لە وشەی (Global)، واتە جیهانی یان نێودەوڵەتی وەرگیراوە. زۆرجار لەگەڵ وشەی (گوند)دا کۆدەکرێتەوە، بۆیە دەبێتە (Global Village)، واتە گوندێکی جیهانی. ئەم چەمکە زۆرجار لە بواری سیاسی و ئابووریدا بە واتای هەبوونی دەسەڵاتی سیاسی و دامودەزگا ئابوورییە نێودەوڵەتییەکان بەکارهێنراوە، کە لە زۆر شوێنی ئەم جیهانەدا هەن و کاریگەری بەهێزیان لە بواری ئابووری یان سیاسەتی ناوخۆدا (واتە لەناو ئەو وڵاتانەی کە تیایدان) هەیە. دەستنیشانکردنی پێناسەیەکی گشتگیر بۆ جیهانگیری، نەك تەنیا کارێکی زەحمەتە، بەڵکو کارێکە رێشی تێناچێ. هەر قوتابخانەیەکی فکری و فەلسەفی و تەنانەت بیریار و رۆشنبیرەکان لە روانگەی خۆیانەوە ئەم چەمکە دەناسێنن.

زاراوەی (جیهانێکی یەك پارچە) یان (جیهانێکی یەکسان) و کۆکردنەوەی جیهان لە یەك شێوازو لە چوارچێوەی یەك شارستانیەتدا، ناونانە لە پڕۆسەیەکی زۆر فراوان. جیهانگیری وەك زاراوە مەبەست لە شتێکە کە بەجیهانی بکرێ، واتە ئاستی نیشتمانی و هەرێمی تێپەڕاندووە و باس لە شتێك دەکات، کە گوێ بە سنوورەکان نەدات و دەیەوێ هەموو خاڵێکی گۆی زەوی بگرێتەوە. هەندێ لە توێژەران پێیانوایە جیهانگیری واتە، "تێکئاڵانی لایەنە ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی، روناکبیری و تەکنەلۆژییەکان لە چوارچێوەیەکی جیهانیدا، دان بە سەروەریی هیچ وڵاتێك و بوونی سنوورەکەی و تایبەتمەندێتی کۆمەڵگە مرۆڤایەتییەکەی هەروەها ناسنامە کوولتورییەکەی نانێ".

(جۆن تۆملتسۆن)، جیهانگیری بەوە پێناسە دەکات کە "دیاردەیەکە ئاماژە بەو چالاکییە گەشەکردووانە دەکات کە تایبەتن بە پەیوەندییە تێهەڵچووە ئاڵۆزەکانی نێوان کۆمەڵگە و کوولتور و دامەزراوە و تاکەکان لە چوارچێوەی جیهاندا". ئەو وای بۆ دەچێ جهانگیریەتی بزاڤێکی کۆمەڵایەتییە کە وێکچوونی هەر دوو رەهەندی کات و شوێن لەخۆدەگرێ و دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی ماوە و دوورییەکان لە رێگەی ئەو کەمبوونەوە کەمەی لە کاتدا دێتە کایەوە، بەجۆرێك وا دەکات جیهان زۆر بچووك بێتەوەو واش پێویست دەکات مرۆڤەکان لێك نزیك ببنەوە.

(مەك گرۆ) دەڵێ: "جیهانگیری واتە، زۆربوونی ژمارەی پەیوەندی و پەیوەستبوونە بەرابەرییەکان کە لەسەروو کۆمەڵگە و دەوڵەتانەوە گەشە دەکەن و سیستمێکی نوێی جیهانی

پێکدێنن. جهانگیریەتی بە دیاردەیەك دەگوترێ کە لەمیانەیدا، رووداو و بڕیار و چالاکییەکانی پارچەیەکی جیهان، دەتوانێ کاریگەری گرنگی لەسەر تاك و کۆمەڵی پارچە دوورەکانی تری گۆی زەوی هەبێ".

چەمکی جیهانگیری ئاماژەکردنە بۆ بچووکبوونەوەی جیهان، لە هەمانکاتدا بۆ بەهێزبوونی ئاگاداری لە جیهان. بەرەو پێشچوونی خێرای تەکنەلۆژی و بەرفراوانبوونی رۆژ لە دوای رۆژ چالاکییە ئابوورییەکان، بەهۆکاری ئەو بچووکبوونەوەیە دەزانرێ. ئەم بچووکبوونەوە فیزیکییەی جیهان بیرۆکەی (بەگوندبوونی جیهان)، هاوڕان لەگەڵ گۆڕانی پەیبردن بە کات و شوێن بۆ ئاماژەدان بە "هەلومەرجێك کە لەژێر سایەیدا کات و شوێن، بە جۆرێك رێکخراوە کە ئامادەیی و نا ئامادەیی پێکەوە دەبەستنەوە" پەنا دەباتە بەر چەمکی جیایی کات و شوێن.

جهانگیریەتی دەبێتە هۆی فراوانبوونی دەروازەکانی کرانەوە، بە ئەندازەیەك، کە بەهۆیانەوە تۆڕەکانی پەیوەندی و سیستەمەکانی بەرهەمهێنانی ناوخۆیی و جیهانی پێکەوە دەبەستێتەوە، بە جۆرێك کە چیتر ناتوانرێ بەتەنها لە چوارچێوەی لۆکاڵدا بڕوانرێتە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، ژیانی رۆژانەی ئێمە وای لێدێ، کە مامەڵە کۆمەڵایەتییەکان لەناو جەرگەی تۆڕە جیهانییەکاندا دەردەکەون.

لەم روانگەیەوە (هارڤای) دەڵێ: "جیهانگیری بریتییە لەگەیشتن بەقۆناغێکی فشارهێنانی توندی (کات و شوێن)، کە کاریگەرییەکی ئیفلیجانە و تێکدەرانەی لەسەر تیۆرە سیاسی - ئابوورییەکان، هاوسەنگی هێزی چینەکان، هەروەها فەرهەنگی کۆمەڵایەتی هەیە". گەرچی (هارڤای) دەستەواژەی جهانگیریەتی بەکار نەدەهێنا، بەڵام ئاماژەدانی ئەو بە فشارهێنانی کات و شوێن لە دنیای پۆست مۆدێرن، هەمان مەبەستی گوتاری بەجیهانیبوون دەگەیەنێ. ئەو دەڵێ: "وا دێتە بەرچاو توندکردنی فشارهێنانی کات و شوێنی لە دنیای سەرمایەداری رۆژئاوا لەدەیەی شەست (سەدەی ٢٠) بەدواوە بووە، لەگەڵ تەواوی ئەو تایبەتمەندییانەی لە رووی ئەو لێکجیاکردنەوانەی کە لە قەڵەمڕەوی سیاسی و تایبەتیدا هێناوەتە ئاراوە، ئاماژەیە بە یەك جێگەی ئەزموونی کە تاڕادەیەك تایبەتە بە هەلومەرجی پاش نوێگەرایی".

ئەگەر سێ پرۆسە رەچاو بکەین رەنگە ناوەڕۆکی دیاردەکەمان بۆ روون بکاتەوە، پرۆسەی یەکەم پەیوەندی بە خێرایی بڵاوبوونەوەی زانیارییەکان هەیە. دووەمیش خۆی لە تواندنەوەی سنووری نێوان وڵاتاندا دەبینێتەوە. سێیەم پرۆسەش بریتییە لە زیادبوونی خاڵەکانی لێکچوون



لە نێوان گرووپ و دامەزراوە و کۆمەڵگەکان. ئەم پرۆسانەش دواجار لە هەندێ کۆمەڵگەدا دەرکەوتەی نێگەتیڤ و لە هەندێکی تریشدا دەرکەوتەی پۆزەتیڤی لێدەکەوێتەوە. هەندێ لە پسپۆران وای بۆ دەچن کە لە دیاردەی جیهانگیریدا چوار پرۆسە بەدی دەکرێ بەمشێوەیە: ململانێ لە نێوان زلهێزەکان، داهێنانی تەکنەلۆژی، فراوانکردنی ئاستی ئاڵوگۆڕی بەرهەم و نوێکردنەوە.

ئەگەر جیهانگیری دیاردەیەکی بابەتیانە بێ، ئەوا لە لایەکەوە دەرهاوێشتەی سیاسەت و دەسەڵاتی ئەو وڵاتانەیە کە ئەو رێککەوتننامە و یاسانەیان ئیمزا کردووە، سنوور دەسڕێتەوە و جووڵەی هێنان و بردنی کەلوپەل و خزمەتگوزاریی و سەرمایە بۆ بازاڕەکانی جیهان ئازاد دەکات. هەرچەندە ئێستاش زۆر لە شارەزایان پێیانوایە جهانگیریەتی لە قۆناغی دروستبوون و سەرهەڵداندایە، بەڵام لەراستیدا دیاردەیەکە چیتر لە پشت دەرگاوە نەوەستاوە و داوای مۆڵەت بکات بۆ ئەوەی بێتە ژوورەوە، بەڵکو لە واقیعدا چەندین ساڵە کاری خۆی کردووە و لەسەرتاپای جیهان دەستبەکار بووە. بۆیە ئێستا دیاردەکە بە تەنها چەمکێك یان زاراوەیەك نییە، بەڵکو بەشێك لە ژیانی رۆژانەی مرۆڤەو پرۆسەیەکی بەردەوامە و بە بەردەوامیش گەشە دەکات و پێشدەکەوێ.

(ریکاردۆ بتریلا) بەمشێوەیە پێناسەی جهانگیریەتی دەکات کە "بریتییە لە کۆمەڵە قۆناغێك کە بوار دەڕەخسێنن بۆ بەرهەمهێنان و دابەشکردن و بەکاربردنی شمەك و خزمەتگوزارییەکان لە پێناو بازاڕە جیهانییەکاندا، ئەوەش بەگوێرەی پێوەرە جیهانییەکان و لەلایەن ئەو رێکخراوانەی کە لەسەر بنەما جیهانییەکان کار دەکەن". دیاریکردنی واتای جهانگیریەتی بە تەواوی ئەنجام نادرێ ئەگەر ئاماژە نەکرێ بۆ دوو چەمکی ئابووری (بەنێودەوڵەتیکردن و فرە رەگەزنامەیی). ئەم بەراوردکردنەش ئەو سوودەی بۆمان هەیە، کە پێمان دەڵێ جهانگیریەتی نە بەنێودەوڵەتیکردنە و نە فرە پێناسەیی، بەڵکو واقیعێکی تازەیە کە توخمی تایبەتی خۆی و میکانیزمی سەربەخۆی خۆی هەیە.

## سەرهەڵدانی جیهانگیری:

بەبۆچوونی زۆر لە شارەزایان، ریشەی جهانگیریەتی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی داگیرکاری و فراوانکردنی دەسەڵاتی فیرعەونە کۆنەکان، لە گەشتەکانیانەوە تا دەگاتە هەوڵەکانیان بۆ داگیرکردنی شوێنە دوورەکان، ئەمەش هەوڵی تاکەکەس و تاکڕەوانە بووە، بەڵام بە هۆی

جیاوازیی ئاین و کوولتور و زمان و سیاسەت و بەرژەوەندییە ئابوورییەکان زۆربەی هەوڵەکان سەرکەوتنیان بەدەست نەدەهێنا، هەوڵەکانی ئێستاش لە ناوەڕۆکەوە جیاوازییەکی ئەوتۆیان نییە ئەوەندە نەبێ لە رووی هۆکار و شێوازەکانەوە تەواو جیاوازن.

سەرەتاکانی بەکارهێنانی زاراوەی جیهانگیری دەگەڕێتەوە بۆ دوو کتێب کە لە ساڵی ١٩٧٠دا بڵاو کرانەوە، یەکێکیان لەلایەن (مارشاڵ ماکلوهان) بە ناوی (جەنگ و ئاشتی لە گوندی جیهانی)دا، دووەمیان بە ناوی (ئەمەریکا و سەردەمی تەکنترۆنی) لەلایەن (لزیجبیو بریزنسکی) نووسرابوو، کە بەرپرسی پێشووی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمەریکا بوو لە سەردەمی سەرۆك رۆناڵد ریگان، ئیتر لە ساڵانی حەفتاکانەوە بەکارهێنانی زاراوەی جهانگیریەتی زۆر بڵاوبووەوە بەتایبەتی بە هۆی ئەو پێشکەوتنەی لە تەکنۆلۆژیای پەیوەندی و تۆڕە نێودەوڵەتییەکانی پەیوەندی هاتنە ئاراوە. هاوکات ناکرێ جهانگیریەتی لەو پێشکەوتنە فیکری و سیاسی و ئابووری و تەکنەلۆژی و کۆمەڵایەتیانە و دەرەنجامەکانیشی دابڕێنین کە لە سەدەی هەژدە لە رۆژئاوادا هاتە کایەوە. کەڵەکەبوونی ئەو دەرەنجامانەش لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا زۆر رەنگیدایەوە. تەنانەت لە دە ساڵی رابردووی سەدەی بیستەمدا مرۆڤایەتی پێی نایە جیهانێکی تازەوە، کە هێشتا رووخسار و پێناسەیەکی دیاری نییە.

هەندێ شارەزای دیکەی جهانگیریەتی کە باس لە سەرەتاکانی سەرهەڵدانی دیاردەکە دەکەن، باس لە ساڵانی نەوەدەکانی سەدەی رابردوو لە دوای داروخانی یەکێتی سۆڤیەت دەکەن، بەتایبەتیش کە ئەمەریکا داوای لە وڵاتان کرد بەشداری رێککەوتنامەی بازرگانی جیهانی بکەن، بە مەبەستی کارئاسانی بۆ کۆمپانیا نێودەوڵەتییەکان بۆ کۆنترۆڵکردنی بازاڕە نێودەوڵەتییەکان، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ جهانگیریەتی بەم بەرگە نوێیەی ئەمەریکییە. هەندێ توێژەری دیکە دەڵێن جهانگیریەتی پرۆسەیەکی کەڵەکەبوونە، واتە پێشتر جهانگیریەتی بچووکتر هەبووە کە رێگەی بۆ جهانگیریەتی سەردەمی ئەمرۆ خۆشکردووە، بەڵام ئەوەی کە نوێیە لە دیاردەکە ئەوەیە کە زۆر خێراترە لە جاران بە هۆی ئەو پێشکەوتنە مەزنانەی لە هۆکارەکانی میدیا و پەیوەندی و گواستنەوەدا لە ئارادایە.

هەندێ بۆچوونیتر سەبارەت بە سەرەتاکانی سەرهەڵدانی جهانگیریەتی لەگەڵ ئەوەدان، کە پێنج سەدە پێش ئێستا واتە لەگەڵ دۆزینەوە و داگیرکردنی ئەمەریکا ئەم دیاردەیە هاتۆتە ئاراوە، بەڵام ئەوکات تەنها خەسڵەتێکی هەرێمی هەبووە، واتا هەر بە تەنها مەیلێك هەبوو بەرەو ئەو دیاردەیەو نەگەیشتبووە ئاستی راستیی بەرجەستە وەکچۆن لە رۆژگاری ئێستادا



هەیە. لەو سەردەمانەدا ئیمپراتۆرییە کۆلۆنیالەکانیش هەنگاو و رەفتارەکانیان بەرەو جیهانگیری بوو، وەکچۆن زۆر لە تیۆر و ئایدۆلۆژییەکانیش مەیلی بەرەو جیهانگیریبوونیان هەبوو، هەرچەندە چەمك و شێوازی جیاوازیشیان هەبووبێ، بەڵام ئەم مەیل و هەوڵانە بە شێوازە جۆراوجۆرەکانیان نەگەیشتنە ئاستی جیهانگیری، چونکە ئامراز و هۆکاری ماددی یاریدەدەریان نەبوو بۆ گۆڕینی مەیلەکان بۆ کردەی راستەقینە کە بەرجەستە بکرێ. بەڵام هەندێ لە شارەزایانی بوارەکە ئەوە دووپات دەکەنەوە، کە جهانگیریەتی دیاردەیەکی تازەیە ئەگەرچی بەردەوام بووە و لە پێشکەوتنەکانی جیهانیش دانەبڕاوە، لە دیارترین نیشانە و ئامرازەکانی جهانگیریەتی لە سەدەی بیستەمدا داهێنانی هۆکارەکانی پەیوەندی و گواستنەوەی هاوچەرخ وەك تەلەفۆن و بێتەل و فرۆکە، هەروەها فراوانبوونی بازاڕەکانی سەرمایەداری بوون، بەڵام سەرهەڵدان و پەیدابوونی جهانگیریەتی بەمشێوە بەرفراوانەی ئێستا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شۆڕشە گەورەو خێرایەی لە بواری زانستدا هاتە ئاراوە، بەتایبەتی سەرهەڵدانی ئینتەرنێت و پێشکەوتنەکانی کەناڵەکانی میدیا و پەیوەندییەکان.

گرنگترین پێکهاتە کە پەیوەندی بە ژێرخانی جیهانگیری ئەم سەردەمەمانەوە هەبێ، پێشکەوتنی خێرای تەکنۆلۆژیای زانیارییە، کە بۆتە هۆی فراوانکردنی بازاڕەکان و سەرمایە، لە هەمانکاتدا دووری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ... هتد لەخۆگرتووە. زۆرینەی بۆچوونەکان لەسەر ئەوە هاوڕان کە ئیمپراتۆریەتی نوێی جیهانگیری لەسەر سێ پایە بونیاتنراوە، ئەوانیش: کۆمپانیا فرە رەگەزەکان، دامەزراوە نێودەوڵەتییەکان هەروەها مرۆڤی نێودەوڵەتی، سەرباری ئەو فەزایەی تۆڕەکانی پەیوەندی لەخۆدەگرێ کە پێکهاتووە لە ئابووری و سیاسەت و کوولتور. جهانگیریەتی لە روخسارە گشتییەکەیدا ئابوورییانە دەردەکەوێ، سەرەڕای ئەو پێشکەوتن و گۆڕانکارییە خێرایانەی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا روویاندا، کە کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر ئاراستە ئابوورییەکانی جیهان.

**زۆربەی نووسەرانی ئەم بوارە کۆکن لەسەر ئەوەی چوار رەگەزی سەرەکی هەیە، کە بەهۆیانەوە دیاردەی جهانگیریەتی سەریهەڵداوە کە بریتین لە:**

* ئازادبوونی بازرگانی نێودەوڵەتی: واتە تەواوکاری نێوان ئابوورییە پێشکەوتوو و تازە پێگەیشتووەکان لە یەك بازاڕی جیهانی کراوەدا و لەبەردەم سەرجەم هێزە ئابوورییەکانی جیهاندا، کە ملکەچی پرەنسیپی ململانێی ئازاد بێ. وڵاتە سەرکەوتووەکانی جەنگی دووەمی جیهانی، هاتنە کایەی سیستمێکی ئابووری جیهانیان بەپێویست زانی کە خزمەتی بەرژەوەندی

ولاّتە تازە پێگەیشتووەکان و بەرژەوەندی خۆشیان بکات، دەرەنجام سیستمی ئابووری نوێی نێودەوڵەتی دروستبوو کە بەپێی ئەوەش سندووقی دراوی نێودەوڵەتی و بانکی نێودەوڵەتی دامەزران، دواتر ڕێکخراوی بازرگانی نێودەوڵەتی هاتە کایەوە، کە ئامانجی نەهێشتنی سەرتاپای سنوورە بازرگانییەکان بوو لە جیهان، بەمەش ئابووریی جیهان چووە قۆناغێکی نوێوە.

* تەوژمی وەبەرهێنانی راستەوخۆی بیانی: لە چەند ساڵی رابردوودا پێشکەوتنی گەورە هاتە ئاراوە بەتایبەتی دەرکەوتنی ئامرازو بەرهەمی دارایی نوێ و پێشکەوتوو، سەرەڕای سیستمەکانی کۆمپیوتەری و هۆکارەکانی پەیوەندی کە خێرا بڵاوبوونەوەی ئەو بەرهەمە داراییانەی گرتە ئەستۆ، بەمجۆرە چالاکی بانکە کلاسیکییەکان بۆ چالاکی سەرتاسەری گۆڕا.

* پێشکەوتنی زانستی و تەکنەلۆژی: ئەم پێشکەوتنە خەسڵەتێکی دیاری ئەم سەردەمەیە کە وایکردووە جیهان زیاتر تێکەڵ بێ، هەروەها جووڵەی دارایی کەلوپەل و تاڕادەیەکیش جوولە و هاتووچۆی مرۆڤیشی ئاسان کردووە.

* کۆمپانیا فرە رەگەزەکان: ئەگەر بە رۆژگاری ئەمرۆ بگوترێ جیهانگیری، دەبێ بڵێین سەردەمی کۆمپانیا فرە رەگەزەکانیشە، بە هۆی ئەو رۆڵە گەورەی ئێستا لە جیهاندا هەیانە بەجۆرێك ئەم کۆمپانیایانە لە زۆر ولاّتدا کۆنترۆڵی زۆر چالاکی ئابووریی دەکەن.

## هەژموون لە سایەی جیهانگیریدا:

جیهانگیریی رۆژئاوایی لە دایکبووی دوو دەیەی کۆتایی سەدەی بیستەم نییە، وەك هەندێ وایدەبینن، بەڵکو توێژەران دەیگەڕێننەوە بۆ سەرەتای سەدەی رابردوو. کاتێك ئینگلیز و فەرەنسییەکان کۆنترۆڵی میکانیزمەکانی کۆکردنەوەی هەواڵ و دابەشکردنیان کرد. لەو کاتەی ئەمەریکا لە بیستەکانی سەدەی رابردوو هاتە نێو کاروانەوە، رەخنە و گلەیی لە هەژموونی ئەورووپی لەسەر کەناڵەکانی هەواڵ و دابەشکردنیان گرت، دوای جەنگی دووەمی جیهانی ئەمەریکا وردە وردە دەستی بە کۆنترۆڵکردنی کەناڵ و میکانیزمەکانی هەواڵ و زانیارییەکان کردو لەوکاتەوە بووە قۆرخکەری ژمارەیەك لەمبارەیەوە.

ئەوانەی دژی جیهانگیرین پێیانوایە ئەم پرۆسەیە زاڵبوونی کوولتوری رۆژئاوایی بەتایبەت ئەمەریکایە، بەوەی ولاّتانی رۆژئاوایی دەیانەوێ بەها پیرۆزەکانی نەتەوەکانی دیکە بسڕنەوە و کوولتوری خۆیان بەسەریاندا بسەپێنن، یان جهانگیریەتی بە ئاراستەی سڕینەوەی کوولتورە



نەتەوەییەکاندا دەڕوات. بۆچوونی تریش هەیە، کە پێیوایە جهانگیریەتی مانای زاڵبوونی کوولتورێك بەسەر کوولتورێکی تردا نییە، بەلاّم بنچینەی شێوازی نوێی زاڵبوونی کوولتورە و کوولتورەکانیتر هیچ داڕۆژێکیان نییە و پێیانوایە ئەم پرۆسەیە بە هۆی ئەو تەکنۆلۆژیا و ئامرازە میدیا بەهێزەی لەبەردەستیدایە، توانای خۆسەپاندنی زۆرترە و وردە وردە کوولتورەکانی دیکە بەرەو پەراوێز دەبات و جیهان بەرەو تاك کوولتوری رۆژئاوایی دەبات.

بۆ ئەوەی جیهانگیرتێیەکەمان جیهانگیرێتیەکی شوێنکەوتوویی و داماڵراو نەبێ، پێویستە سوود لە لایەنە ئەرێنییەکانی کوولتوری رۆژئاوا وەربگرین، زۆر ولاّت هەر زوو لەم راستییە ئاگاداربوونەوە، بۆ نموونە وەزیرێکی دەرەوەی کەنەدا دەڵێ: "ئەگەر قۆرخکردن لە بەکارهێنانی پیشەسازیدا کارێکی خراپ بێ، ئەوا لە پیشەسازی کوولتوریدا زۆر خراپترە، چونکە مەسەلەکە چەسپاندنی نرخ نییە، بەڵکو چەسپاندنی بیروبۆچوونە". هەروەها بیرمەندی فەرەنسی (رۆژە گارۆدی) دەڵێ: "ئەورووپا لەبەردەم داگیرکاری سینەمایی و تەلەفزیۆنی ئەمەریکیدا هەرەسی هێنا، ئەمڕۆش کوولتورەکان بەبێ پاسپۆرت دەگوازێتەوە و مرۆڤ بێ هیچ کۆت و بەندێك دەتوانێ وەدەستی بێنێ".

بەلاّم ئەوانەی پێچەوانەی ئەم بۆچوونە بیر دەکەنەوە پێیانوایە کە لە جیهانگیریدا هەموو کوولتورەکان لە ئاستی جیهاندا دەتوانن خۆ نیشانبدەن و کاریگەری لەسەر کوولتورەکانی دیکە دابنێن. (د. پیرۆز مجتهد زادە) دەڵێ: "گوندی جیهانی بەو مانایەی کە هەموو فەرهەنگەکان دەبنە یەك، هەرگیز روونادات، چونکە جیهانگیری هاندەری پاراستنی ناسنامەی نەتەوەییە، واتە ئەم گەورەبوونەی فەرهەنگ لە هەمانکاتدا گەڕانەوەیە بۆ وردە فەرهەنگەکان". هەندێ لەو بڕوایەدان جیهانگیری فشاری راستەوخۆ دروست ناکات بۆ کوولتورەکانی دیکە و نایانخاتە بەر مەترسییەکی ئەوتۆو، دەکرێ سوود لە لایەنە باشەکانی وەربگیرێ.

ئەگەر زانیمان جهانگیریەتی گەورەترین ئامانجی ئابوورییە و کار بۆ قازانج دەکات، هەموو سیستەمە سیاسی و ئابووری و کۆمەلاّیەتییەکانی دی، بەتایبەت کە ئەوانەی دەبنە رێگر لەبەردەم ئەم ئامانجەدا، رەت دەکرێنەوە و دەگۆڕێن، جیهانگیری دێ هەموو سیستەمە ئابوورییەکانیتر دەگۆڕێ بۆ سیستمی سەرمایەداری، یان هەموو جۆرە سیستمێکی دی جگە لە سەرمایەداری دەیانگۆڕێ و لەناویان دەبات، ئەم گۆڕانەش درێژ دەبێتەوە بۆ سیستمەکانی تری کۆمەڵگەو تا دەگاتە بیروباوەڕەکانیش، چونکە کارلێکی بەردەوام لە نێوان واقیعی کۆمەڵایەتیدا هەیە. جیهانگیری سەرجەمی کەلەپوور و رۆشنبیر و ئایین و فەلسەفە و سیاسی و

یاساکان و - ئەوەی تا ئەمڕۆ مرۆڤایەتی ناسیونی - سەرەو ژێر دەکات) و جۆرێکیتر لە جێگایان دادەنێ.

گەیشتن بە سایەی یەك حکوومەتی جیهانی پەیامی قۆناغی سەرمایەداری و جیهانگیرییە. (بنیامین باربیر) پێیوایە نارەزایی و دژبوونی جیهانگیری تەنها لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا روونادات، بەڵکو ئەو نارەزاییە لە نێوان هەموو کۆمەڵە مرۆییەکاندا هاوبەشە، لەوانە لە کۆمەڵگە رۆژئاواییەکانیشدا هەیە. هەرچەندە رۆژئاوا بەگشتی دەیەوێ کوولتورەکانی دەرەوە بسرێتەوە و دەستی بەسەردا بگرێ پاشان لەیەك شێوەی نموونەییدا بیخاتەڕوو، ئەوان پێیانوایە نوێگەری و پێشکەوتن لە دەرەوەی رۆژئاوا روونادات و ئەوەی دەیەوێ پێشبکەوێ پێویستە هەموو بەهاو کوولتورەکانی رۆژئاوا بە تەواوی وەربگرێ، بەڵام لەبەر ئەوەی ئێستا ویلایەتە یەکگرتووەکان لەسەرووی هەرەمی دەسەڵاتدایە، ترس لە نێو کۆمەڵگە و دەوڵەتە ئەوروپییەکانیشدا دروستبووە و پارێز لەو نموونە کۆمەڵایەتی و بەهایانە دەکەن کە تایبەتە بە هەژموونی بەهای نموونەی ئەمەریکی.

ئەگەرچی لەسەر روونکردنەوە و وەسفکردنی جهانگیریەتی جیاوازی لە نێوان لێکۆڵەر و بیرمەندەکان هەیە، بەڵام هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەمەریکا سەرکردایەتی ئەم پرۆسەیە دەکات. واتە پرۆسەیەکی دارێژراوە و بەرێژەی زۆریش ئەمەریکییە، بۆیە زۆر لە نووسەران لە جیاتی زاراوەی جیهانگیری (بەئەمریکیبوون) بەکاردێنن. دوای ئەوەی یەکێتی سۆڤیەت وەك هێزێکی گەورەی جیۆپۆلیتیکی هەرەسی هێنا، ئەمەریکا بووە تاکە زلهێزی دنیاو هەژموونی خۆی بەسەر گشت هێزە جیهانییەکاندا سەپاند. لە دوو دەیەی دواییدا کە سەرمایەداری زلهێزی ئەمەریکا رزگاری بوو لەو دڵەڕاوکێیەی کە بە هۆی دوو باڵی جیهان تووشی ببوو، چیتر مەترسی بەرابەر کە رەقیبایەتی لەگەڵ بکات، نەما. هەر لە رووخانی دیوارەکەی بەرلینەوە، کە سەرەتای ئەو قۆناغە تازەیە بوو، سنوورێکی نەهێشتەوە بۆ بەرەنگاری داخراوەیی، تاکو بەرگری لە ئاست شاڵاوی گۆڕانکارییە سەردەمییەکانی شۆڕشی جهانگیریەتی بکات.

(ئارگۆن) پێیوایە "ئێستا میللەت و نەتەوە تازەکانی جیهانی سێیەم لە جاران زیاتر هەست بە فشاری هەژموونی ئەمەریکا دەکەن، ئەمەش بەربەست دەخاتە بەردەم کۆششی رزگاری و یەکێتی ناوخۆیی". (فاروق رەفیق) دەڵێ: " گلۆبالیزەیشن و جەنگەکانی ئەمەریکا لە جیهاندا دوو رووی یەك سکەن، بۆ ئەوەی مەکدۆناڵد و کۆمپانیا گەورەکان ئیشەکانیان بڕوات، هێزێکی عەسکەری گەورە دەبێ سەرتاپای دنیا بکاتە ژێر رکێفی خۆیەوە".



بۆچوونی دیکە هەیە جیهانگیری وا لێکدەداتەوە کە فراوانکردنی نموونەی ئەمەریکایی و رەخساندنی بوارە تا هەموو جیهان بگرێتەوە. (تۆماس فریدمان) ئەوە دووپات دەکاتەوەو دەڵێ:: "ئێمە لە بەردەم جەنگێکی سیاسی و شارستانی ترسناکداین، جیهانگیری بە ئەمەریکاییکردنە و ویلایەتە یەکگرتووەکانیش هێزێکی شێتانەیە، ئێمە هێزێکی شۆڕشگێڕانەی ترسناکین، ئەوانەی کە لێی دەترسن ناهەقیان نییە، لە رابردوودا گەورە بچووکی دەخوارد، بەڵام ئێستا ئەوەی خێرایە، خاو و خلێچکەکان دەخوات". بەهەمان شێوە بۆچوونیتر هەیە پێیوایە جهانگیریەتی جووڵانەوەیەکی خێرایە بەرەو جیهانێکی کامڵ کە نەهێشتنی کۆت و بەندە دروستکراوەکان و کارلێککردن لەگەڵ گۆڕانکارییە خێراکان لە تەکنۆلۆژیای پەیوەندییەکاندا بەهێز و پتەوی کردووە. (فۆکۆیاما)ی بیرمەندی ئەمەریکیش لە کتێبی (کۆتایی مێژوو)دا کە رووخانی یەکێتی سۆڤێت بە سەرکەوتنێکی گەورەی سەرمایەداری دەزانێ، پێناسەی جیهانگیری بە "باڵادەستیی بەها ئەمەریکییەکان" لەقەڵەم دەدات.

## ئامانجەکانی جیهانگیری:

رەنگە هەندێ بۆچوون جەخت لەسەر ئەوە بکەنەوە ئامانجەکانی جیهانگیری بە پلەی سەرەکی خۆی لە پەکخستنی جووڵەی وڵات و نەتەوە و هەڵوەشاندنەوەی سیستمە بەرهەمهێنەرەکانی و بازدان بەسەر کارو ئەرکی دەوڵەت و نەتەوە و نیشتیمان و هاووڵاتی ببینێتەوە، رێگەش ئاسان بکات بۆ کۆمپانیا فرە رەگەزەکان و دامەزراوە ئابوورییە نێودەوڵەتییەکان بۆ بەرێوەبردنی کاروباری ئابووری جیهان، تا لەوەشدا شوێنی دەوڵەت بگرێتەوە و هەوڵ بۆ جێبەجێکردنی دەسەڵاتی بڕیاری ئابووری جیهان بدات لە رێگەی بەرێوەبردنێکی سەنتراڵی و کاریگەر لە دەرەوە بۆ سەپاندنی چەمکی (نێونەتەوەیی ئابووری)، واتە دروستکردنی فەزایەکی ئابووری جیهانی کە بریتییە لە کیان و نیشتیمانێکی نوێ کە ئینتیمای نە بۆ جوگرافیا و نە بۆ مێژووش نییە، بەڵام دواجار ئامانجی جیهانگیری بە شێوەیەکی گشتی لێکنزیککردنەوەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و ئاسانکردنی ئاڵوگۆڕی بازرگانی و دراو و پەیوەندی و هاتووچۆ و تێکەڵبوون و گواستنەوەی زانیاری و چەند لایەنێکی دیکەیە، وەك:

١- گەیشتن بە بازاڕێکی کراوەی جیهانی، بەبێ بەربەست یان ناوبڕی گومرکی یان کارگێڕی، یاخود کۆتوبەندی ماددی یان دابڕانی رەچەڵەکی یاخود رەگەزیی یان مەعنەوی و سۆزداری،

بەڵكو دانانی بازاڕێكی فراوانە سەرجەم كەرت و دەزگا و تاكەكان بگرێتەوە بۆ ئەوەی ببێتە تەنێكی تەواو و كارلێك، بەم پێیە لێكخشاندنی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لە نێوان سەرجەم رەگەزە مرۆییەكان روودەدات بە بۆماوە شارستانییەكەیان و كوولتوورە جۆراوجۆرەكانیان و جیاوازییە فیكرییەكانیان و توانەوەی ئەم جیاوازیانە لە بۆتەی یەكبووندا.

٢- كردنی جیهان بە یەكەیەكی پێكەوە بەستراو چ لە رووی بەرژەوەندی هاوبەش و كۆمەڵیی بێ، یان لە رووی هەستكردن بە یەك مەترسی كە هەڕەشە لە هەموو مرۆڤایەتی دەكات، یاخود لە رووی گرنگی جێبەجێكردنی ئاسایشی كۆمەڵیی بە رەهەندە تەواوەكانی و توخمە بەشەكییە كاراكانی تیایدا و گرنگی بەرەنگاربوونەوەی بۆ مەترسییەك كە هەڕەشە لە سەقامگیری و ئاسایشی جیهانی گشتی دەكات و مامەڵەكردن لەگەڵیدا بە كۆشش و كاری هاوبەش و هەماهەنگی تەواو لەلایەنی هەمووانەوە، ئەمەش لە نێوبردنی سەرچاوەكانی ململانێ و پشێوی و فاكتەرەكانی دڵەڕاوكێ خۆی دەبینێتەوە، كە لە رێگەی زیادكردنی رووبەری فیكری هاوبەش و كۆتایی هێنان بە حاڵەتەكانی ململانێ و زیادكردنی پشتبەستنی هاوبەش لە نێوان گەلان و گەشەپێدانی پێویستی هەریەكەیان بەویتریان و دروێنەی دەسكەوتە هاوبەشەكان دەبێ.

٣- گەیشتن بە شێوەیەك لە شێوەكانی خۆگونجانی جیهانی چ لەمیانەی كەمكردنەوەی جیاوازییەكان بێ لە ئاستەكانی بژێوی یاخود لە سنووری خوارەوەی پێداویستییەكانی ژیان لە مافەكانی مرۆڤ... تد، بەتایبەتی ئەم خۆگونجانە بەهاوتایی نابێ، بەڵكو لەسەر بنەمای فرەیی و جۆرایەتی و پێكهێنانی پاڵنەرو هاندەر بە بەرزبوونەوە و خۆشەویستی و هۆگری وەستاوە، لە پاشان ئینتیما دەگۆڕێ بۆ هاوبەندییەكی مرۆیی گشتگیر كە هەموو مرۆڤایەتی دەگرێتەوە و بەهای ژیان لەگەڵیدا بۆ بەهاكانی ئازادی و دادپەروەری و یەكسانی دەگۆڕێ.

٤- پەرەپێدانی ئاراستەكە بەرەو دۆزینەوەی یەك زمانی زاراوەیی كە وردە وردە دەگۆڕێ بۆ تاكە زمان لە جیهاندا، كە بەكارهێنان و ئاڵوگۆڕكردنی بە گفتوگۆ لە نێوان كۆمپیوتەرەكان، یاخود سەنتەرەكانی ئاڵوگۆڕی داتاو پیشەسازی زانیارییەكان دەبێ، بەمەش زۆری لێكخشاندن و مامەڵە و ئاڵوویركردنی پاڵنەرەكان بۆ پەیدابوونی زمانێكی داتاشراوی كە پرۆسەی لێكنزیككردنەوەی زمانەوانی زیاد دەكات، تا ئەو كاتەی جیهان بە یەك زمان قسە دەكەن.



٥- گەیشتن بە یەكەیەكی سەرجەمی مرۆیی، بەو مانایەی وردە وردە جیاوازییەكان بتوێنەوە بەتایبەتی جیاوازییە رەگەزی و نەتەوەییەكان، لەمیانەی چڕكردنەوەی پرۆسەكانی جیاوازی و تێكەڵكردنی توخمەكانی مرۆیی تا ئەوكاتەی نزیكبوونەوە و گونجان و یەكگرتن دروستدەبێ.

٦- قووڵكردنەوەی هەستی گشتی و ناوەڕۆكی گەوهەری مرۆڤایەتی و لادانی هەموو شێوەكانی دەمارگیری و جیاوازی رەگەزپەرستی و جۆریی بۆ گەیشتن بە جیهانێكی مرۆیی دوور لە دەمارگیری و جیاوازی لەرادەبەدەر، پاشان جهانگیریەتی دەبێتە یەكەم واقیعی مرۆیی لە مێژوودا، لە هەمانكاتدا دوا واقیعیشی نابێ لەم مێژووە.

٧- دەركەوتنی تێڕوانینێكی نوێ لە چەشنی بزاڤێكی رووناككەرەوەی گەورە و بەرچاوڕوونی و وردبوونەوەیەكی كارا وەك شەپۆلێكی كارەبایی، كە لەگەڵ خواستەكانی مرۆڤ بە سەرجەم رەگەز و گەل و وڵاتانییەوە یاریدەكات و لەگەڵ خەونەكانیان دەدوێ و خەون و هیوا خەوتووەكانیان وەئاگا دێنێتەوە، هەروەها هێز و توانابەخشە لە پێناو فراوانكردنی تاقیكردنەوەكان بەرەو ئاسۆی خواستەكان.

## پرسەكانی جیهانگیری:

جیهانگیری، كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی جیهانی لە هەمان پانتایی و رووبەری جاران بچووك كردۆتەوە، ئەو سەردەمە نەما هاوڵاتییەك بە تەنیا بژی و لە شوێنە دوورەكان ئاگای لە رووداو و كێشە و پێشهاتەكانی تاكو كۆمەڵی وڵاتێكیتر نەبێ، ئێستا جگە لەوەی لە ماوەیەكی كەمدا زۆرترین زانیاری دەگوازرێتەوە بۆ دوورترین شوێن، زۆربەی زانیارییەكان لە سەرچاوەی سەرەكییەوە وەرگیراون و تاڕادەیەكی زۆر راستترن.

میدیا و پەیوەندییەكان رۆڵێكی باڵاو گەورەیان هەیە لە دروستبوون و گەشەكردن و پێشكەوتنی دیاردەی جیهانگیری، چونكە ئێستا هۆكارەكانی پەیوەندی و میدیا گرنگترین شێوازی بەستنەوەی تاكەكانی كۆمەڵگەی مرۆڤایەتییە، پێشكەوتنی هۆكارەكانی پەیوەندی جگە لەوەی خزمەتێكی گەورەی بە مرۆڤایەتی بەخشیوە لە ئاسانكردنی گەیاندن و ئاگاداربوون لە یەكتر، لە هەمانكاتدا كۆمەڵگە جیاجیاكانی مرۆڤایەتی بەتوندی پێكەوە بەستۆتەوەو ئەوەی بەروونی دەرخستووە، كە هەرچەندە لە رەنگ و روخسارو زمان و شێوەشدا جیاوازبن، بەڵام دواجار هەموویان مرۆڤی هاورەگەزن. بەهەمان شێوە كەناڵەكانی میدیا كە لەهەمانكاتدا

هۆکاری گەیاندنن، ڕۆڵی زۆر گەورەیان هەیە لە پەرەسەندنی ئەم دیاردەیە و بەستنەوەی کۆمەڵگەکانی جیهان بە یەکتر.

جیهانگیری واتای ئەوەیە شتە لۆکاڵەکان لە ئەنجامی پرۆسەیەکدا بەرەو ئاستێکی جیهانی دەچن. دوو ڕوانگەی جیاواز هەیە بۆ جیهانگیریەتی. هەندێ کەس بە پرۆسەی دەبینن و هەندێکیتر بە پرۆژەی دەزانن. ئەوانەی بە پرۆسەی لە قەڵەم دەدەن، پێیانوایە هەستی هاوپەیوەندی نێوان مرۆڤەکان و ئالۆگۆڕی کوولتور و سەرمایە و زانیاری تەکنۆلۆژیا و زیاتر هتد.. بە هۆکارەکانی جیهانگیری دەزانن، کە پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا و ئامرازەکانی پەیوەندی و گەیاندن وەك ئینتەرنێت، تەلەفزیۆن، کەشتییە ئاسمانییەکان و ... هتد ڕۆڵی تێدا دەگێڕن. بەڵام ئەوانەی پێیانوایە ئەمە پرۆژەیەکی داڕێژراوە دەیەوێ بە ئامراز و شێوازی تازەوە دەست بەسەر جیهاندا بگرێ، لایەنگرانی ئەم بۆچوونە پێیانوایە ئەمە هەمان کۆلۆنیالیزمی پێشووە تەنیا ئامراز و کەرەستەکانی گۆڕاون، لە جیاتی دەستتێوەردانی ڕاستەوخۆ بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەست بەسەر بازاڕی وڵاتانی هەژاردا دەگرن.

هەستی لێکنزیکبوونەوە و لێککگەیشتن وایکردووە مرۆڤ ڕێگەیەك بۆ پەیوەندی لەگەڵ دەرەوەی جیهانی خۆی پەیدا بکات، لەم چاخەدا پرۆسەی جهانگیریەتی دەرفەتی لێکحاڵیبوون و پێکەوەژیانی ڕەخساندووە، ئامرازەکانی جهانگیریەتی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیایە، کە لەم چەمکە بەنێوبانگەدا هەمیشە دێتە ئارا ئامرازەکانی تێکنۆلۆژیا گوندی جیهانییان دروستکردووە، ئەوە بەو مانایە نییە جیهان بچووك بۆتەوەو بۆتە ئەندازەی گوندێك، بەڵام بەو مانایەیە کە ئالۆگۆڕی زانیاری هێندە خێرایە و خەڵك بەزووترین کات لەو هەر جێگایەکی ئەم جیهانە بێ بە سات و چرکە لێی ئاگادار دەبێ، ئەمیش لە ئامرازەکانی میدیای گشتی و پەیوەندی و گواستنەوەدا خۆی دەبینێتەوە، یەکێك لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی جیهانگیری کەمبوونەوەی کاتە، لە کەمترین ماوە و لە بچووکترین کاتدا گەورەترین کاری مەبەست جێبەجێ دەکات، لەکەمترین ماوەدا هەواڵێك کە تەنانەت لە دوور دەسترین شوێنەکان ڕوویدابێ بە هەموو جیهاندا بڵاو دەبێتەوە.



**دەکرێ گەورەترین پرسەکانی جیهانگیری لەم سێ خاڵەدا کورت بکەینەوە:**

١- کات: مرۆڤ هەمیشە لە هەوڵی کەمکردنەوەی کاتدایە، هەر لە سەرەتاوە لەم پێناوەدا هەوڵیداوە بەڵام، لە سەردەمی جیهانگیریدا، بە هۆی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا وایلێهاتووە گواستنەوە و پەیوەندی و ئالۆگۆڕی زانیاری لە کەمترین کاتدا بگات.

٢- شوێن: مەبەست لەوەیە پێویست ناکات بۆ بەجێگەیاندنی کارێك مرۆڤ شاخ و دۆڵ و چیا ببڕێ و بەردەوام لە شوێنگۆڕکێدا بێ، بەڵکو ئێستا هەر لەجێی سنووورداری خۆیەوە لە هەموو پرسێکی نوێ لە جیهاندا ئاگادار بێ و پرسەکانی پەیوەندیدار بەخۆی لەکورتترین ماوەدا بە هەموو جیهان بگەیەنێ.

٣- کەش (فەزا): مرۆڤ دەتوانێ لە ڕۆچنەیەکی زۆر بچووکەوە بڕوانێتە جیهان، لە هەمانکاتدا لە هەموو ئالۆگۆڕ و پرسە جیهانییەکان هەر لەو کەشە بچووکەیدا بەزووترین کات لە شوێنی خۆیدا ئاگاداری بێ.

بە هۆی ئەمانەوە کوولتورە لۆکاڵەکان لە ئاستی جیهانیدا خۆیان نمایش دەکەن، بۆ نموونە کوولتوری ڕۆژئاوایی لەم ڕێگەیەوە توانیویەتی ببێتە کوولتورێك هەموو جیهان بگرێتەوە، ئامرازەکانی پەیوەندی و گەیاندن تەنیا قۆرخی وڵاتی سەنتەر یان لە ناوەندا نییە، بەڵکو ئەو لایەن و گرووپانەش کە بە تەواوی دژایەتی ئەم پرۆسەیە دەکەن گەورەترین کەڵکی لێ وەردەگرن.

جیهانگیری کتوپڕ پەیدا نەبوو، بەڵکو درێژبوونەوەی قۆناغی ڕێنیسانسە، وەك (گیدنز) دەڵێ: "بەجیهانیبوون گەورەبوونەوەی مۆدێرنیتەیە". یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی مۆدێرنیتەش ڕزگاربوونە لە کۆتوبەندی خورافات و دەستبەرداربوونە لە میتافیزیك و گەڕانەوەیە بۆ لۆژیك و مرۆڤپەروەری و پابەندبوون بە بەها مرۆییەکان کە لە سروشتی مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرێ. ئەمە لە کاتێکدا مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی هێشتا نەیتوانیوە دەست لە میتافیزیکی هەڵبگرێت و لۆژیك تەوەری بیرکردنەوەی بێ، بۆیە لەگەڵ ئەم پرۆسەیە تووشی زۆر ناکۆکی هاتووە. بەپێی بۆچوونی (گیدنز) هێشتا مۆدێرنیتە نەیتوانیوە هەموو جیهان بگرێتەوەو وردە وردە بەرەو وڵاتانی پەراوێز دەکشێ، وردە وردە هەموو کەلێن و قوژبنەکانی جیهان دەگرێتەوە. مەبەستی (گیدنز)یشە، جهانگیریەتی گۆڕان لە هزردا دروستدەکات، واتە جهانگیریەتی سەردەمێکە بۆ سەر لەنوێ دروستکردنەوەی مەعریفە هزرییەکان، ئەو شتەی کە مۆدێرنیتە دەیکات.

## کاریگەرییەکانی جیهانگیری:

جیهانگیری دوا شۆڕشە کە لە کۆمەڵگەی پیشەسازی ڕۆژئاوا سەریهەڵداو بەخێرایی تەشەنەی کرد، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا هەموو ناوچەیەکی جیهان بە پلەی جیاواز لەگەڵ سەردەمی جیهانگیریدا ڕێدەکات، هیچ وڵاتێك یا هەرێمێکیش ناتوانێ خۆی لەو هەموو پێشکەوتنەی جیهاندا دابڕێنێ کە لە ئارادایە و خۆی لە جیهانگیری دەبینێتەوە، زۆرینەی مرۆڤایەتیی حەز دەکەن بەخێرایی لەگەڵ گۆڕانکارییەکاندا بگونجێنن کە پێشکەوتن و پەرەسەندنی جیهانگیری لەگەڵ خۆیدا دەیانهێنێتە کایەوە، هێشتا خەڵکانێکیش هەن خۆیان یەکلایی نەکردۆتەوە بەرابەر ئەو دیاردەیە، یان قبوڵیان نییە و دوودڵن لە پەسەندکردنی یاخود بەهێواشی خۆیان لەگەڵدا دەگونجێنن.

**دیاردەی جیهانگیری بەو پێیەی واقیعێکی حەتمییە لەسەرمانە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین و کاریگەرییەکانی بزانین:**

**١- کاریگەرییە خراپەکانی جیهانگیری:**

(ڕۆجیە گارودی) دەڵێ "جیهانگیری سیستەمێکە تێیدا بەهێزەکان دەتوانن دیکتاتۆریەتی نامرۆڤانەی خۆیان بسەپێنن، بە بیانووی ئاڵوگۆڕی ئازاد و بازاڕی ئازاد". هەروەها (د. حەسەن حەنەفی) پێیوایە "بەجیهانیبوون، بەرژەوەندی ئەویترە لەسەر حیسابی من، بەهێزی ئەویترە لەبەرابەر بێ هێزی من و یەکبوون و یەکگرتنی ئەویترە لەبەرابەر لێکهەڵوەشاندنەوەی من". بەڵام (جانیورڤین) بێ ترس دەڵێ "زۆرترین و بڵاوترین تەفسیری جیهانگیری، کۆمەڵێك بیروباوەڕ و ڕێبازێکە بۆ ئاراستەکردنی جیهان بەرەو یەکبوونی بەهاکان، لە ڕێگەی دابینکردنی تەکنۆلۆژیا و بازرگانی ڕۆشنبیری کە لە ڕۆژئاواوە هەڵقوڵاون".

بەپێی ئەو تێڕوانینانە، جهانگیریەتی ئەو کۆمەڵگە خۆشگوزەران و دیموکراتییەش نایەنێتە دی کە (فۆکۆیاما) بانگەشەی بۆ دەکات، بەڵکو پرۆسەیەکی گەورەی چەوساندنەوەیە، چونکە گەورەترین مەبەستی ئابووری و بازرگانی و سوودە، سوود و بازرگانیش ناسنامەی نییە بۆ بەزاندنی بەربەست و سنوورەکان و پێش هەموو شتێك دەکەون، ئەمەش گەوهەری سەرمایەداری فەلسەفەی پراگماتییە. بۆیە (عبدالعزیز تویجری) دەڵێ "جیهانگیری بەم چەمکە دژە، دژبوونێکی تەواوە لەگەڵ بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتی و سروشتی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا، چونکە پشت دەبەستێ بە شێوازێکی نوێ لە ڕووبەڕووبوونەوەی شارستانییەکاندا، کە دژی ناسنامەی گەلان و ڕۆشنبیر و کوولتوریانە، بەمەبەستی سەپاندنی



باڵادەستی یەك کوولتور و ملکەچپێکردنی جیهان بۆ دەسەڵاتی شارستانییەتیەك". جیهانگیری لە لایەنە خراپەکەیەوە چەند ئاکامێك لەخۆدەگرێ کە لە پەراوێزخستنی ڕۆڵی دەوڵەت و دواتر نەمانی خزمەتگوزارییە ئاسایشی و تەندروستی و کوولتورییەکانی و نەمانی ڕێنمایی و بنەما کۆنترۆڵکراوەکانی ڕەفتار بەرجەستە دەبێ، پاشان هێزە چاوچنۆکەکان پەیدا دەبن و تاوانی ڕێکخراو دەردەکەون.

**گرنگترین لایەنە خراپەکانی جیهانگیری خۆی لەمانەدا دەبینێتەوە:**

- نەمانی ناسنامە و کەسایەتی نیشتیمانی لۆکاڵی و سەرلەنوێ تواندنەوەی و پێکهێنانەوەی لە چوارچێوەی ناسنامە و کەسایەتییەکی جیهانی، واتە گواستنەوە لە تایبەتمەندی تایبەتییەوە بۆ گشتێتی (العمومیە) گشتی، بەجۆرێك تاك مەرجەعییەتی خۆی لەدەستدەدات و دەستبەرداری ئینتمایەکەی دەبێ. پێشتر هەمان شت بەسەر مرۆڤایەتیدا هاتووە لە قۆناغە جیاوازەکانی گەشەکردنیدا، ئەویش لە خێزانەوە بۆ خێڵ و لەوێشەوە بۆ هۆزو گەل، دواتر بۆ هەرێم و شانشین و ئیمپراتۆریەت ئینجا بۆ وڵات و ئێستا بۆ کۆمەڵگەیەکی جیهانی کراوە.

- لەناوچوونی کوولتور و شارستانی لۆکاڵی نیشتیمانی و دۆزینەوەی حاڵەتێکی نامۆ لە نێوان مرۆڤ و تاك و مێژووە نیشتیمانییەکەی و بۆماوە کوولتوری و شارستانییەکەی کە شارستانی باوباپیران بەرهەمی هێناوە، واتە جیاکردنەوەی قەد لە ڕەگ و ریشە درێژبووەکەی و جیاکردنەوەی رووکار لە قووڵایی و دۆزینەوەی شێوەیەکی نوێ لە شێوەکانی کوولتوری جیهانی کە هەموو مرۆڤەکان دروستیان کردووە کە تایبەت نییە بە خودی کەسەکان یان ناوچە جوگرافییەکان.

- ئەوەی ئێستا ئامرازە میدیاییە جیاوازەکان دروستیدەکەن و هەڵی دەسەنگێنن، بە بەکارهێنانی پەخشی ڕاستەوخۆ بۆ هەموو جیهان لەرێگەی مانگە دەستکردەکانەوە، کە دووبارە یادەوەری و ئاگایی تایبەت بەهەموو مرۆڤایەتی پێکدەهێنێتەوە.

- ڕەچاو نەکردنی بەرژەوەندییە نیشتیمانییە تایبەتییەکان، ئەو کاتەی لەگەڵ بەرژەوەندی جهانگیریەتی یان باهۆزە هەڵقوولاوەکان لە هەموو بوارەکاندا دژ دەوەستێ.

- زاڵبوون بەسەر بازاڕە لۆکاڵییەکان لەمیانەی هێزە باڵادەستەکان کە هێرش و کاریگەری هەژموونی بەهێزی خۆی بەسەر کیانە لۆکاڵییە لاوازەکان پیادە دەکات و لە نێوی دەبات و دەیگۆڕێ بۆ دامەزراوگەلی تایبەت بە خۆی.

### ٢- کاریگەرییە باشەکانی جیهانگیری:

ئەو رۆشنبیرانەی کە گەشبینن بەرابەر بەم پرۆسەیە، تێڕوانینێکی پۆزێتیڤی لە بارەی دەخنەنڕوو، پەیوەستی دەکەنەوە بە بەها باڵاکانی وەکو: دیموکراسی، مافی مرۆڤ، ئازادی و...تاد. بێگومان زۆربەی ئەو رۆشنبیرانە، لەپشتی ئەم پرۆژەیەن و خۆبەخشانە کاری بۆ دەکەن، ئەوانەن کە لە رێگەی دەزگاکانی میدیاوە بە شان و باڵی جیهانگیریدا هەڵدەدەن و هەر خۆیان خاوەنی ئەو دەزگایانەن و بەهەموو شێوەیەك پشتگیری هەر سیستەم و دەسەڵاتێك دەکەن، کە لەگەڵ پرۆژەکەدا بێ و پێشوازی لێبکات. بەبارێکی تردا، میدیا بە تەواوی لە پشتی ئەم پرۆژەیەیە. لەو بیریارانەی کە گەشبینن بەرابەر جیهانگیری (فرانسیس فۆکۆیاما)یە، ئەو پێیوایە سەردەمی جیهانگیری سەردەمێکی بێ وێنەیە لە مێژووی مرۆڤایەتیداو هەموو بەهاکانی دیموکراسی و مافی مرۆڤ و یەکسانی و...، تێیدا هاتۆتەدی و پیادە دەکرێ. هەروەها زانست و تەکنۆلۆژیا گەیشتوونەتە دوا پلەی گەشەسەندن و خۆشگوزەرانی خەڵکی بەگشتی فەراهەم دەبێ. ئەو پێیوایە دەبێ هەموو لایەکمان پێشوازی لەم پرۆسەیە بکەین و کاری بۆ بکەین، تەنانەت فۆکۆیاما بانگی (کۆتایی مێژوو) دەدات و بەدوا قۆناغی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی لە قەڵەمی دەدات.

**گرنگترین لایەنە باشەکانی جیهانگیری بریتییە لە:**

- کار بۆ خێراکردنی جێبەجێکردنەکانی تەکنۆلۆژیای نوێ دەکات. بە پێشکەوتنە خێراو یەك لە دوای یەکەکانی، جیهانگیری دووپاتی دەکاتەوە کە لەهەر ساتێکدا جیهان و تاکێك لەم جیهانەدا دەدۆزێتەوە، بەڵکو هەر ساتێك شتێکی نوێ لە دایك دەبێ و جیهانگیری هەلێکی گەورەیە بۆ سوود بینین لەم شتە نوێیانە و بە کاراییەکی تەواو.
- پیشەسازی و کشتوکاڵ و خزمەتگوزارییە بەرهەمهێنەکان لەسەر ئاستی هەموو ناوچەکانی جیهان پێش دەخات، وەك نەهێڵانی جیاوازییەکان و یەکخستن و جێبەجێکردنی سیستمەکانی بەرهەمهێنان و بازاڕکاری و پارەدان و کادیرە مرۆییەکان کە بە کردەیی سەرکەوتنەکەی پەخشدەکات.
- یەکگرتنی بازاڕەکانی دراوی جیهانی و یەکگرتنی پێوانی نەغدینەیی و یەکگرتنی جیهان و سیاسەتە دارایی و نەغدینەییە جێبەجێکراوەکان لەسەرانسەری جیهاندا، بەجۆرێك جیهان دەبێتە تەنها یەکەیەك.

ئەمانەو چەندین لایەنی باشی تری ئەم دیاردەیە کە لە ناوەڕۆکی بابەتەکە لە شوێنی جیاجیا ئاماژەیان پێدراوە.



## جیهانگیری ئێستا و ئەوانی پێشتر:

جیهانگیری لە هەموو مەیدانەکانی ژیانی مرۆڤدا رۆڵی خۆی دەبینێ و دەست دەخاتە نێو بچووکترین چەمکەکانی هەوڵی مرۆڤ، هەر لە گەشەکردنی بیروبۆچوون و ئازادییە تاك و گونجان لەگەڵ بارێکی داسەپاو و رەتکراوەدا، تا دەگاتە خۆخزاندنە ناو خوو و رەوشتی کۆمەڵایەتی و خێزانیی و تاکەکان و شێواندنیان، لە بوارەکانی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، رۆشنبیری، تەکنەلۆژی و دیموگرافیدا. جیهانگیری دیاردەیەکە دەیەوێ خەڵکی لە ئینتیما ناوخۆییەکەی وەك هۆزایەتی یاخود نەتەوە یان ئایین دوور بخاتەوە، تاکو لەگەڵ هەموو مرۆڤێکیتر تێکەڵاوی کەشوهەوای ئابووری یان تەکنەلۆژی و کوولتوری هاوبەش بێ، بەو واتایە هەوڵی لەناوبردنی تایبەتییەکان دەدات، بەڵام هەر تاکێك لەناوخۆیدا بەسەر دوو رێڕەوی دژ بەیەك دابەش بووە: رێڕەوێکیان دەمارگرژییە بۆ ئایین و نەتەوە و زمان و ناسنامە، ئەویتر یەکانگیربوونە بە جیهانگیریەتی جیهانی. بە واتایەکیتر ئێمە بەردەوام لە نێوان هۆز و جیهانگیری لە هاتووچۆدایین، بۆ ئەوەی دووچاری شیزۆفرینیا نەبین چاکترە لە نێوانیاندا شێوازێکی گونجاو هەڵبژێرین. کارێکی شیاویش نییە دەستبەرداری ناسنامەو رەسەنایەتیمان بین، وەك چۆن ناماقووڵە خۆمان لەو جووڵانەوەی جیهانگیرێتییە دابڕین، ئەگەر بمانەوێ ئەوە ناتوانین دەستبەرداری بین، ئەو پێویستە شێوازێکی گونجاو لە نێوان ئەم دوو رەوتە دژ بەیەکە بدۆزینەوە کە ئەمرۆ بە شێوەیەکی راستەوخۆ بەریەك دەکەون.

ئینتەرنێت ئەمرۆ لە هەموو شتێکیتر زیاتر لە جیهانگیری نزیکمان دەکاتەوە، دونیای هێماو کەلوپەلەکان شوێنی دونیای زمانی گرتۆتەوە، زەوییەکەشمان بۆتە بازنەیەکی گریمانیانەی وەها چەقەکەی هەموو شوێنێك و هیچ شوێنێك بێ، بەڵام ئایا ژمارەی ئەو کەسانە چەند دەبێ کە دەتوانن ئینتەرنێت بەکاربێنن، یاخود سوود لە شۆڕشە زانیارییەکان وەردەگرن؟ راستە زۆرینەی گەل بەتایبەتی لە وڵاتانی باشوور ناتوانن سوود لە ئینتەرنێت و کوولتورەکەی وەربگرن و هێشتا بە کوولتوری ناوخۆو تایفی و هۆزایەتیان پەیوەستن، بەڵام ئەم کوولتورانە هێشتا زیندوون و جەماوەریش دەورووژێنن و وایان لێدەکەن هەست بە ناسنامەی خۆیان بکەن، کەواتە پێویست ناکات بە بیانووی جهانگیریەتی و نوێخوازی خۆیان لێبشارنەوە.

لە هەمانکاتدا دەستەیەك لەوڵاتانی باکوور، هەروەك لە وڵاتانی باشووریش دەتوانن بە ئارەزووی خۆیان ئینتەرنێت بەکاربێنن، بەمەش دەتوانن چارەنووسی نەتەوەکانیان دیاریبکەن. ژیانی ئابووری رۆژ دوای رۆژ زیاتر بەرەو جیهانگیری دەچێ. لەم کاتەشدا ژیانی سیاسی هێشتا

له زۆربەی بەشەکانیدا ناوخۆیی و هەرێمییە، ئاشکراشە جیهانگیری بەر لەوەی لە فۆرمی سیاسی یا کوولتوریدا بێت، بە شێوەیەکی ئابوورییانە روودەدات، بیَ هیچ بەربەست و رێگرییەك کالاّ سنوورەکانی جیهان دەبڕێ.

له کۆمەڵگە کۆنەکاندا تاك کەوتبووە ژێر باڵی دیاردە قیزەونە کۆمەلاّیەتییەکان، ناچار دەبوو لە ناسنامەی تاکی ئایینی و ئابووری و سیاسی و هۆزایەتیدا بتوێتەوە، بەلاّم لەناو کۆمەڵگە نوێیەکاندا ئازادە لەوەی لەیەك کاتدا ئینتیمای بۆ چەند ناسنامەیەك هەبێ. کەواتە مرۆڤی نویَ ئینتیمای بۆ گوندە بچووکەکەی و سەرتاسەری جیهانیش هەیە، لەیەك کاتدا خێڵەکییەکی کۆچەر و نیشتەجێشە، بەو واتایە جیهانگیری شتێکی نوێی بۆ مرۆڤ زیاد کردووە، پێویست ناکات لیَی بترسین. لێرەدا پێویستە هەڵوەستە لەسەر بەکارهێنانی زمانی دوو لایەنە یان دووڕوویی بکەین و دانی پێدا بنێین، چونکە جیهانگیری لە زۆربەی کاتدا ئەمەریکییە، ویلایەتە یەکگرتووەکانیش جۆرێك لە ئیمپریالی یاخود دەست بەسەر جیهاندا گرتن پەیڕەو دەکەن، ئەمە هێزێکە هاوشێوەی لە مێژوودا نییە، لە واقیعیشدا ئەمەریکا سەرکردایەتی سەربازگەی رۆژئاوایی "ئەوروپا، کەنەدا، ئوستراليا" دەکات، ئەمەش جیهانی سەرەکی جیهانگیرێتییە، جیهانێك کە شارستانییەتەکەی لە ڕووی فەلسەفی و رۆشنبیرییەوە لەسەر مافەکانی مرۆڤ و لە رووی سیاسەت و ئابووریشەوە لەسەر رژێمی سەرمایەداری دیموکراتی دایڕشتووە.

جیاوازی لە نێوان ولاّتانی ئەو جیهانە سەربەستەدا هەیە، بەلاّم جیاوازییەکان تەنیا لە ناوەوەیە و بەدیار ناکەون، واتا چاوی دەرەوە نایانبینیَ، ولاّتی چین وەها لە دونیای رۆژئاوا دەڕوانیَ وەك ئەوەی یەك دەستە بیَ و جیاوازی زۆریش لە نێوان ئەمریکاو ئەوروپادا نەبیَ. هیندی و عەرەب و موسڵمان و ئەفریکایی تەنانەت رووسەکانیش بەهەمان شێوە. پێویستە دان بەوەدا بنێین کە ئەم جیهانگیرییەی ئەمەریکا هەمووی هەر خراپ نییە، وەك هەندیَ کەس ئێستا پڕوپاگەندەی بۆ دەکەن، بۆ نموونە بەدڵنیاییەوە لەوە سووکترە ئەگەر جیهانگیریەتی رووسی یا یەکێتی سۆڤیەتیش گەر لە کۆتایی جەنگی سارد سەرکەوتبا سیستمێکی نویَ بەسەر جیهاندا دەسەپاند، چونکە لە رابردووی ئەودا رۆشنبیرییەکی دیموکراتی شك نابات، لەگەڵ ئەوەشدا جیهانگیریەتی ئەمەریکی ئەگەر جیهان لە جۆراوجۆری کوولتور و رۆشنبیری بێبەش بکات، جێی مەترسییە، هەندێکیش نارەزایی خۆیان بەمجۆرە دەردەبڕن و دەڵێن ئەو زیانەی کە بە رۆشنبیری و کوولتورمان دەکەویَ، دەتوانین لە ژێر سێبەری جیهانگیری لە رێگەی



پێشکەوتنی ئابووری دواتر لە رێگەی ئەو دەستەبەرییە ئاشتییەی کە بە هۆی هێزی ئەمەریکی دێتە ئاراوە قەرەبووی بکەینەوە.

(بان کی مۆن) سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان دەڵیَ: "جیهانگیری لە شێوەی قۆناغدا روودەدات، ئێستا لە قۆناغی دووەمداین کە ناسراوە بە سەردەمی گەشەکردن. لە قۆناغی یەکەمی جیهانگیرێتیدا سەرمایە و کالاّ ئازاد کرا، بەوپێیەش سوود و قازانجی وەکو سەرەتایەك، زیاتر ولاّتانی پێشکەوتوو و هاوبەشە بازرگانییەکانیانی گرتەوە. هەر کە پێمان نایە قۆناغی نوێی گەشەکردنییەوە، خەڵکی بە ژمارەیەکی زۆر و بەرچاو سنوورەکان دەبەزێنن لە پێناو گەڕان بەدوای هەلی کار و ژیانێکی باشتر و هەڵهاتن لەو ستەمەی لەمڕۆدا رووبەڕوویان دەبێتەوە، هەروەك دەشبنە هۆکاری برەودان بە پێشکەوتن لە جیهانێکی بزوێندا".

شانسی کوولتوری رۆژئاوایی بە هەموو فۆرمە جیاجیاکانییەوە لە مانەوە و بلاّوبوونەوە و سەقامگیربووندا، لە شانسی هەموو ئەو ژیارە کۆنانە پترە، کە هەوڵیان دەدا کۆنترۆڵی گێتی بکەن و سەرجەمی سەر زەوی بگۆڕنە سەر یەك مۆدیل، ئەمەش لەبەر چەندین فاکتەری ئەبستراکت. لە هەمانکاتدا زالّبوونی یەکجاریی مۆدیلە ژیارێکی دیاریکراو بۆ هەتا هەتایە، ئەمەش شتێکی نەگونجاوە، دیسان لەبەر هۆکارگەلێکی بابەتی. شارستانییەتێك لە مێژوودا بەدەر نەکەوتووە توانیبێتی وەکو شارستانییەتی ئەمەریکی هەموو مرۆڤایەتی لەمپەڕەوە بۆ ئەوپەڕ بگۆڕیَ. جیهانگیری دیاردەیەکی نویَ نییە لە مێژوودا بەرهەمێکی بیَ خەوش و پاڵفتەی رۆژئاواش نییە، بەڵکو دیاردەیەکە لەوکاتەوە پەیدا بووە کە لەسەر رووی زەمیندا هێزی زەبەلاح و خاوەن کاریگەری سەریان هەڵداوە. هەموو شارستانییەتە دێرینەکانیش لە کاتێکدا هەندیَ زیادە هێزیان بەخۆیانەوە شك بردبیَ، هەولّیانداوە ئەو زیادەیە هەناردە بکەن بۆ دەرەوە.

گردۆڵکەکەی رۆژئاوا ئەمجارەیان بەو خێراییە جێی خۆی بەجیَ ناهێڵیَ، کە ئێمە لە شارستانییەتە دێرینەکانمان بینیوە، هیچکام لە شارستانییەتە مەزن و لە ناوچووەکان نەبوونەتە خاوەنی ئەو ئامراز و میکانیزمە لۆجیستی و هۆکاری پەیوەندی و توانای دارایی و سەربازی و رۆشنبیری و ئابوورییە بۆ گۆڕینی جیهان کە ئێستا رۆژئاوا بۆی فەراهەم هاتووە. ئایا هیچکام لە جیهانگیرێتییە دێرینەکان ببوونە خاوەنی هۆکاری میدیای کیشوەربڕی وەك مانگە دەستکردەکان و سەتەلایت و ئینتەرنێت؟ ئایا ئەودەم ئاسمان بۆ ئەوانیش کراوە بوو؟ رەنگە یەکێك بڵیَ خۆ هەموو هۆکارەکانی بلاّوکردنەوە و گەیاندنی فەزایی و ئەلیکترۆنی لە نێو

جیهانگیریەتی نوێدا بەیەك ئاراستەدا ڕێ ناکەن، بەڵکو بە چەند ئاراستەیەکدا ڕێ دەکەن کە دواجار پرۆسەی کارلێککردن دێننە کایەوە. لەگەڵ ئەو ڕاستییەشدا، لایەنی باڵادەست لە نێو فەزای جیهانی و لە ڕووی میدیاوە بریتییە لە ئەمەریکا بەتایبەت و جیهانی کاپیتالیزم بەگشتی. ئەمەریکا کۆنترۆڵی تەواوی هەیە بەسەر ٧٥٪ی ئینتەرنێتی جیهاندا نەك هەر ئەوە، بەڵکو کلیلی خودی ئینتەرنێت لە دەستی ئەمەریکایە، بە شێوەیەك دەتوانێ بە یەك کلیك ئینتەرنێت لە هەموو جیهاندا قوفڵ بکات.

ناکرێ بەراورد لە نێوان کاریگەری میدیا لای زلهێزە دێرینەکان، لەگەڵ ئەم کاریگەرییەی کە هەنووکە بۆ جیهانگیرێتییە نوێیەکان فەراهەم هاتووە بکەین، چونکە ئەمان دەیان جار بەتواناترن لە گۆڕینی جیهان لە جیهانگیرێتییە دێرینەکان، بە هۆی ئەو هێز و توانا زۆرەی لە بواری پەیوەندییەکاندا بۆیان ڕەخساوە، ئەمان پڕچەکن بە بەهێزترین ئاستێك کە ئاوەزی مرۆڤ پێی گەیشتووە لە بواری تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان و پەیوەندییەکاندا. ئەوەتا مانگە دەستکردەکان بەدرێژایی ڕۆژ و شەو بە ئاسمانەکانی جیهاندا دێن و دەچن هەموو هۆکارەکانی گەیاندن و چاودێریکردنی نوێ و سنووربڕیان بۆ دەسازێنێ، لەسەروو هەمووشیانەوە تۆڕی ئینتەرنێت دەسازێنێ کە مەترسیدارترین و ئاسانترین میکانیزمی زانیارییە، چونکە ئەم تۆڕە بەشەکانی گێتی پێکەوە گرێدەدات لەسەر شێوەی سیستمێکی جاڵجاڵۆکەیی زۆر ورد و دزەکار، سەرباری ئەو پەخشەی سەتەلایت کە بە هۆی مانگە دەستکردەکانەوە زۆر ئاسان بووە.

لە کاتێکدا ئەو ژیارە کۆنانە هەوڵیاندەدا نموونەی ژیانی خۆیان بەسەر هەموو کون و قوژبنێکی گێتیدا بسەپێنن، بەدەست ئاریشەی زمانەوە ئالوودە بوون، کەچی جیهانگیریەتی نوێ بە هۆی زمانی ئینگلیزییەوە کە لەم چەرخەدا بۆتە زمانی ئابووری و بازرگانی و میدیا و تەنانەت سیاسەتیش، زیاتر لەبارترە بۆ پراکتیزە بوون، ئەوەتا هەمووان هەڵپە دەکەن بۆ فێربوونی زمانی ئینگلیزی، ئایا هیچکام لە جیهانگیرییەکانی پێشوو، توانیویانە زمانی خۆیان بسەپێنن بەسەر دنیادا بەو شێوە سەپاندنەی زمانی ئینگلیزی کە زمانی زاڵدەستی ئینتەرنێتە و کاندیدە بۆ ئەوەی لە داهاتوودا لەم بوارەدا هەروا بمێنێتەوە، ئێستا ئەم زمانە کۆنترۆڵی ٨٨٪ی پەخشی جیهانی کردووە و ئەڵمانی ٩٪ و فەڕەنسی ٢٪ و زمانەکانیتر ١٪.

# بەشی دووەم

## گەیاندن

«زانست ئەوەندە پێش دەکەوێ دەگاتە ئەو ئاستەی کە بەسەر سروشتدا سەربکەوێ»

(ئەریك فرۆم)

## مانا و مێژووی گەیاندن:

گەیاندن مێژوویەکی زۆر کۆنی هەیە، کە دەگەڕێتەوە بۆ مرۆڤە سەرەتاییەکان، ئەو مرۆڤانەی کە لە ئەشکەوتەکاندا دەژیان، هەر لەو کاتەوە کە مرۆڤ بیری لە (ئەوی دی) کردەوەو دەستی دایە ئامرازێك بۆ تێگەیشتن وەك فۆرم، وێنە، خەت، نووسین، زمان. تێگەیشتن لەوی دی پێویستی بە کۆمەڵێك کۆد و هێما و داتا هەیە، کەڵك وەرگرتن لەم کۆد و هێمایانە بووە مایەی پەیدابوونی زمان، کە زمان گرنگترین ئامراز بوو بۆ تێگەیشتن، پاشان شێوەی ئاخافتن، نووسین و دەق هاتە ئاراوە. نووسین و خوێندنەوە و راڤەکردنیش پێویستی بە زانستی گەیاندن هەیە. لە هەر سەردەم و قۆناغ و هەلومەرجێکدا بە شێوەیەکی جیاواز خۆی نمایش کردووە. باری کوولتوری و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی و سیاسی هەر گەل و رەگەز و نەژادێك پێدەچێ بە ستایلێکی جیاواز مامەڵەیان لەگەڵ ئەم چەمکەدا کردبێ و هەریەکەش ئەدرەسێکی جیاوازیان بە بەریدا بڕیبێ.

گەیاندن ٥٠٠ ساڵ پ.ز هاتە نێو زانستەکانەوە، (ریتۆریك) بە مانای وتاربێژی وشەیەك بوو، بۆ بەکاربردنی چەمکی گەیاندن، کە بریتییە لە دەربڕینی بیروڕای سادە بۆ دروستکردنی کاریگەریی، هەروەها توێژینەوە لە سەر بیروبۆچوونەکان دەکات و دەبێتە هۆی دروستبوونی هاوبەشی لە نێوان وتاربێژ و وەرگردا. زمان وەك میدیایەك لە خزمەتی ریتۆریکدا بوو، (ئەرستۆ) ٣٥٠ ساڵ پ.ز باسی لە ریتۆریك کردووە و دەکرێ وەك مۆدێلێکی سادەی گەیاندن کەڵکی لێوەربگرین. زۆر نیشانە ئەوە دەردەخەن کە گەیاندن بەدرێژایی مێژوو فاکتەرێکی سەرەکی بووە بۆ باشترکردنی شارستانییەت. گەیاندن بە شێوەیەکی ئاسایی پشت دەبەستێ بە: پەیام، رەخنە و پێشنیاز، وەرگر هەروەها نێرەر، پرۆسەیەکە بەکاردێ بۆ کاتی گونجاو بە شێوەیەکی راست بۆ ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری لە نێوان نێرەر و وەرگردا بۆ وەدەستهێنانی ئامانجی خوازراو. پرۆسەیەکە بەکاردێ لە کاتی گونجاوداو بە شێوەی راست.

گەیاندن بریتییە لە کرداری پەیوەندی دروستکردن و کۆمەڵێك هاوتایی وەکو: گەیاندن، گواستنەوە، ئاگادارکردنەوە، لە رێگەی وشە و پەیام و دەق و وێنە و...هتد. (هێنری لیند گێرن) دەڵێ: "گەیاندن لە روانگەی دەروونناسییەوە پێکهاتووە لە تەواوی ئەو بارودۆخانەی کە هەڵگری گەیاندنی مانا بن". ئەنجوومەنی نێودەوڵەتی لێکۆڵینەوە لە سەر ماس گەیاندن دەڵێ:



"مەبەست لە گەیاندن، رۆژنامە، بڵاوکراوە، گۆڤار، کتێب، رادیۆ، تەلەفزیۆن، رێکلام، پەیوەندییە دەروونییەکان (تەلەفۆن، تەلەگراف، ... هتد) چۆنییەتی بەرهەمهێنانی بڵاوکردنەوەی کاڵاکان و ئەو خزمەتە جیاوازانەی کە ئامێرە ناوبراوەکانی سەرەوە لە ئەستۆیانە و توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکانی تایبەت لە ناوەڕۆکی پەیام و دەرەنجامی کاردانەوە (feedback) دەگرێتە خۆی". (ویلبێر شام) دەڵێ: "مەبەست لە گەیاندن دروستکردنی هاوسەنگی بیر (لێکگەیشتن)ە، لەگەڵ وەرگری پەیام لەسەر بابەتێکی تایبەت".

(سکرام) وای دەناسێنێ کە "ئامرازێکە وا لە کۆمەڵگەکان دەکات بگونجێن و لە کۆمەڵگەکانیتر جیای دەکاتەوە". هەروەها (بیریلۆو ستێنەر) پێیانوایە "بڵاوبوونەوەی زانیاری، بیروڕا، هەست و سۆز، توانا و کارامەیی لە رێگەی بەکارهێنانی هێما و وشە و وێنە و ژمارەکان و رەشنووسی هێڵکاری". لەلایەکیترەوە (رۆجەرس) دەڵێ گەیاندن بریتییە لە "پرۆسەی بڵاوبوونەوەی بیروڕا، زانیاری، هەڵوێستی لە سەرچاوەیەکەوە بۆ وەرگر بە مەبەستی کاریگەری لەسەر مەبەست". پێناسەیەکی زۆر ساکاری گەیاندن "بریتییە لە هونەری ناردنی زانیاری و بیروڕاو هەڵوێستەکان بەرجەستە یان نابەرجەستە بێ لە کەسێکەوە بۆ یەکێکیتر یان زیاتر".

لەبەر ئەوەی گەیاندن زانستێکە بە حەز یان ناحەز مرۆڤ ناچارە لە هەندێ رووەوە لە کارەکانیدا، لەگەڵ هاورەگەز و هاوبیر و هاو نەتەوە و هاو خاك و هاو ئامانجیدا ئەنجامی بدات، پێی بزانن یان نا جۆرێك لە پەیوەندی لە ژیاندا بوونی هەیە، بەڵام ئاستی پلەبەندی ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە کە بە گەیاندن ناوزەد دەکرێ، دەکەوێتە ئەستۆی ئەو رەهەندانەی، کە ئەم چەمکە لەخۆی کۆی کردۆتەوە و دەچێتە چوارچێوەی ئەو هێڵە گشتییانەی کە گەیاندن خۆی بە خاوەنیان دەزانێ. بە مانایەکیتر ئێمە رۆژانە گەیاندن لەگەڵ ئەو ژینگە و دەوروبەرەدا دەکەین کە تیایدا دەژین، واتە بە زانین یان نەزانین رۆژانە گەیاندن دەکەین، دەکرێ ناوێکی ترمان بۆ ئەم پەیوەندیکردنە هەبێ یان دەوروبەریش دیدێکی نوێیان سەبارەت بە شیکردنەوەی ئەم بابەتە هەبێ، بەڵام ئەوەی ئێستا زانست جەختی لەسەر دەکاتەوە گەیاندنە بە چەمکە زانستییەکەی.

پێویستییەکانی مرۆڤ هەر لە دروستبوونییەوە بووە هۆی ئەوەی سەرەتا پەیوەندی خودی هەبێ، واتە لەگەڵ هزری خۆیدا پەیوەندی بکات و دەوڵەمەندی بکات، دواتر پێویستی بە بەرابەر وایکرد پرۆسەیەکیتر بێتە ئاراوە، کە گەیاندنەکەی لە خۆیەوە بۆ کەسێکیتر گواستەوە،

بەمەش پەیوەندی دوانە، واتە (نێرەرو وەرگر) هاتە ئاراوە، بۆیە ئەم پرۆسەیە بووە هۆی ئەوەی کە چۆن مامەڵە لەگەڵ تاکەکانیتردا بکات، ئەمەش جۆرێك لە چالاکی نوێی دەرخست کە گەیاندنە بۆ دابینکردنی پێداویستی و ڕێکخستنی ژیان، لەگەڵ گەشەسەندنی کۆمەڵگەدا ژیان و ئامانجەکانیش پەرەیان سەند و لەگەڵ خۆیدا پەیوەندی و ئاڵوگۆڕی بازرگانی بەرەو پێشبرد، ئەمەش مەترسی شەڕو شۆڕی کەمکردەوە و پەیوەندی نێودەوڵەتی هاتە ئاراوە، پاشان گەیاندن بووە پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتی بەردەوام، کە چەندین پرۆسەی ئاکاری و سایکۆلۆژی پەیوەندیدار بە داهێنان و تەکنۆلۆژیای سەردەمی بەخۆوە گرتبوو. لە پاڵ خواردن و جێی نیشتەجێبوون و خۆپاراستندا مرۆڤ پێویستییەکی بنەڕەتی هەیە ئەویش پەیوەندیکردنە بە هاوڕەگەزەکانی، ئەم ئارەزووە جەختکردنەوەیە بۆ مانەوەی شارستانییەت، مرۆڤ لە ڕێگەی بەخشین و وەرگرتنی زانیارییەوە کرداری گەیاندن ڕێکدەخات.

بۆ گەیاندنی پەیام و وەرگرتنی زانیارییەکان دەستکەوتە زانستییە بەربڵاوەکان توانییان ڕێگرە سروشتییەکان ببەزێنن و پێکەوەبەستن لە نێو تەواوی مرۆڤایەتی بێتە ئاراوە و پەیام و زانیاری ئاڵوگۆڕ بکەن. ئێستا شێوازە ئەلیکترۆنییەکان دەگاتە دوورترین ناوچە لە گێتیدا کە باپیرانمان بە کارێکی نەکردەییان زانیوە، وەك ئەوەی پرۆگرامە تەلەفزیۆنییەکان لە پانتایی لایەکی گۆی زەوییەوە دەگاتە لایەکەی تری بە هۆی ئاماژە وایەرلێسەکانەوە کە لەکاتی سووڕانەوەیاندا لە مانگی دەستکردەوە بەدەوری گۆی زەویدا دەردەچێ.

ئێمەی مرۆڤ (کات) و(بۆشایی) ئاسمانمان خستۆتە ژێر خواستی خۆیەوە بە بەکارهێنانی ئامێر و سیستمی گەیاندنی خێرا، ئەم پێشکەوتنە لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی رابردوو هەنگاوبەهەنگاو ڕێگەی گرتەبەر، یەکەمجار چەند خولەکێکی ئەویست تا دەگەیشت، بەڵام کۆششەکانی (هوارد هیو) لە ڕەوانەکردنی مانگێکی دەستکرد، کە بتوانێ لە کاتێکی دیاریکراودا یەك سوڕگە تەواو بکات بە دەوری زەویدا، توانی سەرکەوتن بەدەستبێنێ کە لە ساڵی ١٩٦٤ توانرا لە ڕێگەی دانانی سێ مانگی دەستکردەوە کە بتوانێ دوورییان لە گۆی زەوییەوە یەکسان بێ و تەواوی پرۆگرامە تەلەفزیۆنییەکان بگوازرێتەوە بۆ سەرجەم دانیشتوانی گۆی زەوی.

گەیاندن درێژبوونەوە و ژیانەوەیە، بۆیە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بڵاوبوونەوە بۆ پانتایی فراوان، بە هەمان شێوە لێك نزیکبوونەوەی بیر و ژیری کە لە ئەنجامی ئەم پەیوەندییە کۆمەڵایەتیانەوە هاتە ئاراوە فراوانتر و وشیارانەتر پەیدا بوون، تاکەکەس کاتی درێژبوونەوەی



بۆ کارلێککردنی بەخۆوە دی، چونکە پەیوەندییەکانی بە ژیانەوە گەورەتر و هەمەجۆرتر بوو، وەك زانای کۆمەڵناسی ئەمەریکی (کولی) دەڵێ: "پەیوەندی تازەی جەماوەر وەك شۆڕشێك وابوو هەموو قۆناغەکانی ژیانی سیاسی و بازرگانی و فێربووندا گرتەوە".

گەر جاران زانایان لە دوو چەشن لە سیستمی پێکەوەژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ دەدوان، واتە لە کۆمەڵ و کۆمەڵگە، ئەوا ئێستا پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا ناچارمان دەکان لە فۆرمی نوێی کۆمەڵگە بدوێین. بەردەوام داهێنانی نوێ دەبێتە هۆی خێراترکردن و ئاڵۆزتربوونی کۆمەڵگە، بۆ نموونە شەمەندەفەر و ئۆتۆمبێل و فڕۆکە و ڕۆژنامە و رادیۆ و تەلەفزیۆن و لەسەردەمی ئەمڕۆشماندا کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت، کۆی پێکهاتەی کۆمەڵگە بەرەو گۆڕانێکی بناغەیی دەبات و ڕەهەندەکانی بەکۆمەڵگەبوونی نوێ تێیدا هەڵگری چەندین ئەگەری گەشبینی و مەترسییە. ئەم داهێنانە، واتە تەکنۆلۆژیا و میدیای نوێ، بە تەنها خێرایی پەیوەندییەکان دروست ناکەن، بەڵکو کۆتایی بە باڵادەستێتی شوێنیش دەهێنێ و شوێنە چەپ و دوورەکان لە سەردەمی گواستنەوەی خێرا مانایەکیان نامێنێ، لە سەرووی هەمووشییەوە ئەم پرۆسەیە بەردەوام چەشنی نوێ لە ڕێکخراوی سیاسی و کۆمەڵایەتیمان بۆ بەرهەم دەهێنێ، کە بەم فۆرمەی ئێستا لە سەردەمی جیهانگیریدا هەیەتی، جاران بوونی نەبوو.

ئەگەر تەماشای مێژووی نەتەوەو دەوڵەتی نەتەوەیی لە وڵاتێکی وەکو ئەڵمانیادا لە سەدەی نۆزدە بە روونتر بڵێم شۆڕشی (١٨٤٨-١٨٤٩) بکەین، دەبینین کە بەبێ سەرهەڵدانی شەمەندەفەر ناکرێ راڤە بکرێ، بەهەمان شێوەش لە کوردستانی دوای راپەڕین کاریگەریی ئەم تەکنیکە نوێیانە دەبینین بەسەر پرۆسەی بەکۆمەڵگەبوونەوە و ئەو راستییەمان لەلا بەرجەستە دەبێ، کە جگە لە هۆکارە سیاسییەکان، بەبێ ئینتەرنێت و سەتەلایت و کەرەسەکانی تری پەیوەندیگرتن، لە زۆر ڕەهەندا کوردستان بەئاسانی نەیدەتوانی بەمجۆرە بمێنێتەوە کە ئێستا هەیە. هەموو ڕێکخراوە سیاسی و مەدەنییەکان بەرێگەی ئینتەرنێت و کەرەستەکانی تری میدیا و بڵاوکردنەوە و پەیوەندیگرتن فۆرمێکی دی لە ئامادەبوون و چالاکی دەنوێنن کە جاران لە ئاستێکی تەسکی کۆمەڵایەتیدا بۆیان دەڕەخسا.

کەرەستەکانی پەیوەندی و گەیاندن سنووری دەوڵەتی نەتەوەیی تێکدەشکێنێ و کۆمەڵگەی نەتەوەیی لە (کۆمەڵگەی هێڵی شەمەندەفەر)ەوە بۆ (کۆمەڵگەی زانیاری) دەگۆڕێ، کە کۆمەڵگەیەکە تێیدا چیدی (ئەوتۆبانی ئۆتۆمبێل) زاراوەی گرنگ نییە، بەڵکو (ئەوتۆبانی زانیاری) گرنگە. ئێمە بە هۆی تەکنۆلۆژیای پەیوەندیگرتنی نوێوە لە فۆرمی ئینتەرنێت،

ڕووبەڕووی دەرکەوتەیەکی نوێتر دەبینەوە کە بریتییە لە پێکهاتنی (کۆمەڵگەیەکی ڤێرتویلی)، واتە ئەو کۆمەڵگە نافیزیکییەی کە کۆی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و چالاکی کۆمەڵایەتی دەزگا کۆمەڵایەتییەکانی تێدەخزێ و ئێستاش بە هەموو ئەو ئەگەرانەی کە لە ناو خۆیدا هەڵیگرتووە، لە پرۆسەی بەکۆمەڵگەبوونی نوێدایە.

(د. حەمیدە سمێسم) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە دیاردەی گەیاندن حەوت ڕەهەندی لەخۆ گرتووە کە لە ناو یەکدا پێکداچوون، سەرەڕای ئەوەی کە هەر یەکێك لەوانە تایبەتمەندی خۆی هەیە. حەوت ڕەهەندەکەش بریتین لە:

١- وەرگرتنی زانیارییەکان جا ناوخۆیی بن یان دەرەکی کە بریتین لە پەیامەکان (زانیارییەکان) و توانای چارەسەرکردنی ئەو زانیاریانەی کە وەردەگیرێن.

٢- دروستکردنی چوارچێوەیەکی فیکری دیاریکراو لەمیانەی شارەزاییە پێشووەکان لە پرۆسەی شیکردنەوەی زانیارییەکاندا.

٣- بونیاتنانی سیستمێکی بەهایی یەکگرتوو لە نێوان توخمەکانی کۆمەڵگەی سیاسیدا، کە سەرکردە ڕۆڵێکی کاریگەری تیادا دەبینێ لە بەیاساییکردنی بە شێوازێکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ.

٤- دۆزینەوەی ئەو فاکتەرانەی کە زیاتر کاریگەرییان لە پاراستنی کیانی وڵات لە هەر هەڕەشەیەکی دەرەکی هەیە.

٥- بە جەمسەربوونی سەرکردە و ڕاکێشانی بۆ خەڵك بۆ ئەوەی هەموو توخمەکانی بەئاگابوونی کۆمەڵایەتی لە دەوری کۆببێتەوە، هەروەها ویستی ئامادەکاری و ڕێکخستن ڕێکبخات.

٦- توانای لەشی سیاسی لە بونیاتنانی بزاڤێك کە خاوەن توانای ڕاستەقینە بێ بۆ پاراستنی کیانی دەوڵەت لە هەر دەستدرێژییەکی دەرەکی.

٧- بوونی سەرۆك بە پاڵەوانی نەتەوەیی لە کاتەکانی ململانێی چارەنووسییدا.

## تەکنۆلۆژیای نوێی گەیاندن:

لە دووەمین جەنگی جیهانییەوە، تۆڕە ئاڵۆزەکانی گەیاندنی نێودەوڵەتی گەشەیان سەند بە چەشنێ توانایەکی مەزنیان ڕەخساند بۆ شەپۆلی هاتنی زانیاری، ئیدی کار لە یەکدی کردن لە نێوان دوو زاراوەدا بووە شتێکی ئاسایی، کە دەکرێ بەمجۆرە شیتەڵ بکرێن: تاکایەتی و جیهانایەتی کۆمەڵ، هەروەها هەوڵدان لە پێناو تەواوکردنی پێداویستییەکانی پێنجەمین



قۆناغی گەیاندن، کە بریتییە لە گەیاندنی ئەلیکترۆنی، کە پشت بە تەکنۆلۆژیا گەیاندن دەبەستێ بەتایبەتی مانگی دەستکرد و کۆمپیوتەر. (هارۆلد لاسویل) لەو بڕوایەدایە کە ئەم شۆڕشی گەیاندنە ڕەزمی مێژووی گەرمتر کرد "ئەوەی لە ڕابردوو ڕوویداوە ڕەنگە ئێستاش ڕووبداتەوە".

لەگەڵ شۆڕشی مەزنی تەکنەلۆژی گرنگی بێ پایانی ئامرازی تەلەفزیۆنی لەم چاخەی ئێستادا هاتە ئاراوە، ئەمڕۆ تەلەفزیۆن بۆتە ئامرازی گەیاندنی بێسنوور و بە ئامرازی نێودەوڵەتیی دادەنرێ بۆ گواستنەوەی بیرۆکە و ئامانج و بەهاکان، بۆیە گەشەسەندنێکی بەردەوام هەیە لەوەی ناودەبرێ بە پارەپێدان (تمویل)ی تەلەفزیۆن وەك بەشێك لە پرۆسەی گەشەپێدان و نوێکردنەوە لە کۆمەڵگە جیاوازەکاندا. ئێستا هەموو وڵات یان هەرێمێك سوورە لەسەر هەڵدانی مانگێکی دەستکردی تایبەت بە خۆی کە تیایدا هەزار تۆڕی تەلەفزیۆنی هەڵگرتبێ. پەیوەندی نێوان تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان و تێکنۆلۆژیای گەیاندن بریتییە لە بارێکی پێکەوە گرێدراو و لێکجیانەبۆوە، ئەمەش بە هۆی باڵادەستبوونی سیستمی دیجیتاڵییەوە کە سیستمەکانی گەیاندن پێیگەیشتوون، بۆیە تۆڕەکانی زانیاری پێکەوە بەستراون، ئەمەش لە ژیانی ڕۆژانەماندا دیارە. بۆیە قۆناغی ئایندەی شۆڕشی زانیاری بریتی دەبێ لە یەکگرتنی تێکنەلۆژییە جۆراوجۆرەکان لەگەڵ ئامرازەکانی گەیاندندا، کە بۆتە مایەی سەرهەڵدانی چەمکی تەکنۆلۆژیای نوێی گەیاندن کە بە شێوەیەکی گەورە کار دەکاتە سەر هۆیەکانی پەیوەندیکردن و کاریگەری زیاد دەکات لەسەر هەموو ئاستەکاندا.

**ئەم چەمکەش بریتییە لەو ژێرخانەی کە هەموو بوارەکانی چالاکی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کوولتوریی بەزاندووە، کە بریتین لە سێ کەرتی بنەڕەتی:**

١- شۆڕشی زانیارییەکان کە بریتییە لەو تەقینەوە زانینە زەبەلاحە کە خۆی لەو بڕە زۆرەی زانینە دەبینێتەوە لە شێوەی پسپۆری و زمانی جۆراوجۆر، کە لە توانادا هەیە کۆنترۆڵ بکرێ و سوودی لێ ببینرێ بە هۆی تێکنۆلۆژیای زانیارییەکانەوە.

٢- ئامرازەکانی گەیاندن کە خۆی لە تێکنۆلۆژیای گەیاندنی تەلدارو وایەرلێسدا دەبینێتەوە، هەروەها تەلەفزیۆن و دەقە تەلەفزیۆنییەکان، تادەگاتە مانگە دەستکردەکان.

٣- کۆمپیوتەرەکان لەهەموو بوارەکانی ژیاندا بەکاردێن و تێکەڵ بووە و لەگەڵ هەموو ئامرازەکانی گەیاندندا یەکی گرتووە.

سەرەڕای هەموو ئەوانەی کە سەردەمەکەمان پێی دەنازێ لە دەوڵەمەندی زانیارییەکانی و توانای رێکخستن و خێرایی بڕیارەکانی، هێشتا مرۆڤ تینووە بۆ پیشاندراوە راستگۆییەکەی و بە پەرۆشە بۆ حیکمەتی بەرچاو روونی کە رزگاری دەکات لە زانیاری چەواشە و بەفیڕۆیی دەستە شاراوەکان کە بەجیهانیی دەکات و بەسەر کوولتووردا زاڵدەبێ بۆ حیسابی ئارەزوو و چاوچنۆکی تایبەت بە جیهانگیرییان. ئێمە پێویستمان بە جیهانێکە کە سەرلەنوێ لەسەر بنەمای پەرەپێدانی تەکنەلۆژی بونیات بنرێتەوە، وەك ئامرازێکی کوولتوری و پەروەردەیی، بەڵام کێشەی راستەقینە ئەوەیە، کە سەرەڕای ئەو پێشکەوتنە گەورەیەی کە لەم سەردەمەدا لە هەموو بوارەکان پێیگەیشتووین، هێشتا چەندین کەس هەن کە هیچ لە بارەی کۆمپیوتەرەوە نازانن کە زمانی سەردەمە و پێویستە هەمووان مامەڵەی لەگەڵدا بکات، چونکە کار بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی زانستی و فیکری و کوولتوری دەکات.

لە نوێترین شێوازە تەکنۆلۆژیاکان لە بواری گەیاندنە ئاسمانییەکان، بەکارهێنانی سیستمی ناردنی جیهانی نوێی کەناڵە ئاسمانییە تەلەفزیۆنییەکانە بەناوی (Motion Picture Expert Group)، کە سیستمی تەکنۆلۆژیای ئاماژە بینراوە ژمارەییە فشارهێنەکان (Digital Video Compression) بەکاردێنێ لە ئێزگەی بەرنامەی کەناڵەکان. بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیای نوێ و ئەو پەرەسەندنە گەورەیەی کە لە بواری مانگە دەستکردەکانەوە هاتۆتە ئاراوە بۆتە هۆی ئەوەی زۆر لە تۆڕە هەواڵییە تایبەتمەندەکان پەخشەکەی لە ماوەی ٢٤ کاتژمێردا بڵاو بکاتەوە و هەریەکەیان هەوڵی راکێشانی جەماوەر دەدات بۆ لای خۆی و لەمیانەی سیاسەتگەلی میدیایی دیاریکراوەوە دەجوولێتەوە. بەڵام ئەم تەکنۆلۆژیایە کە بازدانێکی گەورەی لە بواری کارکردنی هەواڵی تەلەفزیۆنی هێناوەتە ئاراوە لە رووی بەکارهێنانی سیستمەکانی ڤیدیۆتیب، پەخشی راستەوخۆ، مۆنتاژی راستەوخۆ...تد. گەرچی لەلایەن هەڵسوڕێنەرانی گەیاندن لەم دەزگا تەلەفزیۆنییانە تۆمەتی ئاراستەکرا بەوەی بەپێی پێویست بایەخ بە هەواڵێکی باشتر نادات، وەك ئاماژەیەك بۆ دەستتێوەردانی رەهەندگەلیتر لە پرۆسەی گرتنەخۆ (**تغطیة**)ە هەواڵ، دیارترینیان ئەوەی خاوەنی ئەم تەکنۆلۆژیایە بێ دەتوانێ چارەسەرە گەیاندنەکان وێنا بکێشێ بەو پێیەی کە دەیەوێ.

لەبەر ئەوەی زانیاری، واتە تێگەیشتن، کەواتە هەموو لە خەمەکان هاوبەش دەبین و بۆ سووککرنیان یەکانگیر دەبین، خۆ ئەگەر لەسەر ئاستی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانیش بێ ئەوا جیهان دەبێتە جیهانێکی دیکە. لە ژینگەیەکی لەمجۆرەدا، کە زۆربەی خەڵکی بە هۆی لافاوی



زانیارییەکانەوە کە بە ئازادی لە هەر چوارگۆشەی دونیاوە ئاڵوگۆڕ دەکرێن، گرنگی بە کاروباری دەدەن، چونکە وا چاوەڕوان دەکرێ ئەو گۆڕینەوەی زانیارییە ببێتە مایەی لێکنزیک کەوتنەوەی رەفتاری سیاسەتی دەرەوەی وڵاتان، بە شێوەیەك کە زیاتر لەگەڵ ئارەزووی خەڵکی ئاساییدا کۆك بێ، بەڵام ئەوەی لە واقیعدا روودەدا خەون نییە، پتر لە مۆتەکە نزیکە، هەر شیکردنەوەیەکی لەسەرخۆ بۆ ئاڵوگۆڕی هەنووکەیی هەواڵەکانی دەرەوە لە جیهاندا، کۆنتراسێکی ئاشکرا دەخاتەڕوو، چونکە ئەو زۆربوونە سەرسوڕهێنەی لە توانستی بەرهەمهێنان و پەخشی هەواڵەکاندا هاتۆتە ئارا، کەمبوونەوەیەکی بەرچاو لە رێگەی بەکاربردنی هەواڵانەی لەبەرابەردایە، ئەمەش دیاردەیەکە لە هەموو جیهاندا تەنانەت لە ئەمەریکاشدا بوونی هەیە. هەرێمگەلێکی زۆر هەن لە جیهاندا بەهیچ جۆرێك دەستی هەواڵنووسانی نەگەیشتووتێ، جا لەبەر گرانی تێچووی کردەی کۆکردنەوەی هەواڵ بێ لەو شوێنانەدا، یا لەبەر بوونی دەسەڵاتی ملهوڕ و کەڵەگا کە رێگە لە رۆژنامەنووسان دەگرن. راستیش ئەوەیە، کە جیهان هێشتا ئەوەندە پێکەوە پەیوەست نییە، کە ئەفسانەی گوندی گەردوونی دەیخاتەڕوو، چاکترین گریمانەش ئەوەیە کە رێژەی شارەزاییمان بە جیهانی هێشتا هاوسەنگ و یەکسان نییە و لاسەنگە.

**(ئەلفن تۆفلەر) لە کتێبی (گۆڕانی دەسەڵات لە نێوان توندوتیژی و شۆڕش و زانیندا) وای دەبینێ کە تەکنۆلۆژیای گەیاندنی ئەم سەردەمە هەشت تایبەتمەندی هەن:**

١- کارلێککردن: بەڕادەی کارلێککردنی بەشداربووان لە کرداری گەیاندن لەسەر رۆڵەکان دەوترێ و بەتواناییان بۆ ئاڵوگۆڕکردنی ئەو رۆڵە، ئەم پەیڕەوکردنەش پێی دەوترێ (پەیڕەوکردنی کارلێککردن).

٢- ناجەماوەرێتی: واتە دەکرێ پەیامی گەیاندن ئاراستەی تاکە کەسێك یان کۆمەڵە کەسێکی دیاریکراو بکرێ نەك ئاراستەی جەماوەرێکی زۆر، وەك چۆن لە رابردوودا رووی دەدا.

٣- هاوکات نەبوون: واتە هەبوونی توانای ناردن و وەرگرتنی نامەکان لە کاتێکی گونجاودا بۆ هەر کەسێکی بەکارهێنەر و پێویست ناکات هەموو بەشداربووان ئەو سیستمە لە هەمانکاتدا بەکار بێنن.

٤- توانای جموجۆڵ: زۆر ئامێری گەیاندن هەن کە بەکارهێنەرەکەی دەتوانێ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە سوودی لێ ببینێ لە کاتی جموجۆڵیدا وەك بەکارهێنانی مۆبایل.

٥- تواناى گۆڕانكارى: بريتييه له تواناى هۆيەكانى ميديا بۆ گۆڕينى زانيارييەكان له بارێكەوه بۆ بارێكى ديكه، وەك ئەو تەكنۆلۆژيايانەى كه له توانايانـدا هەيه نامەيەكى بيستراو بۆ نامەيەكى نووسراو يان بەپێچەوانەوه بگۆڕن.

٦- تواناى پێكەوەلكاندن: واته تواناى لكاندنى ئامێرێكى گەياندن به ئامێرێكى گەياندنى ديكەوه كه شێوەكەى جياواز بێ، بەبێ رەچاوكردنى ئەو كۆمپانيايەى كه دروستيكردووه يان ئەو وڵاتەى كه تيايدا بەرهەم هێنراوه.

٧- بڵاوبوونەوه: واته بڵاوبوونەوەى پرۆگراميیانه بۆ سيستمى ئامرازەكانى گەياندن له سەرتاسەرى جيهاندا.

٨- بەنێودەوڵەتيكردن: ژينگەى سەرەكى نوێ بۆ ئامرازەكانى گەياندن بريتييه له ژينگەيەكى جيهانى نێودەوڵەتى، بۆ ئەوەى زانيارييەكه رێڕەوى دياريكراوى خۆى بگرێتەبەرو ئەو رێگايانه بدۆزێتەوه كه دەسكەوتى ماددى تيادا دەستدەكەوێ بەناو سنوورە نێودەوڵەتييەكاندا. ئەم خەسڵەت و تايبەتمەندييه تێكنۆلۆژييانەى ئامێرەكانى گەياندن كاريگەريى خۆى هەبووه لەسەر كۆمەڵگە و سيستمى زانيارييەكان، ئەوەش لەميانەى گەشەسەندنى خێراو يەكلاكەرەوه له شێوازى هەڵگرتن و گەڕانەوەى زانياريدا، هەروەها تێگەيشتن له خودى چەمكى زانيارى.

زانيارى بۆتە چەمكێكى فراوان كه وێنه و فۆرم و دەقى نووسراو و نەخشەسازييەكان ... هتد، له خۆى دەگرێ و تەنها ژماره و هەڵگرتن و گەڕانەوه له خۆ ناگرێ، بەڵكو دەنگ و ئاماژه و لەرەى شەپۆلى و تيشكييەكان لەخۆ دەگرێ. له هەمانكاتدا ئەم زانيارى و سيستمى بيركردنەوەيه بۆتە كالايەك بۆ ئالوگۆڕكردن لەلايەن وڵاتانى باكوورى دەوڵەمەندەوه، كه ئەم كالايانەش تا ئێستا پێناسه نەكراون، سەرەڕاى ئەوەى كه ئەم سيستمى زانيارييانه بۆتە هۆى دارشتنى زانيارى به شێوەيەك دەربڕى كوولتورى هەستى و بەها نامادديیەكان نييه. لەگەڵ خۆبەدەستەوەدان بۆ دەسكەوتە زانيارييەكان و سەرسامبوون پێيان دەستتێوەردانێك روويدا له وەسفكردنى كێشه تايبەت و ناوخۆييەكان هەروەها شێوازى بڕياردان له بارەيان لەميانەى بەكارهێنانى كۆمپيوتەرەوه و بوونى بڕێكى زۆرى بەرنامەى ئامادەكراو كه خەڵكانێكى ديكه ئامادەيان كردووه، هاوكات دروستكردنى تێكنۆلۆژياى گەياندن و بەستنى به تێكنۆلۆژياى زانيارييەكان بووه هۆى تێكەڵاوبوونێكى زۆرى شارەزاييه زۆره زانستى و ئەكاديمييەكان لەگەڵ خودى كردارى پيشەسازيكردنەكەدا.



لێرەدا جياوازى نێوان زانينه بنەڕەتييەكان و بەرهەمه پيشەسازييەكان نامێنێ، هەروەها پيشەو زانست و پيشەسازييه ئەليكترۆنييەكان به شێوەيەكى بێ وێنه كامڵ دەبن، ئەمەش بووه هۆى هاتنەئاراى گەشەسەندنى نوێ له جيهانى تێكنۆلۆژياى گەياندن و زانياريدا، لەوانه:

١- كامڵبوونى بەرەو سەرەوه و بڵاوبوونەوەى زانيارييەكان، بۆيه ئامێرى نوێتر دروستدەكرێ و ئەمه دەبێته مايەى كامڵبوونى زياترى بەرەو سەرەوه.

٢- سيستمەكانى زيرەكى پيشەسازى دەبێته راستييەكى حاشا هەڵنەگر و كاريگەرى خۆى دەبێ كه له دوارۆژدا له توانايدا دەبێ به زمانه سروشتييەكان گفتوگۆ بكات و له ئەزموونەكانەوه فێر دەبێ و له توانايدا دەبێ پێشبينى ساده بكات، سەرەڕاى ئەنجامدانى چەندين جۆرى پرۆسەى ئاڵۆز و له ئايندەشدا ئەم سيستمه تواناى بينين و هەستكردن به گۆڕانكارى له دەوروبەره سروشتييەكەيدا دەبێ و دەق و وێنه و دەنگ و رەنگەكان تێكەڵى يەك دەبن و بۆ چارەسەركردنى ئەو كێشانه بەكاردەهێنرێ كه ئاڵۆزييەكى زۆريان تێدايه.

٣- بەكارهێنانى تۆڕەكان له مرۆڤى ئامێرى (رۆبۆت) و كۆمپيوتەرەكاندا له دوارۆژدا پێش دەكەوێ، كه به بەردەوام كار بۆ بەرهەمهێنانى زۆر دەكەن و ئەو هەموو رواڵەتانەى كه ئێستا كاريگەرييان هەيه لەسەر پيشەسازى هەموويان تووشى گۆڕان دەبن، ئەمەش كاريگەرييەكى زۆرى دەبێ لەسەر پرسەكانى كارگێڕى و خەرجييەكان و چەندين لقى نوێ له بوارى ئابووريدا دێنه ئاراوه بۆ چارەسەركردنى ئەم دياردە نوێيانه و چەمكى (هێزى كار) و هەڵوێستى بەرابەر (پەيوەندييەكانى بەرهەمهێنان) به شێوەيەكى ريشەيى دەگۆڕێ.

٤- له دوارۆژدا زياتر پشت به زانينه رێكخراوييەكان دەبەسترێ و زانينەكان به شێوەيەكى وەها گەشه دەستێنێ كه گونجاو بێ لەگەڵ ئەو پێشكەوتنانەى پێشتر باسمان كرد و پێويستبوون به زانيارييەكان زياتر ئاڵۆز دەبێ و لەژێر بارودۆخى جۆراوجۆردا زۆر بوار دەگرێتەوه و گەشەسەندن لەم بوارەدا وەك بنەمايەك دەبێ له هەموو بواره تێكنەلۆژييەكانى ديكه له شۆڕشى زانياريدا.

سيستمى فێركردنى نوێ دێته ئاراوه كه پێويستى زياتر دەبێ بۆ بەكارهێنانى كۆمپيوتەر و سيستمى زانيارييەكان له بەرنامه فێركارييەكان و هەموو كەسێك له توانايدا دەبێ به تەنيا رێنمايى وەربگرێ، ئەمەش لەميانەى تۆڕى خزمەتگوزارى فێركردن و مەشق پێكردنەوه و نەخوێندەواريش لەو كاتەدا بەوه دەوترێ، كه تواناى شيكردنەوه و هەڵگرتن و گەڕاندنەوەى زانيارييەكانى نەبێ و تەنها بەوه ناوترێ كه تواناى خوێندنەوەى نووسينى نەبێ.

**٥-** لەوانەیە سیستەمگەلی نویٚ بۆ پیادەکردنی بەشداریکردنی سیاسی لە هەڵبژاردن و دەنگدان و راپرسییە گشتییەکاندا بێتە ئاراوە، کە (لۆرانس گروسمان) بە (کۆماری ئەلیکترۆنی تازە پێگەیشتوو) وەسفیدەکات، بەوەی تێکەڵێکی سیاسییە و پرسەکە تەنها بریتی نابیٚ لە بوار رەخساندن بۆ هاووڵاتیان لە هەڵبژاردنی ئەوانەی کە فەرمانڕەواییان دەکەن، بەڵکو بە شێوەیەکی زۆر و راستەوخۆ دەتوانن لە داڕشتنی ئەو یاساو سیاسەتانەی کە پێی بەڕێوە دەچن بەشداری بکەن. بە بەکارهێنانی تۆڕە گەیاندنە ژمارەییە پێشکەوتووەکان کە بە هەردوو ئاراستەی ناردن و وەرگرتن کار دەکەن، بەمەش رای گشتی خاوەن قسە دەبیٚ لەسەر مێزی دەسەڵاتی سیاسی.

هەروەها پەرەسەندنی تەکنۆلۆژیاکانی گەیاندن و زانیارییەکان بووە هۆی رووداني گۆڕانکاری بنەڕەتی لە بونیاتی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە زۆر لە وڵاتانی جیهاندا و بەتایبەتی وڵاتە زۆر پێشکەوتووەکان، کە لە ئاکامی ئەم پەرەسەندنەدا نموونە ئابوورییەکی تازە هاتۆتە ئاراوە کە بە ئابووری زانیارییەکان ناوزەد کراوە، کە زانیارییەکان رۆڵێکی سەرەکی دەگێڕن لە چالاکییە ئابوورییەکانداو، لە ئابووری زانیارییەکاندا دەزگاکان پشت بە وەدەستهێنانی زانیارییەکان و بەکارهێنانی ئەو زانیاریانە لە کات و ساتی گونجاو دەبەستن، زیاتر وەك لە پشتبەستن بە ماددەی خاو و کەمکردنەوەی کرێی کرێکاران.

ئامرازە نوێیەکانی گەیاندن و تۆڕە پێشکەوتووەکانی زانیاری بە فاکتەری گرنگ دادەنرێن کە توانا دەبەخشنە دامودەزگا بەرهەمهێنەرەکان بۆ بەدەنگەوەهاتنی خێرای داواکاری کڕیارانیان و دابینکردنی بەرهەمی باشتر لە بازاڕە ناوخۆیی و جیهانییەکاندا، بابەتەکەش بەوەوە رانەوەستا، بەڵکو ئەم گەشەسەندنە بووە هۆی گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لە جموجۆڵی بازرگانی نێودەوڵەتی لە نێوان وڵاتە جۆراوجۆرەکانی جیهاندا، چونکە ئامێرە تازەکانی گەیاندن هەلێکی کێبرکێی چاکی هێنایە ئاراوە بۆ خاوەنەکانیان لە بازاڕەکانی بازرگانیدا بەتایبەتی لە کاتێکدا نرخەکانیان بە بەردەوامی لە داشکاندایە. ئێستاش جیهان دابەشکردنێکی بەرچاو بەخۆوە دەبینیٚ لە نێوان ئەو وڵاتانەی خاوەن ئابووری خێرا گەشەسەندوون لە ئەوروپا و هەندیٚ وڵاتانی ئاسیا کە پشتیان بەستووە بە تەکنۆلۆژیا نوێیەکانی زانیاری و گەیاندنەوە، هەروەها ئەو وڵاتانەی کە خاوەن ئابووری خێرا گەشەسەندوون لە ویلایەتە یەکگرتووەکان و ئەورووپاو هەندیٚ لە وڵاتانیتری ئاسیا کە پشت دەبەستن بە تەکنۆلۆژیا نوێیەکانی زانیاری و گەیاندنەوە و لە نێوان ئەو وڵاتانەی کە خاوەن ئابوورییەکەی گەشەسەندنی لەسەرخۆن و خاوەن تەکنۆلۆژیای پێشکەوتوو نین و ئێستاش بە بەردەوامی جیاوازییەکەیان زیاتر دەبیٚ، ئەگەر نەڵێین کە (بۆشاییەکی میدیایی) و زانیاری گەورە هەیە لە نێوان



وڵاتە پێشکەوتووەکان و وڵاتە تازە گەشەسەندووەکان، بە هۆی دەستبەسەراگرتنی ئامرازەکانی گەیاندنەوە لەلایەن وڵاتە پێشکەوتووەکانەوە، کە جۆر و ئاراستەی ماددە میدیاییەکان لەم سەردەمەدا لەژێر کۆنترۆڵی ئەواندایە.

ئەمەش وایکردووە لە وڵاتە پێشکەوتووەکان لە رووی ئابووری و تەکنەلۆژی و میدیایەوە بۆچوونە کوولتورییەکانی خۆی بەسەر لایەنی بەرابەر (وڵاتە گەشەسەندووەکان) دا بسەپێنیٚ و پاڵی پێوە ناوە کە جەخت لەسەر نیشاندانی ئەو بارودۆخە ئاڵۆزەیان بکەن، کە پڕە لە جەنگ و تەنگژەی سیاسی و نائارامی و کێشەکانی دیکە کە لەم وڵاتانەدا هەن، بە مەبەستی زیادکردنی ئەو کێشانە، ئەوەی لە وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەفەریقادا روو دەدەن باشترین نموونەن لەمبارەیەوە. ئەوەش کە ئەم بۆشایی میدیایەی فراوانتر کرد بریتییە لەو هەژموونە نیمچە رەهایەی وڵاتە رۆژئاواییی و کۆمپانیا فرە رەگەزەکان، بازاڕی تەکنۆلۆژیای گەیاندن و میدیا لە رووی بەرهەمهێنان و بەکاربردنەوە لە نێوان سیٚ لایەنی سەرمایەداری باڵادەستدایە بەرێژەی ٩٠٪، ئەمانەش دابەشبوونە لە نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکان بەرێژەی **٣٧٪** و یەکێتی ئەورووپا بەرێژەی **٢٩٪** و ژاپۆن بەرێژەی **٢٤٪**. شۆڕشی تەکنەلۆژی و زانستی کە بە شێوەیەکی تایبەتی خۆی لە پێشکەوتنی گەیاندنەکان و زانیارییەوە دەبینێتەوە، مەرجی نوێی داسەپاندووە لەسەر شێوازی پەیڕەوکردنی ئابووری و سیاسی و کوولتوری هەموو میللەتانی سەر گۆی ئەم زەوییەو، لەگەڵ پەرەسەندنی ئامرازەکانی گەیاندنی و کورتکردنەوەی مەودای شوێنی و کاتیی و دەروونییەکان، ئەوا هەلی یەکگرتنی جیهانی زیاتر دەبیٚ و پێکهاتە کلاسیکییە ناسراوەکان بیٚ توانا دەبن لە وەرگرتنی هەموو ئەو چالاکییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییە میدیاییە نوێیانە و پێویستییەکی زۆر دەبیٚ بۆ پرۆسەی دووبارە بونیاتنانەوە.

## مانگی دەستکرد و گەیاندن:

مانگی دەستکرد بە چەمکە بنەڕەتییە سادەکەی بریتییە لە ئامێرێکی هەڵگرتووی کەلوپەل کە بە جیاوازی ئامانجە مەبەستدارەکە دەگۆڕیٚ. بە بەرزی **٣٦** هەزار کیلۆمەتر لەسەر زەوی بەهاوکاری مووشەکە دوور هاوێژەکان بۆ بۆشایی دەرەوە هەڵدەدریٚ، کە دەیخاتە خولگە دیاریکراوەکەی لەسەر زەوی. پاشان ئەم موشەکانە دەتەقێنەوە، یان دەگەڕێنەوە بۆ زەوی بۆ هەڵگرتنی ئامێرێکی ئاسمانی دیکە. بۆیە ئەو مانگە بریتییە لە کیبۆردێکی ئەلیکترۆنی وەك وێستگەیەکی ناردن و وەرگرتن کە ئەنتێن و ئامێری وەرگرتن و ناردن و پێچەوانە و

كەمكردنەوەی ژاوەژاو لە خولگەی دەوری زەوی لە دەرەوەی هێزی راكێشانی زەوی دەسوورێتەوە، توانای دووبارە گواستنەوەی ئاماژەكان لە خاڵێكەوە بۆ خاڵێكیتر یان خاڵەكانیتر لەسەر گۆی زەوی هەیە. مانگە دەستكردەكان بریتین لە خاڵگەلی دابەشكردن كە دەتوانێ ئاماژە و بەرنامە بیستراو و بینراوەكان و پەیوەندییە تەلەفۆنییەكان وەك بروسكە بگوازێتەوە یان بەپێچەوانەوە، تەمەنی ئەم مانگانە لە نێوان ٧-١٠ ساڵدایە.

مانگە دەستكردەكان وەك هۆیەكی گەیاندن، جوگرافیای گەیاندنی فراوان كردووە و توانیویەتی لە دوورترین جێگەی جیهانەوە پەیامەكانمان بگەیەنێ و بەپێچەوانەوە پەیامی ئەوانیشمان بۆ بێنێ، بەجۆرێك جیهانی كردۆتە گوندێكی بچووك، كە هەموو تاكەكان ئاگاداری پەیامی یەكدی دەبن، بە تێڕوانینی هەندێ كەس سەرەتای راستەقینەی بەكارهێنانی مانگی دەستكرد لە بواری پەیوەندیكردن دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٦٠، كە ئەمەریكا مانگی دەستكردی (ئیكۆ)ی هەڵدا كە ٢٠ ساڵ لە ئاسماندا مایەوە و ملیۆنەها مرۆڤ دەیانبینی. هاوكات هەندێكیتر لەو بڕوایەدان مانگی ئەمەریكی (تلستار ١) سەرەتای بەكارهێنانی مانگە دەستكردەكانە لە مەبەستەكانی پەخشی رادیۆیی و تەلەفزیۆنی، كە لەساڵی **١٩٦٢** هەڵدرا.

مانگە دەستكردەكان تەنها دابینی گەیاندنی پێشكەوتوو ناكەن، بەڵكو یاریدەدەرن لە پەخشی راستەوخۆی پرۆگرامە تەلەفزیۆنییەكاندا ئەمەش رێخۆشكەرە لە بڵاوبوونەوەو گەیاندنی خێرای پەیامەكان لە نێرەرەوە بۆ وەرگر و بە پێچەوانەوە. لەم ساڵانەی دواییدا تەكنۆلۆژیای وەرگرتن پێشكەوتنی بەرچاوی بەخۆوە بینی ئەویش بە بچووككردنەوەی قەوارەی (هەوایی-رادیۆ) و دابەزینی نرخی تێچوون بۆ دەزگا ئەلیكترۆنییەكان، كە پەیوەستن پێوەی. ئێستا جیهان بازدانێكی گەورە بەخۆوە دەبینێ سەبارەت بە بوارەكانی مانگە دەستكردەكان لە گەیاندنەكان كە وایلێهاتووە ناوی (Super Highway Media)ی لێ دەنرێ، بەوەی سیستمێكی تەواوكەری مانگە دەستكردەكانی خولگەی جێگیر و جوولاو و تۆڕەكانی مایكرۆییفی دیجیتاڵی و هاوتایی و تۆڕەكانی هێڵە تەوەرییەكان و ریشاڵە رووناكییەكان و تۆڕەكانی پێكهێنانی لەرەلەری و تەكنیكی وێستگەكانی ناردن.

خولگەی جێگیر ئێستا قەرەباڵغ بووە بە چەندین مانگ دوای ئەوەی هەمووان لە گرنگی مانگە گەیاندنەكان گەیشتن، بەجۆرێك نەتەوە یەكگرتووەكان ناچار بوو لیژنەیەك پێكبێنێ كە بەرپرس بێ لە رێكخستن و هەڵپەساردنی مانگەكان لە خولگەی جوگرافیی جێگیر و شوێنێك بۆ مانگی هەر وڵاتێك دیاری بكات بۆ ئەوەی قۆرخ نەكرێ بەسەر كەسدا لەگەڵ دانانی



پێوەرگەلی هونەری كە بوار نادات بە ژاوەژاو یان تێكەڵبوون و دەبێ دووری نێوان هەر مانگێك بۆ ئەوەی تەنیشتی پێنج پلە بێ.

**دەتوانرێ مانگە دەستكردەكان بەكاربهێنرێن بۆ گواستنەوەی بەرنامەكان بە یەكێ لەم دوو رێگەیە:**

١/ پشتبەستن بە گواستنەوەی پرۆگرام لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكیتر وەك ئەوەی (نێرەر) لە شوێنێك بێ و (وەرگر) لە شوێنێكیتر، نموونە لەمبارەیەوە راپۆرتە هەواڵەكان لە وڵاتێكی ئەوروپییەوە، رەوانە دەكرێ لە رێگەی پەیوەستێك كە بەرەو ژوور دەڕوات بۆ مانگە دەستكردەكە و پاشان لە مانگەكەوە دەگەڕێتەوە بۆ شارێكی وەك نیویۆرك. كە دەكرێ راپۆرتەكە راستەوخۆ بڵاو بكرێتەوە یان تۆمار بكرێ لەسەر شریتی ڤیدیۆ و پاشان بڵاو بكرێتەوە.

٢/ پشتبەستن بە مانگە دەستكردەكان و بەكارهێنانیان بۆ خزمەتگوزاری تەلەفزیۆنی و پێی دەوترێ پەخشكردن بە مانگە دەستكردەكان، لەم شێوازەدا پرۆگرامەكان دەگوازرێنەوە بۆ مانگە دەستكردەكە و لەوێوە بۆ ناوچەیەكی جوگرافی فراوان بە شێوەیەك كە راستەوخۆ لەلایەن چەندین دەزگای تەلەفزیۆنییەوە وەردەگیرێ، دەكرێ ئەمجۆرە پەخشە پێشوازی بكرێ لە رێگەی چەندین وێستگەی تەلەفزیۆنی ترەوە و هەمان پرۆگرام لە چەند ناوچە و شارێك پیشان بدرێ، یان بە هۆی تۆڕی كێبڵی تەلەفزیۆنی كە ئاماژەكان ئەگێڕێتەوە بۆ ئەو تەلەفزیۆنانەی لە ناوچەی بچووكدا پێشوازی دەكەن، یان بۆ ئەو كەسانەی ئەنتێنی وەرگرتنی راستەوخۆی نێردراوەكانیان هەیە لە مانگە دەستكردەكە بۆ ماڵەكانیان.

ئێستا مانگە دەستكردەكان خۆیان بەسەر ژیانماندا سەپاندووە، چونكە تەواوی بۆشایی بە مانگی دەستكرد تەنراوە و تیایدا دەسوڕێنەوە، كە تەواوی بوارەكان دەگرێتەوە، چ بۆ ئاشتی یان بۆ شەڕ بەكارهێنانی مانگە دەستكردەكان هەموو ناوچەكانی جیهان لە یەك چركەدا بەیەكەوە دەبەستنەوەو، دەتوانن زانیاری لە دوورترین ناوچەی سەرووی گۆی زەوی بگەیەننە دوورترین ناوچەی خوارووی زەوی.

## گەیاندنی دیجیتاڵی:

لە ساڵانی شەست و هەفتاكانی سەدەی رابردوو سەرلەنوێ تیۆری میدیای سەرتاپا دارێژرا، كۆمەڵناسی كەنەدی (مارشاڵ ماكلوهان) دەڵێ: "ئەم جیهانەی ئێمە وەكو گوندێكی گلۆباڵی

لێهاتووە". ئەو، پێش ئەوەی تەلەفزیۆن ببێتە ئەندامێکیتری ناو هەموو خێزانێك، باسی لە تۆڕێکی ئەلیکترۆنی گلۆبالی بۆ دەکردین، کە پێشبینی ئینتەرنێتی تێدا بەدی دەکرا. میدیا ئەو کایەیە کە کۆی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانمان دەگۆڕێ و چەشنێکی تازەش لە پرۆسەی بەکۆمەڵگەبوون دێنێتە ئاراوە. (ماکلوهان) رای وایە لەو کاتەی (گوتەنبێرگ) چاپی کتێبی داهێنا، دەتوانین باس لە سەرەتای هەڵوەشاندنەوەی سیستمی خێڵ بکەین و قۆناغێکی دی دێتە کایەوە کە قۆناغی دروستبوونی تاکە. پەیوەندی زارەکی، ئەو کوولتورەیە کە هەمیشە گرووپمان بۆ بەرهەم دێنێ، بەڵام کوولتوری چاپ و کتێب ئەو میدیا تازەیەیە کە تاکەکانی گرووپ لێك دادەبڕێ و تاکایەتی دەبێتە بەرهەمەکەی، سەردەمی ئێستامان ئەو سەردەمەیە کە هەموو مرۆڤەکان لە ناو بونیاتێکی تۆڕئاسای ئەلیکترۆنیدا دەژین.

ئەم جیهانە نەك گۆڕان لە کۆی پەیوەندییە مرۆییەکانمان دروستدەکات، بەڵکو چەشنێکی نوێ لە کوولتور بەرهەم دێنێ و فۆرمێکی نوێ لە دەستەی کۆمەڵایەتی دێنێتە کایەوە. یەکێك لە خەسڵەتەکانی ئەم دەرکەوتە نوێیە، ئاڵوگۆڕی زانیارییەکان لە شێوەیەکی تۆڕئاسادا خۆی بەرجەستە دەکات. ئەم میدیا ئەلیکترۆنییە نوێیە وامان لێدەکات کە دونیا لە گۆشەنیگایەکی ترەوە ببینین بەرپرسیارێتییەکانمان گەورتر و ترسناکییەکانیش مەزنتر و خەونەکانیش فراوانتر بێ. میدیا گەورەبوونی جەستەی زانیاری مرۆڤە، تێگەیشتن و بیرکردنەوەی مرۆڤ بە چەشنێکی ترسناك لە ژێر کاریگەری میدیادایە و ئاراستەکانی بەجۆرێك لە جۆرەکان دیاری دەکات. پەیامی ئەم میدیایە بریتییە لەوەی چیدی ئێمە لە سێبەری خێرایی و ناوەڕۆك و مۆدێلەکانی ئەودا دەژین، ترسناکییەکە لەوەدایە کە بەشێکی گەورەی میکانیزمی کاریگەرییەکانی میدیا بە چەشنێکی نائاگایانە شوێنپێکانی خۆی لە هۆش و نەستماندا بەجێدێڵێ.

(ماکلوهان) جیاوازییەك لە نێوان رادیۆ و فیلم لەلایەك و تەلەفۆن و تەلەفزیۆن لەلایەکی دیکەوە دادەنێ، ئەو وای دەبینێ کە رادیۆ و فیلم دەچنە خانەی (میدیای گەرم)ەوە و چونکە ئەم دوو میدیایە لەگەڵ یەك هەستی دیاریکراودا دەدوێن، یان یەك هەست دەدوێنن، بە پێچەوانەشەوە تەلەفۆن و تەلەفزیۆن دەچنە خانەی (میدیای سارد)ەوە، چونکە چەند هەستێکمان دەجووڵێنن و وامان لێدەکەن کە پێیانوایە بەند بین. بەمانایەکیتر ئەو پێمان دەڵێ هەموو تەکنۆلۆژیایەك، ئۆرگانێك لە ئۆرگانەکانمان بەهێز و گەورە دەکات، یان توانایەکی دیاریکراومان بەرفراوان دەکات. ئەم حاڵەتەش دەرەنجامێکی لۆژیکی لەگەڵ خۆیدا بەرهەمدێنێ، ئەویش لاوازبوونی بەشەکانی تری ئۆرگانە مرۆییەکانە، لە کاتێکدا کە



بەشێکیان بەهێز دەبن، ئەوانیدی بەرەو لاوازی دەڕۆن. بە رای ئەو ئەزموونە مرۆییەکانمان بەرەو ئەوە دەڕوات کە بگوازرێتەوە ناو میدیای ئەلیکترۆنی، ئینتەرنێت بۆیە دەچێتە خانەی میدیای ساردەوە، چونکە جیهانێکی نافیزیکی و (ڤیرتوئێل)مان بۆ بەرهەمدێنێ، واتە گواستنەوەی هەموو ئەو ئەزموونانە بۆ ناو میدیای سارد. ئینتەرنێت چیدی ئەو نیشتمانە بێ شوێنەیە، کە هەموو کەسێك دەتوانێ ببێتە هاونیشتمان و نیشتەجێبووی، تاکە پاسپۆرتێك مرۆڤ لەم جیهانە پێویستی پێیەتی بریتییە لە پاسوۆرد، بەپێچەوانەی جیهانی کۆمەڵگەی هەقیقی، ئێمە دەتوانین لەم جیهانە ڤێرتوئێلییەدا زیاد لە کەسایەتی و ناونیشان و ناوێکمان هەبێ، لەگەڵ کەسانێکدا هەستەکانمان بگۆڕینەوە کە نایانناسین و نەمانبینیون. گواستنەوەی ئەزموونە مرۆییەکانمان و خواست و ویستەکانمان بۆ ناو دونیای ئەلیکترۆنی، مانای فرە ناسنامەی کەس و فرە کەسێتی دروستکردنە بۆ تاك، ئەمەش مانای ونبوون یان شاردنەوەی مانا واقیعییەکان دەگەیەنێ. دونیای ئۆرگانیزەکراوی ناو ئینتەرنێت، کۆمەڵگەیەکی بە تاك بووە و حەسرەتی تایبەتیشی بۆ بە کۆمەڵبوون هەیە، واتە ئینتەرنێت تەنها گەیاندن و ناردنی پەیام نییە، بەڵکو لە هەمانکاتدا دروستکردنی هەستێکی ئۆرگانییە کە ئێمە لەرێگایەوە دەبین بە کۆمەڵێکی ڤیرتوئێلی، ناسنامە و هەستی تایبەتیشمان بۆ دروستدەبێ بەرابەر بەو کۆمەڵە.

(ماکلوهان) یەکەم کەس بوو کە بە گوندبوونی دیجیتاڵیانەی جیهانی پێناساندین، دەتوانین لەم چەند خاڵەدا تێزە سەرەکییەکانی چڕ بکەینەوە:

١- ئەلیکترۆن هیچ سنوورێکی سیاسی یان جوگرافی ناناسێ، واتە بڕبڕەی سنووری کیشوەرو دەوڵەتە ناسیونالەکانە.

٢- مرۆڤەکان لەسەر ئەم بناغەیەوە لە یەکتر نزیك دەبنەوە، دانیشتوانی جیهانیش دەبێ بە گوندێکی گلۆباڵ.

٣- ئەم جیهانە، جیهانێکی هاوکاتی و هاوساتییە، لێرەوە پەیوەندی نێوان کات و شوێن گۆڕانی گەوهەری بەسەردا دێ، بەم چەشنە چیدی لەجیهانێکدا ناژین کە کات کۆتی شوێن بێ، واتە ئەم شوێنە ئەلیکترۆنییە لە رووی ئابووری و ئێوکۆلۆژی و پەیوەندییەوە کاریگەری تایبەتی بۆ سەر سیستمی پێکەوەژیانی مرۆڤەکان دەبێ. بە هۆی ئینتەرنێتەوە کۆمەڵگەیەکی ئەلیکترۆنی دروستدەبێ تیایدا زانیارییەکان هەمیشە لە گەورەبوون و خێرابوونێکی بەردەوام و کەناڵەکان لە زۆربوون و دەزگاکانیش لە گەورەبووندان.

لە ژیانی ئەمرۆی خەڵکدا پەیوەندییەکان بۆتە هۆکارێکی گرنگ بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکان و کارئاسانی چونکە بۆتە بەشێك لە شتەکانی دەوروبەرمان و تاڕادەیەك وایلێهاتووە ژیان بەبێ پەیوەندییەکان گرانە. پەیوەندییەکان بریتییە لە گواستنەوەی زانیاری و داتا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك یان چەند شوێنێکیتر. یەکەمجار وەك شتێکی ڕۆتینی کە گەیاندن دۆزرایەوە وەك خەونێك وابوو لەلای خەڵك و مرۆڤ نەیدەتوانی لە بیرۆکەی ئەم تەکنۆلۆژیایە تێبگات، تاکو لە شتێکی نامۆوە بووە پێویستییەکی ژیان، لەبەر ئەوەی گەیاندن بەشێکە لە تەکنۆلۆژیا، تەکنۆلۆژیاش ڕۆژ بە ڕۆژ لە پێشکەوتن و فراوانبووندایە، بۆیە سەرەتای گەیاندن لە سەرەتایەکی زۆر سادە و ئەنەلۆگەوە وردە وردە بەپێی کات بووە دیجیتاڵ.

لە دیارترین قۆناغەکانی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا لە جیهانی گەیاندندا بریتییە لە دەرکەوتنی تەکنۆلۆژیای گەیاندنی دیجیتاڵی لە ساڵانی هەشتاکاندا، کە پشت بە گواستنەوەی ماددەکان دەبەستێ بۆ گەیاندن بە بەکارهێنانی شێوازی دیجیتاڵی دەبێ، ئەم شێوازەش بنەماکەی لە بەکارهێنانی ئاماژە تەلیگرافەکان سەرچاوە دەگرێ بە شێوەی کوژانەوە و داگیرسان (on-of)، لە حاڵەتی ئاماژە تەلیگرافەکان، زانیارییەکان لە شێوەی لێدانی کارەبایی کورت یان درێژ دادەنرێ، پاشان لێدانەکان بەتەواوی دیار نامێنن و وزەی کارەبایی بەکارهاتووش بە شێوە یان دەنگ یاخود ئاواز خۆی دەنوێنێ. واتە دیجیتاڵیزە بریتییە لە گۆڕینی دەنگ، یان وێنە بۆ ژمارەی ئەلیکترۆنی و داکردنیان لە ئامێری موگناتیزەکراو، پاشان دووبارە بەرهەمهێنانەوەیان لە فۆرمی ڕەسەنی خۆیان.

گەیاندنی دیجیتاڵی لە ساتێکەوە بۆ ساتێکیتر دەگۆڕێ، لە برگەگەلێك مانایەکی هەیە هاوشێوەی پرۆسەی گەیاندنی ژمارەییە، کە برگەکانی گەیاندن ئاماژەن بۆ پیتی زمانەوانی پاشان بۆ ژمارەکان، سفر و یەك، داتاکانیش لە شێوەی لێدانە کارەباییەکان دەردەکەون و لە هەر جوتێك لە ژمارەکان (Bit) مانای پیت یان هێما یاخود کۆدی لێدەنرێ و بە کۆمەڵێك لە هێماکان دەوترێ (Byte)، کە زۆرجار هەر بایتێك هەشت هێما لە خۆدەگرێ و هەر زانیارییەك کە دەخوازێ بە دیجیتاڵی نیشانبدرێ لە شێوەی کۆد دادەنرێ کە ئاماژەیە بۆ بەکارهێنانی لیستێك لە پیت و هێماو ژمارەکان. بەڵام سیستەمەکەی تر بریتییە لە هاوتایی (ئەنەلۆگ) کە پشت بە گۆڕانی باهۆزی کارەبایی دەبەستێ لە ڕێچکەی نێوان قسەکەر و بیسەر بە شێوەیەك لەگەڵ دەنگی قسەکەر بگونجێ، کە دەنگەکەی هاوشێوەی دەنگی قسەکەرە، بەهەمان شێوە بۆ گەیاندنە ڕادیۆیی و تەلەفزیۆنییەکان. تەنها جیاوازیش لە نێوان پەیوەندیی دیجیتاڵ و



پەیوەندیی ئەنەلۆگدا ئەوەیە کە بڕی (Signal) بەپێی کات لەوەی دووەمیان دەگۆڕێ بۆ ئەوەی یەکەم، بەڵام پەیوەندی دیجیتاڵی بڕەکەی نەگۆڕە. بەکورتییەکەی لەسەر بنچینەی (سفر و یەك) کار دەکات، مەبەستمان ئەوەیە کە سیگناڵ نییە یاخود کە هەیە بە شێوەیەکی باشە و دەتوانین سوودی لێ ببینین و داتاکانمان وەکو خۆی دەستبکەوێتەوە، بەڵام لە ئەنەلۆگدا هەندێجار سیگناڵ هەیە، بەڵام ڕەنگە داتاکەمان وەکو خۆی دەست نەکەوێتەوە، بە هۆی گۆڕانی بڕی سیگناڵەوە، سیگناڵیش لە پەیوەندییەکاندا هەڵگری زانیارییەکانە و بە هۆی سیگناڵەوە زانیاری دەگوێزرێتەوە، ئەم سیگناڵە دەتوانین بە هاوکێشەیەکی بیرکاریانەی کارەبایی بینوێنین. دیجیتاڵ هەر درێژەپێدەری ئەنەلۆگە، بنچینەی کارکردنیشیان هەر یەك شێوەیە، بەڵام ڕێگەی ناردن و وەرگرتنی سیگناڵ تێیدا جیاوازە، بەڵام دیزاینی سووری ئەم وەرگرو نێرەرانە زۆر جیاوازە، ئێستاش بەکارهێنەرانی گەیاندنی دیجیتاڵی زۆر زیادی کردووە، ئەوەش بە هۆی باشی گەیاندن و کوالیتی گەیاندنەکە. گەیاندنی دیجیتاڵی بە بەراورد لەگەڵ گەیاندنی ئەنەلۆگ خەسڵەتی زیاتری هەیە، کە لە گواستنەوەی داتاکانی کۆمپیوتەریی و دەنگ لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە بەکاردێ، هەروەها لە ناردنی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و تۆمارکەرە بەرزە موزیکییەکان بە وردییەکی زۆرەوە.

تۆڕی ئینتەرنێتیش یەکێکە لە بەکارهێنەرە هەرە گرنگەکانی گەیاندنی دیجیتاڵی، ڕەنگە بە گرنگترین بەشی پەیوەندییەکان دابنرێ، چونکە بۆتە سەرچاوەیەکی سەرەکی بۆ پێشخستنی زانست و بوارەکانی تری ژیانیشی لەبیر نەکردووە، بە هۆی ئینتەرنێتەوە دەتوانین وەك تەلەفۆن و وەرگری تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و پۆستی ئەلیکترۆنی و کاری گشت جۆرەکانی تری پەیوەندییەکانی پێبکەین. هەروەك گەیاندنی ئەنەلۆگ، دوو جۆر سیستمی گەیاندنی دیجیتاڵمان هەیە ئەوانیش: (Wire System) واتە وایەر ناوەندی گوێزەرەوە بێت، هەروەها وایەرلێس (Wireless System) کە هەوا دەبێتە ناوەندی گوێزەرەوە، لەبەر ئاسانی و توانینی بەکارهێنانی لە زۆر شوێندا، ئێستا ئەم جۆرە نوێیە بڵاوترە و زۆربەی سیستەمەکانی گەیاندن پشتی پێ دەبەستن.

**لە گرنگترین خەسڵەتەکانی گەیاندنی دیجیتاڵی:**

١- لە شێوەی تۆڕی دیجیتاڵی دەبێ لە سەرەتای ناردنەوە تا سەرچاوەی وەرگرتنی، قۆناغەکانی ناردن و کەناڵ و وەرگرتن، پرۆسەیەکی تەواو دەبێ و دەکرێ کۆنترۆڵی ڕەگەزەکانی سیستەمەکە بکرێ و لە بازنەیەکی دیجیتاڵی یەکگرتوودا کۆنترۆڵ بکرێ، بەمەش تێکەڵکردن (Noise) دروست نابێ.

٢- سیستمێکی چالاك و بەهێزە وادەکات گەیاندنەکە پارێزراو بێ وەك یەکەیەکی تەواوی بەها بەرز، هەروەها لە گواستنەوەی زانیارییەکان بۆ مەودا دوورەکان لە ڕێگەی بەکارهێنانی پەتەکانی ریشاڵە رووناکییەکان دەبێ کە پارێزگاری لە بەهێزی گەیاندن لە سەرەتاوە تا کۆتایی دەکات.

٣- برێکی زۆر لە زیرەکی تێدایە، بەجۆرێك دەکرێ سیستمی دیجیتاڵی وا دروستبکرێ بۆ ئەوەی چاودێری گۆڕانکاری رەوشەکانی کەناڵەکە بە شێوەیەکی بەردەوام بکات و رێڕەوەکەی راستبکاتەوە.

٤- نەرم و نیانە، کە هەمیشە سیستمە ژمارەییەکان دەچنە ژێر باری کۆنترۆڵ کرانەوە لەلایەن پرۆگرامی (Software)ی کۆمپیوتەر، کە بوار دەدات بە وەدیهاتنی برێکی بەرز لە بەهای بەکارهێنان.

٥- گشتگیری پێوە دیارە کە سیستمی دیجیتاڵی بوار دەدات بە گواستنەوەی داتاکان لە شێوەی دەق و وێنە و نیگار بەرادەیەکی بەرز لە وردێتی و هەموو شێوەکانی گەیاندنی پێشوو لەمیانەی بەکارهێنانی ئاماژە ژمارەییەکان دەبێ لە وتووێژ یان دەنگە ئاوێتەکان لە یەك کاتدا.

٦- رادەیەکی بەرز لە دڵنیایی گەیاندن وەدی دێنێ.

## تەکنۆلۆژیای گەیاندن لە مامەڵەکردن لەگەڵ هەواڵدا:

لەگەڵ فرەیی کەناڵەکانی گەیاندن کە پەیوەست بوو بە ئاڵۆزی پێویستییەکانی پەیوەندیکردنی تاك، شێوازەکانی کۆکردنەوەی هەواڵ پێشکەوت و چەمکی هەواڵی نێودەوڵەتی گۆڕا کە پەیوەست بوو بە بوونی خودی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی، کە ئێستا ئاراستەیەك پەیدا بووە بەوەی هەواڵەکانی بخاتە چوارچێوەی چالاکییە هەواڵییە نێودەوڵەتییەکان بە شێوەیەکی بەرچاو، هەروەها پشتبەستنی ئاڵوگۆڕ لە نێوان وڵاتان ئەمەش پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی ئێستای جیا کردۆتەوە و یارمەتیدەر بوو بۆ خولقاندنی چەمکێکی نوێی هەواڵی نێودەوڵەتی و کە بەپێی تەکنیکە جیاوازەکان ئامرازەکانی گەیاندن دەگۆڕێ.

لەگەڵ پێشکەوتنی بەرچاو لە تەکنۆلۆژیای گەیاندن و مانگە دەستکردەکان، گرنگی داپۆشینەکانی میدیای نێودەوڵەتی زیادیکرد و وەکو پیشەسازییەکی گەورەی فرەلایەنی لێهات، کە توخمەکانی تێك ئاڵاون و کێشەکان دەورووژێنێ و تەنیا تیشك دەخاتە سەر پرسە



ناکۆکان بەپێی ئیعتیبارە تایبەتییەکان، کە ئاڵۆزتر و لە هەمانکاتدا ویستراوتر بوو لەلایەن جەماوەرەوە، ئەوەی خاوەن تەکنۆلۆژیای پێشکەوتوو بێ لە بواری پەیوەندییەکان، خاوەنی ئامرازی کۆنترۆڵکردنی کوولتوری و فیکری دەبێ، هەواڵەکان لە چالاکییەکی گەرمی هەواڵیدا دەگونجێنرێ بەجۆرێك خزمەت بە ئارەزوو و سیاسەتەکانی هێزە کۆنترۆڵکەرەکان بکات. چارەسەری هەواڵی تەلەفزیۆنی بۆ رووداوە جیاوازەکان پێگەیەکی گرنگی گرتووە لە نێو رووخسارەکانی داپۆشینی میدیای نێودەوڵەتی، کە خۆی لە بەرەنگاربوونەوە و کاریگەری زۆر ئاڵۆز دەبینێتەوە، گرنگترینیان کەموکوڕی لە ئاڵوگۆڕی هەواڵی و ناکۆکی ناوەڕۆکی هەواڵ و زیادبوونی کەلێن لە بواری سەرچاوەکان و شتیتر کە وەدیهێنانی ئامانجەکانی پەیوەندیکردنی نێودەوڵەتی پەك دەخات.

لە سایەی شۆڕشی گەیاندندا تەلەفزیۆن وەك ئامرازێکی هەواڵی سەرکەوتوو دەبێ کە لە ئاکامی تەکنیکەکانی وێنەی بەکارهاتوو توانای چارەسەرکردنی بابەتەکانی لە دوورەوە رەخساند، ئەوەی لە دوای دێ لە شیکردنەوەی رووداو کە یارمەتی زیادبوونی درککردنی جەماوەری سیاسی و پێکهێنانی ئەجێندە سیاسییەکەی دەدات، لەگەڵ فراوانبوونی چوارچێوەی داپۆشینی جوگرافی بۆ ناردنی تەلەفزیۆنی و فرەیی کەناڵە تەلەفزیۆنییە نێودەوڵەتییەکان و پێشکەوتنی بەکارهێنانی پەیوەندیکردنە ئاسمانییەکان، هۆشیاری بۆ گرنگی ئەرکی هەواڵی بۆ تەلەفزیۆن زیادی کرد بەتایبەتی لە کاتی تەنگژە و رووداوە لە ناکاوەکان. دیاردەی جیهانگیریی گەیاندن بە پێشکەوتنی تەکنەلۆژی لە ئامرازەکانی گەیاندن بە شێوەیەکی گشتی و لە بواری هەواڵ بە شێوەیەکی تایبەتی پەیوەستکرا، بەجۆرێك جیهان بە گشتی لە نێو خۆیدا کراوە بوو.

**لە رووخسارەکانی پێشکەوتنی تەکنەلۆژی لە بواری هەواڵدا بریتییە لە:**

١- پەیدابوونی (Mini Cam.)، کە کامێرایەکە ئامێرێکی ناردن بە مایکرۆییفی لەگەڵدایە، توانای وێنەگرتن و ناردنی راستەوخۆی هەیە سەرەڕای ئەنجامدانی مۆنتاژی دەستبەجێ و بەکارهێنانی فیلم و کاریگەرییە بینراوەکان لە کاتی وێنەگرتندا، کە تەکنۆلۆژیایەکی زۆر تێچووە.

٢- دەرکەوتنی ئۆتۆمبێلی ئامادەکراوی تایبەت بۆ گەیاندن بە مانگە دەستکردەکان، بەجۆرێك دەکرێ رووداوەکان لە شوێنێکەوە و لە هەر کارێکدا بە هۆی تەکنۆلۆژیای ( UP Link)ەوە بە شێوەیەکی راستەوخۆ لەمیانەی مانگە دەستکردەکانەوە بگوازێتەوە کە پێی

دەوترێ یەکەکانی (S.N.G.V). سەرەتای بەکارهێنانی ئەم تەکنیکە لە تۆڕی (C.N.N)ەوە بوو، لە کاتی شەڕی کەنداوی دووەم لە سەرەتای ساڵانی نەوەدەکاندا.

٣- بەکارهێنانی کۆمپیوتەر لە بواری هەواڵیی، جا لە ئامادەکرنی ماددە هەواڵییەکە و نووسینی بێ یان مۆنتاژکردنی بە شێوەیەکی راستەوخۆ، تەنانەت راگەیاندنی ئەم رووداوانە بە شێوەیەکی راستەوخۆ، کە ئێستا سیستمێکی پەیڕەو کراوە لە زۆر لە تەلەفزیۆنە جیهانییەکان.

لە ئەمەریکا (تلیمەر) دەربڕینی ژووری هەواڵەکانی بێ دیوار و دەربڕینی ژووری خەیاڵی بۆ هەواڵەکان (Virtual Newsroom)ی داهێنا، بۆ دەربڕینی مەودای کاریگەری تەکنۆلۆژیای گەیاندنی نوێ لەسەر کاری هەواڵی و هەڵوەشانەوەی چەمکی شوێنی جوگرافی بە بەکارهێنانی تەکنیکی نوێ لە ئەنجامدان و پەخشی ئەو راپۆرتانە، گەیشتە ئاکامێك بەوەی ئەو پەیامنێرانەی لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم تەکنۆلۆژیایە نشوستیان هێنا، بێتوانا بوون لە دەسکەوتنی زانیارییەکان، تەنانەت پەیوەندیکردن بە رۆژنامەکان و دواتر نشوستییان وەك رۆژنامەنووس، ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ پێویستی ئەوەی هەڵسوڕێنەر بە پەیوەندیکردن لە کاری هەواڵنێریدا دەبێ فرە توانا بێ و توانای مامەڵەکردن لەگەڵ تەکنیکە نوێیەکانی بۆ بڕەخسێ، هەروەها تێگەیشتنی لە بینراوەکانی سیاسەتی گەیاندن کە لە رێگەیەوە کار دەکات و هەوڵدەدات بۆ جێبەجێکردنی داواکارییەکانی.

٤- تۆڕی ئینتەرنێتی جیهانی وەك سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکانی زانیاری هەواڵییە، کە هەزاران لە تۆڕەکانی کۆمپیوتەر لە سەرانسەری جیهان بەربڵاوە، لەم کەشوهەوایەشدا کامێرای وێنەگرتنی تایبەت بە کۆمپیوتەر (Disk Camera) پەیدا بوون، کە کامێرا فۆتۆگرافییە و دیسکی لێزەری لەگەڵدایە لە جیاتی فیلمی لەگەڵدابێ بۆ بەکارهێنانی لە بەرهەمهێنانی هەواڵی، کە دەتوانێ نزیکەی ٥٤ هەزار وێنە لەسەر سێدییەك بگرێ و لە ماوەی دوو خولەکدا بیخاتە سەر کۆمپیوتەر و یەکسەر بەکاری بێنێ. ئەمە سەرەڕای زۆر لەو تەکنیکە نوێیانەی کە لە کاری هەواڵی تەلەفزیۆنی بەکاردێ لەو روانگەیەی کە وێنە لە هەواڵدا واتای زۆر دەبەخشێ، کە خۆی لە خۆی دەدوێ سروشتی پەخشی راستەوخۆی قۆستۆتەوە کە دەستبەجێی رەهاو راستگۆییە بەرز دەبەخشێتە رووداوەکان.



## تەکنۆلۆژیای گەیاندن و شۆڕشی زانیاری:

ساڵانی کەمی رابردوو بازدانێکی گەورە لە بواری زانیارییەکان هاتە ئارا، کە جۆرێك لە تێکەڵاوبوون لە نێوان هەردوو دیاردەی تەقینەوەی زانیاری و شۆڕشی گەیاندندا روویدا، کە بە چارەسەری زانیاری لە دوورەوە چاودێری کرا بە بەکارهێنانی مانگە دەستکردەکان و کۆمپیوتەرەوە. زاراوەی تەقینەوەی زانیاری پەیدابوو بۆ ئەوەی ئاماژە بەو بازدانە گەورەیە بکات لە بواری زانیارییەکاندا، کە هەموو بوارەکانی چالاکی مرۆیی دەگرێتەوە بەجۆرێك بەرهەمهێنانی زانیاری گۆڕاوە بۆ پیشەسازییەکی فراوان، لە گرنگترین ئاکامەکانی ونبوونی مۆرکی نێودەوڵەتییە لەسەر زۆربەی ئامرازەکانی گەیاندنی جەماوەری، بۆیە تێگەیشتنی تەواو بۆ رەهەندەکانی پێشکەوتنی گەشەکردوو لە ئامرازەکانی گەیاندنی نێودەوڵەتی، ناکرێ درك بە ناوەڕۆکە راستەقینەکەی بکرێ بەبێ هەوڵی وەرگرتنی ئەو بازدانە گەورەیەی کە لە بەرهەمهێنانی زانیارییەکان و شۆڕشی تەکنۆلۆژیادا روویدا.

لەگەڵ سەرهەڵدانی رێگەی زانیاری زۆر خێرا، سەرەتا لە تۆڕی تەلەفۆناتی مەودا دوورەوە دەستیپێکرد تا گەیشتە ئینتەرنێت، ئەمەش کاریگەری گەورەی بەجێهێشت لە سەرجەم لایەنەکانی ژیان بەتایبەتی لەسەر جێبەجێکردنەکانی ئەو تەکنۆلۆژیایە لە بواری فێربوون و گەیاندن، ئەم رێگە تازەیە (شۆڕشی ناوەڕۆك)ی خولقاند کە هەڵگرتنی زانیاری لەخۆ دەگرێ لە شێوەی دیجیتاڵی و ناردنی لە رێگەی زانیاری خێراوە کە وەرگرتنێکی زیاتر بۆ ناوەڕۆکەکەی وەدی دێنێ. ئێستا جیهان دیاردەیەك بەخۆوە دەبینێ کە دەکرێ ناوی لێ بنێین (تەقینەوەی زانیاری)، وەك ئاماژەیەك بەو پێشکەوتنە بەرچاوەی لە بەرهەمهێنانی زانیارییەکان هاتۆتە ئاراوە لە سەرجەم بوارەکانی ژیانی مرۆیی و زانیاری بۆتە کاڵاو پیشەسازییەك بە پلە یەك کە (بازاڕی زانیاری جیهانی) لێ بەجێماوە وەك (بیل گێتس)ی ئیمپراتۆری کۆمپیوتەر لە جیهاندا ناوزەدی کردووە، کە خزمەتگوزاری و کاڵاکان لەگەڵ بیرۆکە مرۆییەکان لە یەك کاتدا ئاڵوگۆڕ دەکرێن.

ئەم دیاردەیەش پەیوەست بوو بە زاراوەی تەکنۆلۆژیای گەیاندن، کە ئاماژە دەکات بە سەرجەم زانین و شارەزاییە کەڵەکە و دەستبەربووەکان و ئامراز و ئامێرە ماددی و رێکخستنی و کارگێڕییە بەکارهاتووەکان لە کۆکردنەوەی زانیارییەکان و چارەسەرکردنی وەبەرهێنانی و هەڵگرتنی و گەڕانەوەی و بڵاوکردنەوەی و ئاڵوگۆڕکردنی، واتە گەیاندنی بە تاك و کۆمەڵگەکان. لایەنێکی گرنگ و ژیاری و کاریگەر پێکدێنێ لە پێکهاتەکانی سیستمی

گەیاندنی نیشتمانی و ڕەهەندی تەکنەلۆژی کاریگەر دەبێ لەسەر سەرجەم ڕەهەندە سیاسی پەیوەندییەکانیتر، هەروەها ئەمە کار دەکاتە سەر سیاسەتی کوولتوری نیشتیمانی و لایەنێکی گرنگی لێ پێکدێنێ.

شۆڕشی زانیارییەکان پەیوەست بوو بە شۆڕشێکی تەکنۆلۆژیای گەیاندن، چونکە زیادبوونی زانیارییەکان دەبێتە هۆی زیادبوونی پەرەسەندنی تێکنەلۆژی و پەرەسەندنی ئەمەی دواییەیان پاڵ بە زانیاری زیاترەوە دەنێ بەمەش تواناکانی تاك لە کارلێککردن لەگەڵ خەڵکیتر و کاریگەری کردنە سەریان زیاد دەبێ، کە ئاماژەیەکە بۆ پێشکەوتنی تاك و کۆمەڵگەکان، بە پلە یەك کۆمەڵگە پێشکەوتووەکان بە کۆمەڵگە زانیارییەکان دەناسرێ، وەك جێگرەوەیەکی کۆمەڵگە پیشەسازی یان کشتوکاڵییەکان...تد. ئەم شۆڕشە دوو سەرەیە، کە دەکرێ ناوی لێ بنێین (تێکنۆ — زانیاری)، کە لە ئاکامی تێکەڵکردنی تەکنۆلۆژیای نوێی گەیاندن و تەکنۆلۆژیای ژمێریارە ئەلیکترۆنییەکان پەیدا بووە، یان لە ئاکامی تێکەڵکردنی زیاتر لە ئامرازێکی گەیاندن لەگەڵ تەکنیکی زانیارییەکان، کە بە تەکنۆلۆژیای گەیاندنی کارلێکیی و گەیاندنی فرە نێوەند (Multi Media) دەناسرێ.

دیارەی گەشەی بەردەوام لە بەرهەمهێنانی لێشاوی زانیارییەکان خۆی بەسەر گۆڕەپانی نێودەوڵەتی سەپاندووە کە کاریگەرییەکی زۆری لەسەر سیستمەکانی گەیاندنی نێودەوڵەتی هاوچەرخ بەجێهێشتووە. ئەمە لە کاتێکدا تەقینەوەی زانیارییەکان و شۆڕشی گەیاندن بە شێوەیەکی گشتی مۆرکێکی نێودەوڵەتییان بەخشییە سەرجەم ئامرازەکانی گەیاندنی جەماوەری، بەجۆرێك ئەستەمە جیاوازی ورد لە نێوان میدیای نیشتیمانی و میدیای نێودەوڵەتی بکرێ، بەڵام ئەم پەرەسەندنە زانیارییە بەرفراوانە کە هاوتەریبی گەشەی تێکنەلۆژییە بۆتە هۆی زیادبوونی کەلێنی گەیاندن لە نێوان وڵاتانی پێشکەوتوو لەلایەك و وڵاتانی تازە گەشەسەندوو لەلایەکیترەوە.

هەموو ئەم پرسانە لەسەر سیستمی گەیاندنی نێودەوڵەتی ڕەنگیدایەوە، کە ریشەی لە چەمك و تەکتیکاتی پڕوپاگەندە لە ماوەی هەردوو جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم سەرچاوەی گرت. تا ئەم ساتەش وێڕای چەندین هەوڵ، کێشەکانی گەیاندنی نێودەوڵەتی کە ناودەبرێ بە سیستمی میدیای نێودەوڵەتی نوێ تاوتوێ دەکرێ، کە ڕێکخراوی یونسکۆ لە ناوەڕاستی هەفتاکاندا گرتییە خۆ، چەندین چەمکی تری تێکەڵ بوو، لەوانە هەڵقولانی نێودەوڵەتی بۆ هەواڵەکان، هەڵقولانی ناهاوسەنگی زانیارییەکان، کەلێنی گەیاندنی نێوان باکوور و باشوور، تا



ئەوکاتەی کێشەکە لە نێوان هەردوو جەمسەری ڕۆژهەڵات بە سەرکردایەتی یەکێتی سۆڤیەت و ڕۆژئاوا بە سەرکردایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان دروستبوو، بەڵام ڕەوشی ئێستا ئاماژە بە گەشەی دیاردەیەکی نوێ دەکات لە چوارچێوەی پەیوەندی نێودەوڵەتی کە دیاردەی تاکجەمسەری و یەك سیستمی میدیایی نێودەوڵەتییە.

دیاردەی تەقینەوەی زانیاری و شۆڕشی گەیاندن پێشوازییەکی گەورەی لێکرا لەلایەن نەتەوە جیاوازەکان لە سەرەتادا، بە پشتبەستن بە گریمانەی هاوسەنگی نێوان کۆنترۆڵی قۆرخکردنەکان لەسەر دەزگا میدیاییە نێودەوڵەتییە گەورەکان و لە نێوان ئازادی ئاڵوگۆڕی هەواڵ و زانیارییەکان و هێزی هەواڵ و زانیارییەکان لە بڵاوبوونەوە لە هەژموونی قۆرخکردنە خاوەندارییەکان بۆ ئامرازەکانی گەیاندنی نێودەوڵەتی کەم دەکاتەوە. شوێنەوارەکانی پەرەسەندنی تەکنەلۆژی زیادبوونی کەلێنی نێوان وڵاتانی پیشەسازی پێشکەوتوو لەلایەك و وڵاتانی تازە گەشەسەندوو لەلایەکیترەوە ئاشکرا کرد، کە دەرکەوت وڵاتانێك بەرهەمهێنانێکی زۆری میدیاییان هەیە و وڵاتگەلی تریش بەدەست برسێتی لە مجۆرە بەرهەمهێنانەدا دەناڵێنێ.

ئەو کەلێنە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە نێوان وڵاتانی پێشکەوتوو و وڵاتانی تازەگەشەسەندوو لە زیادبووندایە لە سەرجەم بوارەکانی گەیاندن و زانیارییەکاندا، ئەم پرسەش جێبەجێکردنی ئامانجەکانی گەیاندن و میدیای نێودەوڵەتی پەك دەخات، بەڵام ئەوەی لەبەرچاو دەگیرێ لەم بازدانە تێکنەلۆژییە زیادبوونی خواستە لەسەر هەواڵە بینراوەکان، کە جۆرێکی نوێی لە ئاژانسەکانی هەواڵی تایبەتمەند لە ماددە فیلمییە تەلەفزیۆنی هەواڵەکان دۆزییەوە، کە بووە هۆی گواستنەوەیەکی مەزن لە میدیای نێودەوڵەتی کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ هەواڵ و ڕووداوە نێودەوڵەتییە هەنووکەییەکان بە دەنگ و ڕەنگەوە فەراهەم کرد.

سیماکانی کەلێنی تەکنەلۆژی نێوان باکوور و باشوور زۆرە، بەپێی ئامارە نوێیەکانی یونسکۆ، وڵاتانی پێشکەوتووی پیشەسازی ٩٢٪ لەو خولگانە بەکاردێنن، کە مانگە دەستکردەکان بۆیان هەڵدراون، هەروەها خاوەنی ٩٨٪ی تواناکانی کۆمپیوتەرە. ڕووخسارێکی تری مەترسییەکانی شۆڕشی تەکنەلۆژی لە بواری زانیارییەکان خۆی لە کاریگەرێتی لەسەر بونیاتی سیاسی لە ناو خودی وڵاتانی پێشکەوتو و لەسەر پەیوەندی نێوان ئەم وڵاتانە و وڵاتانیتری تازە گەشەسەندوو دەبینێتەوە. توانای دەزگا تایبەتە کارکردووەکان لە بواری بەرهەمهێنانی زانیاری لە وڵاتانی پێشکەوتوو پەرەی سەند و هەژموونێکی گەورەی پەیدا کرد لەسەر پرۆسەی بڕیاردان لەسەر ئاستی نیشتیمانی، بەتایبەت سەبارەت بەو دامەزراوانەی کە

خاوەنی چالاکی نێودەوڵەتی یان دەزگای فرە رەگەزن. ئەمەش هەڕەشەیە بۆ سەر دیموکراسییەتی گەیاندن و میدیا جا لەسەر ئاستی نیشتیمانی بێ یان نێودەوڵەتی، پشێوی و نەمانی هەماهەنگی لە بواری گەیاندنە تەلی و وایەرلێسەکان و بەکارهێنانی شوێنکەوتووە پیشەسازییەکان هەیە، سەرەڕای نایەکسانی بەرچاو لە نێوان وڵاتان لەم بوارەدا، هەموو ئەم نیشانانە ئاماژەن بە کەڵەکەبوونی تەنگژە لە نێوان باکوور و باشووردا، کە وایکرد وڵاتانی باشوور هەوڵەکانیان بەرەو سیستمێکی نوێی میدیایی چڕوپڕتر بکەنەوە.

بنەمای دەرکەوتنی زانیاری و گۆڕینی بۆ هێزی سەردەم لە بنەڕەتەوە پشت بە پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیای گەیاندن دەبەستێ، بە جۆرێك بۆتە خاوەن دەسەڵات لە دروستکردنی رووداو و بڕیاردانـدا. زانیاری لەمیانەی ئامرازە گەیاندنەکان و ئەختەبوتە میدیاییەکەوە توانای دروستکردنی واقیعی خەیاڵی هەیە بەپێی ئاراستەی نوخبە زاڵبووەکە، بەمەبەستی کاریگەربوون و دەسەڵاتگەری، بەوەی توانای کێشانی سنووری واقیع توانای زاڵبوونە و پرۆسەی گواستنەوەی زانیاری بۆ خۆی دەسەڵاتە و مافی گەیشتن پێی یان مامەڵە لەگەڵ کردنی جۆرە دەسەڵاتێکی مەترسیدار و بەرهەڵستییە. دەسەڵاتی زانیاری توانای وەبەرهێنانی خێرایی گەیاندنەکانە بۆ گەیاندنی زانیاری ئامادەکراوی پێشوەختە بۆ ئامانجگەلی دیاریکراو، لێرەدا ناوەڕۆکی دیاردەی زانیاری خۆی حەشار دەدات بە قۆستنەوەی ئەو بۆشاییەی کە وەرگری پەیامەکە لە رێگەی پەیوەندی خێراوە بەجێی دەهێڵێ، کاتێك پێویستی نامێنێ بۆ لەخۆگرتنی پەیامەکە و هەرسکردنی. ئەگەر بزوێنەری زانیاری توانای گۆڕینی واقیعی بۆ خەیاڵ و بەپێچەوانەوە یاخود گۆڕینی شەڕ بۆ خێر و بەپێچەوانەوە هەبێ، ئەوا پرسەکە مەترسیدارە بەوەی ئامرازەکانی زانیاری بوونەتە ئەو دەمارە زیندەگییەی کە جیهان لەرێگەیەوە بە هەموو بیرو جووڵە و چالاکییەکانییەوە هەناسەی پێدەدات.

شۆڕشی زانیاری ئاسۆگەلی فراوانی کردۆتەوە بۆ مرۆڤەکان تاکو روانینی نوێ پەیدا بکەن کە ئەوانی پێشتر لەبەر نەبوونی ئەو تەکنۆلۆژیایە نەیانتوانی پێی بگەن ، بەڵام پرسیارێك بەسەرسوڕماوی دەمێنێتەوە، ئەویش ئەوەیە مرۆڤ چۆن دەتوانێ مامەڵە لەگەڵ ئەم داگیرکارییە زانیارییە بکات بە شێوەیەکی بابەتی و عەقڵانی و رەخنەگرانە؟

لەبەرنامەدایە تا ساڵی ٢٠١٥ ئینتەرنێت بگەیەنرێتە نیوەی دانیشتوانی سەر زەوی، وا دیارە ئەم خەونە لە راستی نزیك دەبێتەوە، کە ژمارەی بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت ساڵانە بەرێژەی ٢٠٪ زیاد دەکات و ئێستا لە ملیارێك بەکارهێنەری تێپەڕاندووە. بەڵام هێشتا



کەلێنی نێوان وڵاتانی گەورە و وڵاتانی تازە گەشەسەندوو لەئارادایە، بەپێی راپۆرتی یۆنسکۆ لە ساڵی ٢٠٠٦، خزمەتگوزاری ئینتەرنێت تەنیا بۆ ١١٪ی دانیشتوانی جیهان دەستەبەرە، کە ٩٠٪یان لە وڵاتانی پیشەسازی نیشتەجێن. لە دوای ویلایەتە یەکگرتووەکان، وڵاتی چین بە دووەم وڵات لە جیهان دادەنرێ کە پەیوەستە بە تۆڕی ئینتەرنێت کەچی تەنیا ٤٠٪ لە دانیشتوانی ئامێری کۆمپیوتەریان هەیە، کە دەکاتە ٨٧ ملیۆن بەکارهێنەر.

هەروەها دیموکراسی یەکێکە لە دەرەنجامە لۆژیکییەکانی سەردەمی ژمارەیی، چونکە تەکنۆلۆژیای گەیاندن و زانیاری ئەلیکترۆنی رووپێوێکی فراوان بۆ ئازادی هزرو سانایی ئاڵوگۆڕی زانیاری بەتایبەت لە رێگەی ئینتەرنێت بۆ خۆی دەرەخسێنێ. شۆڕشی دیجیتاڵی خۆی لە زێدە پێشوازیکردنی بەکارهێنانی ئینتەرنێت دەنوێنێ، دیموکراسییەتی دیجیتاڵی (ئەلیکترۆنی) تەنها زانیاری تۆمارکراو لە شێوەی ژمارەییدا نییە، کە دەکرێ وەدەستبهێنرێ یان پەنای بۆ ببرێ بۆ تێگەیشتن لە رەوشی باوی کۆمەڵگەدا، بەڵکو بەشداربوونێکی پراکتیزەیی و کاریگەرە لەلایەن ئەندامانی کۆمەڵگە لە پرۆسەی حکومڕانیدا، هەروەها دیارکردنی هێڵە گشتییەکانە لەو فەلسەفەیەی کە لە گشت بوارەکاندا سیاسەتی گشتی ئاراستە دەکات. لە هەمانکاتدا بەهێزکردنی پەیوەندییەکی پۆزەتیڤانەیە لە نێوان هاوڵاتیان و حکوومەتدا، ئەمەش دان پێدانانێکی راشکاوە لەسەر مافی هاووڵاتی ئاسایی، لە ئاگاداربوونی گشت زانیارییەك لەسەر ئەو بەڵگانە لە رێگەی تەکنۆلۆژیای گەیاندنەوە، کە پەیوەندییان بە بڕیار و یاساکان هەیە لە لایەن هەردوو دەسەڵاتی یاسایی و جێبەجێکردنەوە دەردەچن و پاشان چاودێریکردنی چۆنێتی جێبەجێکردنیان ئەویش بە چەسپاندن و تەسلیمکردنی بەرپرسیارێتی راستەوخۆ بە دەزگا جیاوازەکان بەرابەر بە خەڵك، سەرباری هەبوونی نوێنەرە کاندیدکراوەکان کە بۆ ماوەیەکی زۆر نوێنەرایەتی دەکەن.

## کاریگەری شۆڕشی گەیاندن لە بەجیهانیکردنی میدیادا:

زۆر پرسیار ورووژێنراون لە بارەی بەجیهانیکردنی ئەم شۆڕشە و رۆیشتنی بۆ ئەو میللەت و کۆمەڵگە جیاوازانەی لە رووی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتییەوە و ناچارکردنیان بە تەسلیمبوون و گوێڕایەڵبوون و پەکخستنی توانای کارلێککردن و کاردانەوەیان. بۆ دیاریکردنی مێژووی شۆڕشی گەیاندن، دەبێ بگەڕێینەوە سەر بەکارهێنانی وشەی (شۆڕش) بۆ یەکەمجار لە ئەدەبیاتی میدیادا، لە راپۆرتێکدا کە لەلایەن (سیمۆن نورا)و (ئەلین ماین)ەوە پێشکەش بە سەرۆکی فەڕەنسای

ئەوكات (جۆرج بومبیدۆ) کرا، کە باسی لە بەستنەوەی تەلەفزیۆن و کۆمپیوتەر و تەلەفۆن دەکرد وەك یەك ئامێر و بەستنەوەیان بە ئامێری دیکەی کۆمپیوتەرەوە، کە پەیوەندییان بە مانگە دەستکردەکانەوە هەبێ، بەمەبەستی ئەنجامدانی گەیاندنی خێراتر، ئەم پێکەوەبەستنەش بە (تێلیماتیك) ناوزەدکراو بە شۆڕشێکی گەیاندن لە قەڵەمدرا. (دانیال بێل) ئەم شۆڕشەی بە شۆڕشی چوارەم لە شۆڕشەکانی کارلێککردنی کۆمەڵایەتی لە مێژووی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا دانا، ئەویش دوای شۆڕشی نووسین و چاپکردن، بەڵام بەلای خەڵکێکی دیکە بە شۆڕشی گەیاندنی پێنجەم لە قەڵەم دەدرێ، دوای چوار شۆڕشی بنەڕەتی وەك گەشەسەندنی زمان و نووسینەوە و هاتنە ئارای چاپکردن لە ناوەڕاستی سەدەی پانزەیەمدا، بە هۆی داهێنانی کارەبا و شەپۆلە موگناتیسییەکان و تلیگراف و تەلەفزیۆن و سەرەڕای وێنەی فۆتۆگرافی و سینەما، دواتریش پەیدابوونی ئێزگە و تەلەفزیۆن لە نیوەی یەکەمی سەدەی رابردوودا.

(ئەلفین تۆفلەر) لە پەرتووکی (شارستانی شەپۆلی سێیەم)دا باس لەوە دەکات کە مرۆڤایەتی تا ئێستا بە دوو شەپۆلی گەورەی گۆڕانکاریدا تێپەڕیوە، کە هەریەك لەوانە شارستانییەت و کولتوری ئەویتریانی سڕیوەتەوە و شێوە ژیانێکی نوێی هێناوەتە ئاراوە، کە لەوەو پێش کەس لە ئەندێشەیدا نەبووە، شۆڕشی یەکەمیان بریتییە لە (شۆڕشی کشتوکاڵیی) کە مرۆڤایەتی بەدرێژایی هەزاران ساڵ گەشەیان پێداوە و لە ساڵی ١٨٠٠ دا کۆتایی پێهات، دوای ئەوە شەپۆلی دووەم دەرکەوت کە (سەردەمی پیشەسازی)یە و ٣٠٠ ساڵی خایاند و لە کۆتایی شەستەکان یا سەرەتای حەفتاکاندا کۆتایی پێهات، شەپۆلێکی نوێ جێی گرتەوە لە سەردەمێکی نوێدا کە بە چەند شێوەیەك ناوزەدکراوە لەوانە (سەردەمی زانیارییەکان، سەردەمی شۆڕشی ژمارەیی (digital) سەردەمی زیرەکیی دەستکرد و سەردەمی ئەندازیاری بۆماوەیی..هتد)، ئەگەری ئەوە هەیە ئەم سەردەمە خێرا کامڵ بێ و زیاتر لە چەند دەیەیەك نەخایەنێ چونکە وا دیارە مێژوو لەم سەردەمەدا زۆر خێرا تێپەڕ دەبێ.

کەواتە ئەم سەردەمە کاریگەری لەسەر هەموو تاکێکی ئێمە دەبێ توانای گەیاندنی تاکە کەس زیاد دەکات و دەرەنجام هەموو کەسێك دەبێتە خاوەن کەسایەتێکی جیاواز و سەربەخۆ، خێزانەکان زیاتر لێك جیا دەبنەوە و بیرکردنەوەی ئابووری جیاواز دەبێ و سیاسەت بەهاو تیۆری خۆی دەگۆڕێ، کە سەرجەمیان رووبەڕووی هێزە پێشووەکان دەبنەوە و دەسەڵاتداران دەکەونە بەر مەترسییەوە و زەمینەیەکی لە باریش دێنێتەوە ئاراوە بۆ ململانێی هێزەکانی دوارۆژ. مەبەستی (تۆفلەر) لە (شارستانییەتی شەپۆلی سێیەم) کەڵەکەبوونی رۆشنبیریی و



زانست و زانیاری و تەکنیکە جۆراوجۆرەکانی ئەم سەردەمەیە، ئەم تەکنیکانەش لە زۆر بواردا هەن بە تایبەتی لە بواری زانیاری و گەیاندندا، ئەم شارستانییە نوێیە ئامێری ئەلیکترۆنی وای داهێناوە کە زۆر بە رێکوپێکی توانای بیستن و کارکردنی هەیە، بەکارهێنانی ئینتەرنێت لە ماڵەوە وایکردووە لە جیاتی رۆیشتن بۆ ئیش یان بۆ کارگە مرۆڤ بە ئاسانی بتوانێ هەموو ئیشەکانی لە ماڵەوە رابپەڕێنێ. تا ئێستاش کاریگەری ئەم شۆڕشە ئەلیکترۆنییە نازانرێ لە ئایندەدا لەسەر کەسایەتی مرۆڤ چۆن دەبێ، چاوەڕوان دەکرێ راوبۆچوونە جەماوەرییەکان بەرە بەرە لە داکشان بن و بۆچوونە تاکەکەسی و گرووپییەکان زیاتر گەشە بسێنن. دەرەنجام هەمەجۆرییەك لە بۆچوون و دروشم و بەهاکاندا لە هەموو کۆمەڵگەیەکی سەر رووی ئەم زەمینە بێتە ئاراوە.

پێشکەوتنی تێکنەلۆژی لە بواری گەیاندندا لە ئەنجامی کارلێککردنی سێ بواردا هاتۆتە ئاراوە: (گەیاندنی تەلدارو وایەرلێس، ئامێرەکانی بیستن و بینین، زانیارییەکان). کارلێکردنی ئەو سێ بوارە بە هۆی پێنج فاکتەرەوە دەبێ:

١- هەوڵدان بۆ یەکخستنی بەکارهێنانی سیستەمی ژمارەیی لە تەکنۆلۆژیادا، هەروەها یەکخستنی هێما ئەلیکترۆنییەکان.

٢- پێشکەوتنی ئامێرە تەلدار و وایەرلێسەکان و گەشەسەندنی توانایان لە بواری گواستنەوەی زانیارییە جۆراوجۆرەکاندا وەك وێنە و دەنگ و دەق و داتاکان.

٣- بەکارهێنانی شاشەی تەلەفزیۆن وەك ئامێرێکی هەمە کار ئەنجامدەر کە لە خزمەتی خەڵکدایە.

٤- بە هۆی چارەسەرکردن و خەزنکردنەوە دەتوانرێ هەموو جۆرە دەنگ و رەنگ و دەق و زانیاری جۆراوجۆر تێکەڵ بکرێ.

٥- هەوڵدان بۆ زیادکردنی رێژەی گفتوگۆ و کارلێککردن لە نێوان خەڵك و ئەو ئامێر و دەزگا سەرەکییەی کە خزمەتگوزاری پێشکەش دەکات، بەمشێوەیە ئەم تەلەفزیۆنە دەبێتە ئامێرێکی فرە ئەرك ئەنجامدەر، تۆڕی پەخشکردنیش بەرە بەرە دەبێتە تۆڕێکی دیجیتاڵی کە دەتوانێ زۆر ئەرك ئەنجامبدات.

ئەم کارلێککردنە تێکنۆلۆژیای تازەی هێنا ئاراوە و گۆڕانکاری بنەڕەتی لە پیشەسازی گەیاندن ئەنجامداو هەوڵیداوە رێکخستن و گونجاندنی شیاوتر ئەنجامبدا لە نێوان ئەو هەموو ئامێرانەی کە هەریەکە و ئەرکی خۆی ئەنجامدەدات. تەکنۆلۆژیای نوێ چاوەڕێی لێدەکرێ لە

ئایندەیەكی نزیكدا ئامێری پێشكەوتووتر و جۆراوجۆرتر بهێنێتە ئاراوە، كە تەكنیكی ژمارەیی تیادا بەكاربێ بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ هەموو جۆرە زانیارییەكی نووسراو و بیستراو بینراودا، ئەم پێشكەوتنە تەكنیكییە بووە هۆی پەیدابوونی ئەمانەی خوارەوە:

١- رێكوپێكی و چاكتربوونی ئامێری وێنەگرتنی ئەلیكترۆنی و چاكبوونی توانای خەزنكردن و چارەسەركردنی.

٢- گەشەسەندنی ئامێرەكانی گواستنەوەی دەنگ و رەنگ بە هۆی تەكنیكە ژمارەییەكانەوە.

٣- بە هۆی پێشكەوتنی ئامێرەوە توانای پەخشكردن زیادی كرد هەروەها ژمارەی كەناڵە ئاسمانییەكانیش لە زیادبووندایە.

٤- دوو كەس دەتوانن بە هۆی شاشەی تەلەفزیۆن لە دوو شوێنی جیا لەگەڵ یەكتردا گفتوگۆ بكەن، هەروەها بینەر دەتوانێ لەگەڵ دەزگای پەخشكردندا گفتوگۆ بكات و شت بكڕێ و لە دوورەوە فێریش بێ.

٥- ئەنجامدانی ئەركی ئامێری تەلەفزیۆن و كۆمپیوتەر و تەلەفۆن و فاكس بە یەك ئامێر.

٦- دەتوانرێ نووسین و وێنە لەهەمانكاتدا لەگەڵ دەنگی بیستراو پەخشبكرێ.

ئەم پێشكەوتنە تێكنۆلۆژییە لە بواری گەیاندندا گۆڕانكاری زۆر خێرای هێناوە و دەهێنێتە ئاراوە، بە شێوەیەكی وا كە كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لەمەوپێش بەخۆوەی نەبینیوە و هەموو ئاستێكی سیاسیو ئابووریی و رۆشنبیریی و سەربازیی گرتۆتەوە. تەكنۆلۆژیا تەنها بریتی نییە لەو ئامێر و كەرەستانەی كە دروستكراون، بەڵكو توانیویەتی بارودۆخێكی كۆمەڵایەتی نوێ بێنێتە ئاراوە، رەفتاری كۆمەڵایەتی خەڵك بەرەو گۆڕان ببات. زانیاری و زانست بوونەتە گرنگترین سەرچاوەكانی هێزی سیاسی و ئابووریو سەربازی، كە بە هۆیانەوە وڵاتان بە شێوەیەكی راستەوخۆ و ناڕاستەخۆ، لە بەرژەوەندی خۆیان بەكاری دێنن و بیروباوەڕی خۆیانی پێ باڵا دەست دەكەن بۆ پتەوكردنی دەسەڵات و مسۆگەركردنی بەرژەوەندییان، كەواتە هێز زانیارییە وەك (میشێل فۆكۆ) دەڵێ.

پێشكەوتنی تێكنۆلۆژی و سەرمایە تەواوكەری یەكترن، دەتوانین ئەمە بە روونی لە بۆچوونەكانی ئەمریكادا ببینین لەمبارەوە، دوای سەركەوتنی سەرۆكی ئەمریكی (بیل كلنتۆن) بۆ سەرۆكایەتی ئەمریكا بۆ جاری دووەم لە ساڵانی نەوەدەكاندا، بایەخێكی زۆر درا بە بواری گەیاندن و پلانی تایبەتی بۆ داڕێژرا لە ژێر ناونیشانی (N.I.I)، ئەم سیاسەتە ئابوورییە نوێیە چاوەڕێی قازانجی زۆری لێدەكرا، بۆ ئەوەی گرفتەكانی چاودێری تەندروستی و چاكسازی



بەرنامەكانی پەروەردە و فێركردن چارەسەر بكات، سەرەڕای بەهێزكردنی باڵادەستی تەكنۆلۆژیای ئەمریكی لەسەر ئاستی جیهاندا. جێگری سەرۆكی ئەوكاتی ئەمەریكا (ئالگۆر) كە خۆی پسپۆرە لە بواری زانیاری و گەیاندندا، راپەڕاندنی ئەم بەرنامەیەی گرتە ئەستۆ كە وەك بەرنامەیەكی ستراتیژی رەزامەندی لەسەر درابوو. دەیان بلیۆن دۆلار لە بواری گەیاندندا خرایەگەڕ و كەرتی تایبەت رۆڵی سەرەكی تیا بینی، هەروەها وڵاتانی یەكێتی ئەوروپا هەمان پرۆژەیان گرتەبەر كە (٨٠) ملیار دۆلاری تێچوو، لە هەمانكاتدا وڵاتە دەوڵەمەندەكان (٤٠٠) ملیار دۆلاریان لەم بوارە خستەگەڕ، بەمشێویە شۆڕشی گەیاندن، جیهانگیری گەیاندۆتە ئەم ئاستەی ئەمڕۆ.

وەك دیارە هێزی ئابووریی تێكنەلۆژی بە شێوەیەكی نایەكسان لە نێوان جیهانی یەكەم و جیهانی سێیەمدا دابەشبووە، ویلایەتە یەكگرتووەكان و یەكێتی ئەوروپاو ژاپۆن بەگشتی بەشی شێریان هەیە لە دروستكردن و سوودوەرگرتن لە ئامێرەكانی زانیاری و گەیاندندا، وەك لە بەیاننامەكانی (رێكخراوی هاریكاری و ئابووری و گەشەسەندن - OECD)دا هاتووە، رێژەی خستنەگەڕی سەرمایە لە بواری تێكنۆلۆژیای زانیاری لە ئەمریكا گەیشتۆتە ١٢٪ی سەرمایەی وەبەرهێنراو لەو وڵاتەدا، لە كاتێكدا رێژەكە ٨٪ ە لە بەریتانیا و ژاپۆن و كەنەدادا، ٦٪ە لە فەرەنسا لە ساڵانی هەشتادا. هەندێ لە راپۆرتەكان باس لەوە دەكەن كە سەرمایەی وەبەرهێنراوی هەندێ كۆمپانیای گەورەی نێودەوڵەتی لە بواری تەكنۆلۆژیای زانیاری و بەرنامەكاندا و ئێستاش لەسەرمایەی وەبەرهێنراو لە بواری ئامێر و كەرەستەی دیكە زیاترە.

لە رووی خاوەندارێتی بیری و رۆشنبیرییەوە، كۆمەڵەی ئەوروپی وای بۆ دەچێ، باڵادەستی میدیای ئەمەریكی لەگەڵ بە جیهانیبوونی میدیادا، بە واتای لە ناوچوون و پاشەكشەكردنی بیری رەخنەگرانە و لە ناوچوونی ناسنامە دێ بەتایبەتی ناسنامەی ئەوروپی لە بەرابەر هێرشی میدیاو كوولتوری ئەمەریكیدا، جیهانگیریی میدیا دەبێتە هۆی كۆنترۆڵكردنی تەواوی هەموو جیهان و میللەتان بە هۆی رۆڵی مەزنی مانگە دەستكردەكانەوە، وەك بیرمەندی فەڕەنسی (پۆڵ ڤیریلیۆ) دەڵێ " ئەوەی كە ناسنامەی ئەوروپی دەخاتە بەر هەڕەشەوە بریتییە لە جیهانگیری، ئەم وشەیەش بەئەمەریكاییبوون و لیبڕاڵبوون دەگەیەنێ، كە بە هۆیەوە هەوڵدەدرێ بۆ سڕینەوەی كوولتورەكانی دیكە و توانەوەی كوولتورە بچووكەكان و نەهێشتنی تایبەتمەندیی و ناسنامەكان و دروستكردنی جیهانی بێ كوولتور".

ئەگەر مەترسییەکانی جیهانگیری بەو شێوەیە بێ بۆ سەر وڵاتە پێشکەوتووەکان وەك وڵاتە ئەوروپییەکان، کەواتە چاوەڕێی مەترسی لە رادەبەدەری لێدەکرێ لەسەر جیهانی سێیەم. پێکهاتەی ئامێرەکانی گەیاندنیش مەترسی خۆی هەیە، خاوەن شتوومەکە وێنەییەکان تەنها لە هەوڵی ئەوەدان شتوومەکەکانیان بە زووترین کات و بە زۆرترین قازانج بفرۆشن، بازرگانی رۆشنبیریش لەم پرەنسیپە بەدەر نییە هەرچەندە بێ ناوەڕۆکیش بێ تەنها ئەرکیشی بریتییە لە پڕکردنەوەی کەناڵەکانی ئاڵوگۆڕو پەخشکردن لە میانەی بەکارهێنانی وشەو دەنگ و رەنگ، ئەمەش بە روونی لە بواری تەلەفزیۆن و سینەمادا بەرچاو دەکەوێ، کە بەرهەمە هونەرییە ئاستبەرزەکان روو لە بێ بازاڕین، نرخی کاسێتیش تەنها بەوە دادەنرێ کە ئایا تا چ رادەیەك دەستکەوتی ماددی تێدایە یان بینەری هەیە. یەکێك لە گرنگترین خەسڵەتە پێکهاتەییەکانی جهانگیریەتی بریتییە لە هەوڵدان بۆ کۆنترۆڵکردنی شێوەی بیرکردنەوە و شیکردنەوە و بۆچوونی خەڵك، یان ئەوەی کە پێی دەڵێن (ئەندێشە) کە بە ئامرازێکی سەرەکی دادەنرێ بۆ دەربڕینی هەموو مرۆڤێك بۆ خودی خۆی و ژیان و بوونی، هەرکاتێك کۆنترۆڵی ئەندێشەی مرۆڤ کرا ئەوا ئەو مرۆڤە بە شێوەیەکی ناتەواو و کۆنترۆڵکراو کەسایەتی خۆی دەردەبڕێ، نەخاسمە (جیهانگیریەتی میدیا) بە هۆی تێکنۆلۆژیای گەیاندنەوە لە هەوڵی بڵاوکردنەوەی (پرەنسیپی لێکچوون)و پاراستنی ئەو پرەنسیپەیە، بۆ ئەوەی ببێتە واقعێکی حاشا هەڵنەگر و کۆمەڵگە بگۆڕێ بۆ پارچەیەکی هەمان شێوە.

## جیهانگیریی میدیا و ئەرکی دەوڵەتی گەیاندن:

وادیارە بەرە بەرە سەردەمی زانینی زانیاری گەیاندن رووبەرێکی زیاتر لە ژیانی مرۆڤایەتیدا دەگرێتەوە، بەڵکو لەوەش تێپەڕی کردووە و بە شێوەیەکی کاریگەر کار دەکاتە سەر ئەو دامودەزگا و چەمك و بەهایانەی کە ناگونجێن لەگەڵ تایبەتمەندی و پێداویستییەکانیدا. لە چوارچێوەی ئەم رووداو و گەشەسەندنە خێرایانەدا، وا دەستکراوە بە باسکردن لە (کۆتایی هاتنی دەوڵەت)، هەروەها باس لەوە دەکرێ کە سیاسەت و دامودەزگاکانی و شێوازی پەیڕەوکردنی بەمشێوەیەی ئێستای کە باوە، وایلێهاتووە کە بە دەم داخوازییەکانی سروشتی ئەو گەشەسەندنانەی کە روو دەدەن نایەن.



زۆربەی شرۆڤەکاران لەو بڕوایەدان کە دامودەزگاکانی دەوڵەت ئەو توانا کاریگەر و بەهێزەیان نەماوە، بۆ چارەسەرکردنی ئەو هەموو دۆزە زۆرەی کە رووبەڕوویان دەبێتەوە، هەروەها حکوومەتەکان تووشی لاوازبوونی دەسەڵاتەکانیان بوونەتەوە و توانای کۆنترۆڵکردنی گواستنەوەی سەرمایە و زانیارییەکانیان بە نێو سنوورەکاندا کەمبۆتەوە و لە ئاستێکدا رووبەڕووی فشاری جیهانگیری بوونەتەوە و لە ئاستێکی دیکەدا رووبەڕووی داواکارییە جەماوەرییەکان بوونەتەوە کە داوای گواستنەوەی دەسەڵاتە ناوەندییەکان دەکەن بۆ هەرێمەکان و لە هەندێ باری توندڕەویانەدا ئەگەر داوای جیابوونەوە بکەن ئەوا سیستمی گشتی هەڵدەوەشێتەوە و دامودەزگا شارستانییەکان لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی توندوتیژیدا هەرەس دەهێنن.

پەیڕەوکردنی میدیا لە پێکهاتەی ئەو سیستم و بونیاتی کۆمەڵایەتی و پێکهاتە فکرییانەی کە دەوڵەت تیایاندا سەروەری خۆی پەیڕەو دەکات سەرچاوە دەگرێت. دەوڵەت شێوازی مامەڵەکردنی لەگەڵ هاوڵاتیانیدا دیاریدەکات ئەویش لەمیانەی سیستمی سیاسیدا کە پێکهاتە سیستمەکەیەتی کە بریتییە لە کۆمەڵێك دامودەزگا کە بەکامڵبوونیان چوارچێوەیەکی گشتی بۆ دەسەڵات پێکدێنن. بەم شێوەیە پەیڕەوکردنی سیاسەت لەلایەن هاوڵاتییانەوە و دروستکردنی بڕیار لەلایەن دەسەڵاتی فەرمانڕەواوە دواتر داڕشتنی سیاسەتی میدیایی لەسەر ئاستی دەرەکی بۆ دەوڵەت دەبنە ئەو تۆخمە بنەڕەتیانەی کە شێوازی ڕاستەقینەی پەیڕەوکردنی سیاسی دەوڵەتێك پێکدێنن. کرۆکی جیهانگیریی ئابووری وەکو چوارچێوە فکرییەکەی، کاریگەری لەسەر پرۆسەی میدیایی - رۆشنبیری هەیە، دەرەنجام کار دەکاتە سەر ئەرکی گەیاندن لە دەوڵەتدا، بە تایبەتی ئەو باوەڕەی کە پەیوەندی هەیە بەئازادی گەیشتن بە بازاڕەکان هەروەها بە بڵاوبوونەوەی تەکنۆلۆژیاکانی گەیاندن و زانیارییە پێشکەوتووەکان. لە پێشەنگی ئەمانەش بەرهەمهێنان و پەخشکردنی میدیایی و زانیاری سنوور جوگرافیبەزێن دێ، لە رێگەی مانگە دەستکرد و تۆڕە بەکێبڵ بەستراوەکان و رێگا خێراکانی دیکەی زانیاری کە بازاڕە جیهانییەکان و بۆرسەکان پێکەوە دەبەستنەوە.

ئەم شۆڕشە لە بواری میدیا و گەیاندن لە سەردەمی مانگە دەستکردەکاندا، وایکردووە ئەم جیهانە ببێتە دێیەکی بچووك کە سنوور و دوورییەکانی تیادا نەمێنێ، کاریگەری روون و ئاشکرای خۆی هەبووە لەسەر سروشتی ئەرکی دەوڵەتی گەیاندن. رووداو و گۆڕانکارییەکان و هەبوون و هاتنی زانیارییەکی زۆر لە هەموو ئاستەکاندا وایکردووە کە بڕیاردەر زۆر بە خێرایی بڕیاری خۆی بدات، چونکە لەوانەیە خۆی لە هەڵوێستێکدا ببینێتەوە، کە زیاتر لە چەند

خولەکێکی بەدەستەوە نەبێ بۆ یەکلاکردنەوە یان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کێشەیەك کە پێویستی بە زوو بڕیاردانە. لێرەدا دیاردەی جیهانگیری گۆڕانکارییەك دروستدەکات ئەویش یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی سەردەمی زانینی زانیاری و گەیاندنە، کە وا دەکات لە بڕیاردەر زۆر بەخێرایی بڕیاری خۆی بدات، بەمشێوەیە سەردەمی زانینی زانیاری و گەیاندن کاری سیاسی بە شێوەیەکی تازە داڕشتەوە و بارودۆخێکی نوێی هێنایە ئاراوە لە چوارچێوەی کاری سیاسی دەرەکیدا و بووە هۆی پەیدابوونی گۆڕانی ڕێژەیی لە ڕۆڵ و دامودەزگاکانی کاری سیاسی. زۆر بوون و گەورەبوونی کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکان و کاریگەری ڕۆڵیان وای لێکردن کاریگەرییان هەبێ لە داڕشتنی سیاسەتە دەرەکییەکانی وڵاتەکانیان و ناچارکردنیان کە جۆرە هەڵوێستێکی دیاریکراو بگرنە بەر، بەو واتایەی بوونیان لە هەموو بوارێکدا هەیە هەر لە بەرهەمهێنانی زانیارییەکانەوە تا بڵاوکردنەوەیان ئەویش بە بەکارهێنانی جۆرەها ئامرازی پڕۆپاگەندەیی. ئەو گەشەسەندنەی کە لە بواری میدیادا ڕوویداوە، وایلێکردووە پەیوەندییەکی تونودتۆڵی هەبێ لەگەڵ سیاسەتی دەرەکیدا، ئەگەر میدیا لە جێبەجێکردنی سیاسەتی دەرەکیدا شانبەشانی ئامرازی دیپلۆماسییەت ئامرازێکی سەرەکی بێ، ئەوا بەکارهێنانی لەلایەن ئامرازی دیپلۆماسییەتەوە ئاسانە بۆ خۆشکردنی بارودۆخەکان و پەیداکردنی پشتگیریکەران و وەلانانی دوژمنان، بەڵکو ڕۆڵی میدیا لەوەش زیاترە کە دەتوانێ ئەرکێکی دەروونی جەنگاوەرانە و بەرگریکەرانە لە هەمانکاتدا ببینێ، هەروەها کاریگەری لەم ڕادەیەش ڕانەوستێ، بەڵکو ئەرکی پاش جەنگیش لە خۆ دەگرێ لە پێناو بە گەورە هەڵسەنگاندنی دەرەنجامەکان و دەستەبەرکردنیان بە باشترین شێوە.

ئەرکی دەوڵەتی گەیاندن کەوتۆتە بەر کاریگەری کۆمەڵێك کارلێکردن دوای ئەوەی مرۆڤایەتی لەگەڵ سەردەمێکدا ڕووبەڕووبۆتەوە کە پشت بە سەرچاوە مەعنەوییەکان دەبەستێ و لەوانەیە گرنگترینیان زانینی زانیارییەکان بێ، کە وایلێهاتووە بەرگرە جوگرافییەکان لە نێوان وڵاتاندا نابن بە بەرگرێك بۆ زانینی ئەوەی لە سەرتاسەری جیهاندا لەلایەن هەموو مرۆڤایەتییەوە ڕوودەدات. تەکنۆلۆژیای جیهانی بۆ زانیارییەکان و هەمەجۆر بوونی ئامرازەکانی گەیاندن و پێشکەوتنە سەرسوڕهێنەرەکەی و گەشەسەندنی جۆریی لە شێوازی بەکارهێنانی ئەم زانیاریانە لە شێوازی مامەڵەکردنی دەروونیدا بووە هۆی کار ئاسانبوونی دەسەڵاتی دەوڵەت لە ناوخۆداو کەمبوونەوەی توانای لە دەرەوەدا بۆ نەهێشتنی دەستێوەردان لەلایەن دەسەڵاتی دەوڵەتانی دیکەوە لە کاروبارەکانیدا، ئەوەیە دەبینین ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و



ئاسمانییەکان بە شێوەیەکی تایبەت لە کاروباری ناوخۆیی هەموو وڵاتێك دەست وەردەدەن. لەوانەیە وەسفکردنەکەی ڕۆژنامەنووسی بەریتانی (تمارتون ئاش) بۆ ئەم ڕووداوانە زۆر ڕاستی تێدا بێ، کە وەسفیدەکات بە (گۆڕانکارییە تەلەفزیۆنییەکان)، بە ئامرازێکی یەکلاکەرەوەی دادەنێ لە بەرپاکردنی ئەم گۆڕانکاریانەدا، بە هۆی گواستنەوەی ڕووداوەکان لەلایەن تۆڕە تەلەفزیۆنییە ڕۆژئاواییەکانەوە، ئەمەش وایکرد کە لە تۆڕە تەلەفزیۆنییەکانی دیکە بە زۆر وڵات هان بدەن بۆ ئەوەی هەمان وێنەو دەنگ و ڕووداو بگوازنەوە، وەك هەوڵدانێك بۆ ئەوەی جێی متمانەی خۆیان پیشانبدەن بەرابەر بیسەران و بینەرانیان.

لە هەموو بوارێکی چالاکی مرۆڤایەتیدا گەیشتنی خێراو دەستبەجێی زانیارییەکان و بینینی ئەوەی کە لە سەرتاسەری جیهاندا ڕوودەدات، ژمارەی هێزە نیشاندارەکانی زیاد کردووە و هێز و دەستڕۆیشتوویی دەسەڵاتی لە ناو خودی وڵاتدا کەم کردۆتەوە. لاوازیی وڵات لە کرداری گەیاندنی ناوخۆیی و دەرەکیدا نیشانەیە بۆ بەرەو پاشچوونی پایەی دەوڵەتی ئایندەیی وەك پێکهاتەیەکی سیستمدار و بونیاتێکی کۆمەڵایەتی و پێکهاتەیەکی فیکری بۆ خەڵکانێك کە شوێنێکی دیاریکراو پێکەوەیانی بەستووە لە ناویدا ئەو کۆمەڵەیە ژیانی خۆیان بەسەر دەبەن. ئاراستەی چڕوپڕ بۆ یەکگرتنی نێوان دەزگا میدیاییەکان و پێشخستنی تواناکانی بە شێوەیەکی زۆر بۆ گەیشتن بە ڕووبەرێکی زۆرتر لە وەرگرەکان و بڵاوبوونەوەی تەکنۆلۆژیای زانیاری بە هۆی تۆڕە گشتی و تایبەتمەندەکان، بۆتە پرسی گرنگی ڕێکخراوە ناحکومییە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بە بەکارهێنانی ئامرازەکانی میدیا، بەمەبەستی گەیشتن بە زۆرترین ژمارە لە تاك و گرووپەکان. کێشەکە لێرەدا چۆنێتی زانینی قەبارەی وەرگرانی پەیامە میدیاییەکانە، لە نێو ئەو لێشاوە پەیامە میدیایانەی کە لایەنە جۆراوجۆرەکان پەخشی دەکەن.

ئەرکی دەوڵەت لە بنەڕەتدا بریتییە لە بەجێهێنانی بنیاتنانێکی کۆمەڵایەتی بۆ ئەو خەڵکەی لە شوێنێکی جوگرافیدا دەژین، کە لەوێدا دەوڵەت پەیڕەوی دەسەڵاتی خۆی دەکات. ئەگەر ئەمە ڕاست بێ بۆ سەردەمەکانی پێشوو ئەوا سەردەمی ئێستاو ئەو گەشە خێرایانەی کە لە تێکنۆلۆژییەکانی زانیاری و گەیاندندا دەیبینین بوونەتە هۆی گۆڕانکاری ڕیشەیی لە بنیاتی کۆمەڵگەکان و شێوەی ڕێکخستن و دامودەزگا و پیشەسازی و ڕۆڵی تاکەکەس و کاربەدەستانیان، هەروەها جۆری ئەو بەهاو پێوەرانەی کە ئامانجەکان دیاریدەکەن و پەیوەندییەکانی نێوان تاك و کۆمەڵە و دامودەزگاکان بەرێوە دەبەن.

دەوڵەت چەندەها ساڵ بوو کۆنترۆڵی هاتنی زانیارییەکانی دەکرد بۆ ناوی خۆی و لە ئەنجامدا داڕشتنی بیرکردنەوەی میللەتەکەی بەو شێوەی کە دەیەوێ و گەرەنتیکردنی گوێڕایەڵی هاووڵاتییەکانی بۆی لەگەڵ بەلێشاو هاتنی زانیاری بۆ ناو دەوڵەت و فراوانبوونی بواری گەیاندن، ئەوا دەوڵەت پێی ناکرێ بە شێوەیەکی تەواو کۆنترۆڵی هاتنی جۆر و بڕی ئەو زانیارییانە بکات، کە دەگەنە مێشکی هاووڵاتیانی. ئەمەش لە لایەکیترەوە ئەوە دەگەیەنێ کە جیهانگیری بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا کاری کردۆتە سەر ئەرکی گەیاندنی دەوڵەت، کە وای لێهاتووە کاربەدەست ناتوانێ هەموو ئەوەی دەیەوێ بەسەر گەلەکەیدا بیسەپێنێ بەبێ ملکەچکردنی میللەتەکەی لە هەندێ بواری دەروونی و کۆمەڵایەتی و بەهاییەوە، چونکە پێشکەوتنی تەکنەلۆژی لە بواری ئامێرەکانی گەیاندنی جەماوەریدا سنوورە جوگرافییەکانی جیهانی تواندۆتەوە و گۆڕانکاری بنەڕەتی دروستکردووە لە بونیاتی سیستمی نێودەوڵەتی و بنەمای نوێی داهێناوە لە بواری گەیاندندا لەسەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوەدا. دەرەنجام ئەمانە هەمووی بوونە هۆی سەرکەوتنی سیاسەتی دەرەوە و توانای گەیاندنی سەرکەوتوو بەندە لەسەر سەرکەوتوویی و توانای جەستەی سیاسی بۆ خۆسەلماندنی لە ناو کۆمەڵگەدا.

ئەمەش دەریدەخات کە سەرکەوتنی ئەرکی گەیاندنی دەوڵەت لەسەر کۆمەڵێ فاکتەری بنەڕەتی رادەوەستێ، گرنگترینیان ئەمانەن:

١- توانای دەوڵەت لە هەنگاونانی شانبەشانی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژی و هەبوونی ئامێرە تەکنەلۆژییە پێشکەوتووە نوێیەکان، کە کرداری گەیاندن لە دەرەوە و ناوەوە ئاسان دەکات.

٢- توانای جەستەی سیاسی لە گونجاندنی ئەوەی کە هەیەتی لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی جیهانی سەردەمدا و هاو هەنگاوبوونی لەگەڵ پەرەسەندنە خێراکاندا لە بواری بەلێشاو هاتنی زانیارییەکان.

٣- هاو هەنگاوبوون لەگەڵ پەرەسەندنی زانستی و گۆڕانکارییەکانیدا بە شێوەیەك کە دەوروبەر و رەفتاری مرۆڤ بگۆڕێ بە شێوەیەکی هاوسەنگ.

جیهانگیری خاوەنی گشتگیرییە، خێرایەکەشی بریتییە لە خێرایی گەیاندن و بە لێشاو ناردنی زانیارییەکان بە هۆی ئامێرەکانی کۆمپیوتەر و سەتەلایت و ئینتێرنێت، کە لە هەمانکاتدا ئەم زانیارییانە لە زیاتر لە (١٩٥) دەوڵەتدا بڵاو دەکرێنەوە، بەمەش یەك شارستانی جیهانی نوێ دروستدەکات.



## ئایندەی جیهان لەبەردەم شەپۆلی گۆڕانکارییەکاندا:

ئەو بارودۆخەی کە ئێستا جیهان پێیدا تێپەڕ دەبێ، وای لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی کردووە ئامادە و بە پیت بێ، بە روودانی زۆرترین گۆڕانکاری کە شوێنکاری خۆی لەسەر هەموو لایەنەکانی ژیان بە شێوەیەکی گشتگیر بەجێدێڵێ. گۆڕانکارییەکان بە یەك شێواز و ئاراستە لە رووی خێرایی و فراوانییەوە روونادەن، بەڵکو لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ یەکێکیتر و لە شارستانییەتێکەوە بۆ یەکێکیتر دەگۆڕێ. پێویستە تێڕوانینمان بۆ قەبارەی گۆڕانکارییەکان و جۆری و هەمەلایەنییەکەی هەڵقوڵاوی واقیع و ئاستی گۆڕانە ناوخۆییەکان بێ، هەستکردنمان بەم گۆڕانکارییانە روو لە زیادبوون دەکات، لەگەڵ فراوانبوون و پێشکەوتنی ئەو هۆیانەی کە کەنارەکانی جیهان بەیەکەوە دەبەستێتەوە. ئەمەش ئەو هۆکارانەن کە دەروازەی بەسەر جیهاندا بۆ خستووینەتە سەر پشت، کە لە رێگەیەوە پێشوازیمان لە کاریگەرییەکانی کردووە، جیهانیش سوودی لە کارتێکردن لێمان بینیوە، ئەوانەش کە بە شێوەیەکی پێشکەوتووتر پێمان دەگەن بەتایبەتی لەم بوارەدا، بواری پەیوەندی تەکنۆلۆژیا کە ئێستا بە گرنگییەکی زۆرەوە چۆتە نێو ئابووری بازاڕی جیهانی. ئێستا کێبڕکێیەکی فراوانی لەسەر دەکرێ لەلایەن ژمارەیەك لە کۆمپانیا گەورەکان کە هەریەکەیان لە هەوڵی بەرەوپێشچووندان، بەم هۆکارانە ئاسۆکانمان بەسەر ئەو گۆڕانە جوانە و پێشکەوتنانەی کە لە جیهاندا روویداوە فراوانبوون.

وشەی تەکنۆلۆژیا، ئاماژەیە بۆ هەموو زانینێکی هونەری کە لۆژیکی تێدایە و مشتومڕی لە بارەیەوە دەکرێ. زانینە هونەرییەکان بریتین لە سیستمێکی تەواو، کە زانینە زانستییەکان کارلێك دەکەن لەگەڵ پەیڕەوکارییە کردارییەکاندا لە چوارچێوەی هەماهەنگییەکی لۆژیکی تەواودا. یەکەمجار زاراوەی تەکنۆلۆژیا لە زمانی ئینگلیزیدا لە سەدەی حەڤدەیەمدا بەکارهێنراو، بەکارهێنانیشی تەنها پەیوەندی هەبوو بە هونەرە پەیڕەوکارییەکانەوە و لە سەرەتای سەدەی رابردووشدا بەکارهێنانی بڵاوبووەوە و واتاکەی پەرەی سەند بۆ ئەوەی چارەسەرکردنی ئەو کاروبارانە لە خۆ بگرێ کە پەیوەندییان بە ئامێرەکان و شێوازی بەرهەمهێنانەوە هەیە، بەڵام لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا هاودەنگییەك هەیە لەسەر پێناسەکردنی وشەی تەکنۆلۆژیا، بە واتای ئەو ئامراز و چالاکییانەی کە مرۆڤ بەکاری دێنێ بۆ ئەوەی دەوروبەری خۆی بەکاربێنێ و بیگۆڕێ، بە شێوەیەك کە گونجاو بێ لەگەڵ وەدەستهێنانی پێویستی و مەبەستەکانی.

هەروەها تەکنۆلۆژیا وا پێناسە کراوە کە هەوڵێکی رێکخراوە بە مەبەستی بەکارهێنانی ئاکامەکانی توێژینەوەی زانستی لە پەرەپێدانی شێوازەکانی جێبەجێکردنی کارە بەرهەمهێنییەکان، ئەوەش بریتییە لە خزمەتگوزاری و چالاکییە کارگێڕی و رێکخراوەیی و کۆمەڵایەتییەکان، بە مەبەستی گەیشتن بە شێوازی نوێ کە چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکرێ سوودی زیاتری هەبێ بۆ کۆمەڵگە. هەندێکیتر پێناسەی جۆراوجۆری دیکەیان کردووە، هەر کەس بەپێی بیروبۆچوونی خۆی جا ماددی بێ یان فەلسەفی یاخود کۆمەڵایەتی. توێژەرو زانایان هەردوولای تەکنۆلۆژیایان جیا کردۆتەوە، (لایەنێکی مادی) وەك: خودی ئامێر و پێکهاتە ئەندازەییەکان و ئەو وردەکارییە هونەرییە جیاوازیانەی کە پەیوەندییان هەیە بە پێکهاتە و پاراستنی ئامێری بەرهەمهێنان و بەکارهێنانی میکانیکی بۆ ئەو ئامێرە و لایەنی بەکارهێنانی کە بریتییە لە پرۆسەی بەگەڕخستن و بەکارهێنانی ئامێر بەپێی پلانێکی دیاریکراو و بڕیارگەلێك کە دەدرێن بۆ رێکخستن و برەوپێدان بە پرۆسەی بەرهەمهێنان بۆ بە ئەنجامگەیاندنی ئامانجێکی دیاریکراو و دەبێ لەمیانەی جەختکردنەوە لەسەر تێکەڵبوونی هەردوولاو کامڵبوونیان پێکەوە تەماشای ئەم دوو لایەنە بکرێ، چونکە نەبوونی یەکێکیان دەبێتە هۆی هەرەسهێنان بە شێوەیەکی تاك و سەربەخۆ.



کۆنگرەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە بارەی زانست و تەکنۆلۆژیا و گەشەپێدان کە لە ساڵی ١٩٧٩ لە ڤیەننا بەسترا گەیشتە ئەوەی کە، تەکنۆلۆژیا تەنها شێواز و ئامێر و کەرەستە و بەرنامەگەلێك نییە کە بکڕدرێ یان مامەڵەی پێ بکرێ و ئەوەی کە بەدەستی دەکەوێ بە خێرایی و ئاسانی هەرسی بکات، بەڵکو هەڵوێستێکی دەروونیشە و دەربڕینی بەهرەیەکی داهێنەرەو توانای رێکخستنی زانینە بە شێوەیەك سوودی لێ ببینرێ، کە لە چەمکە گشتییەکەیدا ئەو شێوازانە لەخۆ دەگرێ کە مرۆڤ ئەو شتانە دروستبکات کە پێویستی پێیەتی، کە پێویستییەکانی لە زانین دەستنیشان دەکات و ئەو کەرەستانە ئامادە دەکات بۆ زاڵبوون بەسەر لایەنە لاوازییە سروشتییەکانی.

تەکنۆلۆژیا بە پێناسە سادەکەی بریتییە لە، هەموو ئەو ئامێر و دەزگا و کەرەستە پێشکەوتووانەی کە بە هۆی هەوڵ و تێکۆشانی مرۆڤ بە یارمەتی دەزگا زانستی و ئەکادیمییەکان بۆ خزمەتی مرۆڤ بەرهەم هاتوون، واتە گەڕانەوەی زۆربەی کات و پشوو بۆ مرۆڤ؛ "کورتکردنەوەی مەودای نێوان مرۆڤ و کار". هەروەها پێشکەوتن لە هەموو رووەکانی ژیانی سیاسی و فەرهەنگی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و تەنانەت ئایینیشەوە و پێشکەوتنی ئەم زانستەش بەرهەمی بیری سەدەی مۆدێرن و مرۆڤی رۆژئاوایە. (مارکس)ی ئابووریناس و کۆمەڵناس لە بارەی ئامێرە مۆدێرنەکان و گەیشتنیان بە کۆمەڵگە دواکەوتووەکان دەڵێ: "هێنانی شێوازی نوێی تەکنۆلۆژیا بۆ کۆمەڵگەیەکی دواکەوتوو دەبێتە هۆی تەقینەوەی نێوان کۆن و نوێ". واتە پێکدادانی نێوان دوو کولتوری جیاواز کە یەکێکیان لە جووڵەدایە و ئەویتریان چەقبەستووە. زانست و ئامێرە تێکنەلۆژییەکان وەکو زۆربەی شار و شارۆچکەکانی جیهان خۆیان بەسەرماندا سەپاند، وەك (ئەریك فرۆم) دەڵێ: "ئەوەندە زانست پێش دەکەوێ دەگاتە ئەو ئاستەی کە بەسەر سروشتدا سەربکەوێ".

لەلایەکیترەوە زانیاری بریتییە لە؛ دەق، بۆچوون، راستی، بیرۆکەیەکی گونجاو یان کۆمەڵێك دەق و بیرۆکە، بەو جۆرەی کە لەسەری رێککەوتوون بەرهەم دێ و ئامادە دەکرێ، لە پاشان بۆ مەبەستی فێرکردن، فێربوون، کات بردنەسەر، یاخود بۆ بڕیاردان لە کاتە جیاجیاکانی رۆژانەدا لە هەموو بوارێکدا بەکاردێ. زانیاریی پەیوەستە بە زانیاری مرۆڤایەتییەوە، چونکە زانیارییەك و زانیارییەکیتر کە پەیوەست دەبن بە یەکەوە زانستی مرۆڤایەتی دروستدەکەن.

## سەردەمی زانیارییەکان:

جیهانی نوێی زانیارییەکان لەم سەدەیەدا دەرفەتی ئەوتۆ دەڕەخسێنێ نەك تەنها بەوەی لە رووی گیانەوە جیهانی بین، بەڵکو پەیوەندی پتەویش لەگەڵ خەڵکی دیکەی جیهانیدا دروستبکەین، جیهانییەکان پسپۆریی ئاڵوگۆڕ دەکەن و راستەوخۆ لە سەرتاسەری دونیادا پەیوەندی بە یەکترەوە دەکەن. جیهانگیری پرسێکی کۆنە لە مێژووی مرۆڤایەتی، بەڵام لە سەردەمی زانیارییەکاندا ئاراستەی نوێ دەگرێتەبەر و هێز و رەهەندی تری لێدەکەوێتەوە. جیهانگیری دوو بزوێنەری هەیە (بە بۆچوونی رۆند لۆبرز سەرۆك وەزیرانی پێشووتری هۆڵەندا)، کە بریتین لە داهێنانی تەکنەلۆژی لە بواری تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان و گەیاندن هەروەها هەژموونی لیبڕالییەتی نوێ، مەبەست لێی سەرکەوتنی ئایدۆلۆژیای ئابووری بازاڕی ئازاد و شێوازی بەکاربردن و میدیای کات بەسەربردن و خەسخەسەیە. (بیل گێتس) دەڵێ: "ئێستا وڵاتان لە ململانێدان بۆ هەژموونکردنی زانیارییەکان، پێشتر وڵاتان بەپێی دەوڵەمەندییان بە ماددەی خاو و داهاتە پیشەسازی و مرۆییەکان بەراورد دەکرا، بەڵام ئێستا پێوەری دەوڵەمەندی تایبەتی یان نیشتمانی بریتییە لە بڕی خاوەندارێتی زانیاری، هەرچەندە زانیاری شتێکی بەرجەستە نییە یاخود ناپێورێ". لەبەر ئەوەی زانیاری لەم سەردەمە لە رێگەی کۆمپیوتەرەوە مامەڵە و ئاڵوگۆڕی پێدەکرێ، دەکرێ پرۆسەی بەرهەمهێنانی کۆمپیوتەری پێشکەوتوو سەرەتای دەستپێکردنی سەردەمی زانیاری بێت.

پەیوەندییەکی ئەندامی هەیە لە نێوان فرە جۆریی و گۆڕانکاری لە سەردەمی زانیارییەکان کە دوو مەرجی پێویستن لە مەرجەکانی پێشکەوتن لە سەردەمی زانیارییەکاندا، ئەوەی دانیان پیا نەنێ ئەوا لە دەرەوەی ئەم سەردەمە دەبێ. فرە جۆریی لە خودی خۆیەوە خۆراك وەردەگرێ و بە بەردەوامی ئاستەکانی زانیاری کە سیستەمەکە پێویستی پێ دەبێ بەرز دەبێتەوە. گۆڕانکاریش لە ئاکامی جووڵەی شتەکان بە خێرایی لەم سەردەمەدا دێتە ئاراوە، بەمەش هەر فرە جۆرییەك دەبێتە مایەی گۆڕانکاری بە پێچەوانەشەوە دەبێتە هۆی فرەجۆریی. ناکرێ کوولتور و زانیارییەکان لێك جیا بکەینەوە، کاتێك تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان تەوەرێکی بنەڕەتی لە تەوەرەکانی گەشەپێدان پێکدەهێنا، کوولتوریش رۆڵێکی سەرەکی بینی لە پرۆسەی گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی. سەردەمی زانیارییەکان بەرەنگاربوونەوەیەکی نوێی خستە بەردەم کوولتور، بەتایبەتی کە هەندێ وای لە تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان رەچاو کرد کە کۆتایی زۆر لە بنەما کوولتورییەکانە وەك، مامۆستا، میتافیزیکیا، یادەوەری، نێوەندیارەکان...هتد.



بەداخەوە سەرکەوتن و پێشکەوتنی تەکنەلۆژی لە جیهان هاوزەمانە لەگەڵ هەندێ خاوی رۆحیی، ئەمەش ئەرکێکی نوێ دەخاتە ئەستۆی سیستمی کوولتور لە چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم کێشەیە، بۆ پڕکردنەوەی ئەم کەلێنە کە لە نێوان پێشکەوتنی تەکنەلۆژی و ژیانی رۆحیی و بەها ئاکارییەکانی مرۆڤایەتی دروستبووە.

چەمکی تەکنۆلۆژیای گەیاندن ژمارەیەکی زۆر لە پرسە ناکۆکەکانی هێنایە ئاراوە، لەوانەیە یەکێك لە دیارترینەکانی ئێستا بریتی بێ لە ژمارەیەك لەو پێوەرە ئاکاریانەی هاوەڵی سەردەمی ئەلیکترۆنین کە کردەکان لە ناو ئەم سەردەمە ژمارەییە گەورەیە دیاری دەکات. ئەم پێشکەوتنە تێکنەلۆژییە گەورەیە لە زانیارییەکان وایکردووە بۆ هەمووان دەستەبەر بێ، ئەمەش لەگەڵ خۆیدا تەنگژەی ویژدان لە بەکارهێنانی ئەم زانیاریانە و زۆرجار قۆستنەوە وێرانکەرەکەی دەخاتەڕوو. سەرەڕای لایەنە ئەرێنییەکانی بواری پێشکەوتنی زانیاری، شۆڕشی زانیارییەکان لایەنە خراپەکانی ئاشکرا کرد، لەمیانەی هەڵقوڵانی زانیارییە چەواشەکەرەکانەوە یان ئەوانەی کە ئایین و بەهاکان لەکەدار دەکەن و جۆرێکی نوێ لە تیرۆریستان پەیدابوون کە ڤایرۆسی وێرانکەری کۆمپیوتەر بەکاردێنن و هەڕەشەی وێرانکردنی بنەمای داتاکان دەکەن، گرنگترین ئەم پرسانەش:

### ١- ئازادی رادەربڕین و سانسۆر:

یەکێك لە گرنگترین ئەو ناکۆکییانەی کە بەکارهێنانی کۆمپیوتەر دروستیدەکات، بەکارهێنانی پۆستی ئەلیکترۆنییە، کە هەندێ کەس دەتوانێ بۆ ناردنی پەیامگەلی ئەلیکترۆنی بەکاری بێنێ کە هەندێجار زمانپیسی و گاڵتەپێکردنی تێدایە وەك دەربڕینێك بۆ تووڕەیی و شەڕ پێ فرۆشتن، بە قۆستنەوەی ئەوەی کە لە پۆستی ئەلیکترۆنی زەحمەتە خەسڵەتە یەکلاکەرەوەکانی کەسایەتی نێرەر روون ببێتەوە کە دەکرێ نازناو و ناوی خوازراو دوور لە ناوی راستەقینە بەکاربهێنرێ، یاساکانیش کە تاك لە کاتی بەکارهێنانی تەلەفۆن یان گوێگرتن لە رادیۆ یاخود تەماشاکردنی تەلەفزیۆن دەپارێزن، بەهەمان شێوە لە زمانپیسی نامەکانی پۆستی ئەلیکترۆنی بیپارێزێ کە خزمەتگوزارییە راستەوخۆکان لەمیانەی ئینتەرنێتدا ناتوانرێ دەستی تێوەر بدات، بەو پێیەی تایبەتمەندێتی بۆ دەستەبەر دەکات، تەنها ئەگەر پرۆگرامگەلێك بەکارهێنرا کە دەربڕینە ناشیرینەکان بدۆزێتەوە و هۆشداری بداتە بەکارهێنەرانی بە پێویستی سڕینەوەی، ئەگەر نا نامەکانیان سانسۆری دەخرێتە سەر. ئەم پرسە چەندین پرسیاری ئاڵۆز دەورووژێنێ لە بارەی رەفتارو ئازادی بیروڕاو قەبارەی سانسۆر، بەتایبەتی لەمیانەی ژوورەکانی

گفتوگۆوە لەرێی ئینتەرنێت (چات) کە دەکرێ وێنەی رووت و هەندێ گفتوگۆی سێکسی تێدابێ، بەتایبەتی کە لێکۆڵینەوە زانستییەکان دووپاتیان کردۆتەوە، کە ڕێژەیەکی زۆر لە لاوان پەنا بۆ ئینتەرنێت دەبەن بۆ تێرکردنی پێویستییە لێ هەڵهاتووەکان لەمیانەی کردنەوەی ماڵپەرە بەرەڵاکانەوە.

**٢- مافی خاوەنداری بوونی تاکەکەس:**

شۆڕشی زانیاری و تەکنۆلۆژیا کێشەیەکیتر دەخاتەڕوو کە پەیوەستە بە ئاکارەکانی سەردەمی کۆمپیوتەر ئەویش مافی خاوەنداریبوونی فیکرییە و بە شێوەیەکی تایبەتی ئەوەی کە پەیوەستە بە مافەکانی بڵاوکردنەوە و دانانەوە (Copy Rights). پاراستنی خاوەنداریبوونی فیکری لە سەردەمی زانیارییە ئەلیکترۆنییەکاندا پرسێکی زۆر گرنگە، چونکە کۆپیکردنی پرۆگرامەکانی کۆمپیوتەر لەسەر دیسك دەکرێ لە چەند چرکەیەکی کەمدا ڕوودات و گۆڕانکاری بۆ بەکارهێنانی ئامێری دیجیتاڵی و ئەلیکترۆنی هەڕەشەی ئاڵۆزبوونی کێشەکە دەکات، یاساکانی ئێستاش بۆ مافی بڵاوکردنەوە و دانانی ماددەکانی سەر خزمەتی کۆمپیوتەر ڕاستەوخۆ ناپارێزێ. چەندین پرسی ناکۆك پەیوەستن بە کێشەی مافەکانی بڵاوکردنەوە و دانانەوە، لە دیارترینیان:

- **هاککەری پرۆگرام و تۆڕەکان:**

واتا دزین یان دابەشکردن بەبێ ڕێپێدان یان مۆڵەتی وەرگرتن یاخود بەکارهێنانی ماددە، یان پرۆگرامێکی کۆمپیوتەر کە مافی بڵاوکردنەوە و دانانی هەبێ یاخود بەڵگەنامەی داهێنان، ئەویش بە شێوازگەلی جیاواز وەك کۆپیکردنی پرۆگرامێك لە سیدی بۆ سیدییەکیتر یان داونلۆدکردنی پرۆگرامێکی کۆمپیوتەر لە تۆڕی ئینتەرنێتەوە، یاخود دابەشکردنی ماددەگەلێك لە شێوەی دەستەگەلی دیجیتاڵی بەبێ وەرگرتنی مۆڵەت لەمبارەیەوە.

- **خاوەنداریبوونی وێنە و دەنگەکان:**

تەکنیکی ئامێرەکانی ڕووپێوی ڕووناکی و ئامێرەکانی وێنەگرتنی دیجیتاڵی و ئامێرەکانی کۆمپیوتەر بە کێشەگەلێك پەیوەست کرا، وەك ڕاستکردنەوەی وێنە و دەنگەکان و توانای سەرلەنوێ چاککردنەوەی لەمیانەی کۆکردنەوەی دیجیتاڵی، بۆ ئەوەی بۆ وێنەیەکی نوێ بگۆڕێ کە بکرێ بسڕدرێتەوە یان بخرێتە نێو سیستمێکی کۆمپیوتەر تاکو لە چوارچێوەیەکی نوێدا دابنرێ.



کارتێکردنی تەکنیکی زانیارییەکان لەسەر بەها مرۆڤایەتییەکانە، (جێمس مۆر) لە گرنگترین بیرمەندانی ئەم بوارەیە کە دەڵێ: "تەکنیکی زانیارییەکان زۆر بەهێزە، چونکە زۆر نەرمە" بەهێزییەکەی لە نەرمییەکەیدایە و ئەم نەرمییە توانای گونجاندنی دەداتێ بۆ جێبەجێکردنی هەر چالاکییەك، کەواتە تەکنیکی زانیارییەکان بە کرداری بە ئامرازێکی جیهانی دادەنرێ و هێز و نەرمییەکەی وای لە زۆر لە بیرمەندان کردووە بە یەکێك لە دەرەنجامی ئەو تەکنۆلۆژیا نایابەی دابنێین کە لێیەوە گۆڕانی کۆمەڵایەتی بنەڕەتی لە دایك دەبێ. هەروەها (مۆر) ئاماژە بۆ جێبەجێکردنە تازەکانی تەکنیکی زانیارییەکان دەکات کە زۆرجار چەمکی شپرزە دروستدەکات و پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە. دەرکەوتنی ژمارەیەکی زۆر لە پرسیاری ئاکاری پەیوەند بە تەکنیکی زانیارییەکان دادەنرێ، بەتایبەتی پرسیارگەلێك لە بارەی بەها مرۆڤایەتییەکان. وەك: کار و کایە و ئازادی و دیموکراسی و ئەنجامدانی خود و دادوەری هەموو ئاماژەن و جەخت دەکەنەوە کە تەکنیکی زانیاری جێگەی پرسیاری ئاکارە، شۆڕشێکی ڕاستەقینەیە.

کارکردن لە دوورەوە دەتوانێ ڕەهەندەکانی کۆمەڵایەتی لە دیاردەی کاردا بە شێوەیەکی کارتێکراو بگۆڕێ، بەڵام پەیوەندی لەگەڵ خەڵك لە ڕێگەی کۆمپیوتەرەوە زۆر جیاوازترە، لە ڕێگەی وردبوونەوە لە بینین و ناردنی دەقەکان بۆیان، بۆ کارکردن لە دوورەوە بەڕوونی کار دەکاتە سەر ژیانی کۆمەڵایەتی و دەروونی کەسەکان، بە سروشتی ناکرێ هەموو کارێك لە دوورەوە بکرێ، هەندێ فرمان وەك پیشەسازی و بەرهەمهێنان پێویستی بە کارگە یان شوێنی کۆکردنەوە و جێبەجێکردن هەیە، بەڵام هەندێ لەم فرمانانە لە ڕێگەی مرۆڤە ئامێر و ئامێرە دیجیتاڵەکانی ترەوە جێبەجێ دەکرێ. تەکنیکی زانیارییەکان بیرۆکە و چەمك و بەهای کار بە خودی دەگۆڕن، ئیتر کار نابەسترێتەوە بەشوێن و کاتێکی دیاریکراوەوە، لە کاردا ئامێرو دەرگای دیجیتاڵی لە جیاتیمان بەکاردەهێنرێن، سوودەکانی کۆمەڵایەتی و دەروونی لە کردن و خاوەنداری فەرمانەکان بە شێوەیەکی بەرچاو کارتێکردنی تەکنیکی زانیارییەکانی لەسەر بووە.

## جەنگی زانیارییەکان:

لەم سەردەمەدا مرۆڤ بەجۆرێك دووچاری لێشاوی زانیارییەکان بۆتەوە زەحمەتە بەئاسانی بتوانێ لەگەڵیدا هەڵبکات، زانیارییەکان بە چەندین شێوە گەمارۆی مرۆڤیان داوە، سەرەتا لە ڕێگەی ئامێری چاپەوە و ئینجا ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکان، پاشان کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت

سەریانهەڵدا. ئیدی وردە وردە و بەتایبەتیش لە کۆتایی سەدەی رابردوودا دەستکرا بە ڕێکخستنی زانیاری و پەیوەندییەکان، ئەو ڕێکخستنانە بوونە فاکتەری سەرەکی لە بەڕێوەبردنی کەرتە جۆراوجۆرەکانی. لەو سەردەمەدا تەنها بیرکردنەوە لە تێکدان و پەکخستنی سیستمەکانی پەیوەندی و زانیاری کاریگەری ترسناکی لەلای هەمووان دروستدەکرد، چونکە ئەوکات بۆچوون وابوو: پەکخستنی ئەو زانیارییانە، واتە ئیفلیجکردنی کۆمەڵگە و ژیانی شارستانیی سەردەم. سەرەنجام ململانێ و بەرژەوەندیی لایەنە دژ بەیەکەکان و داهێنانە تازەکانی تەکنۆلۆژیای نوێ دەرگایەکی فراوان و ترسناکیان بە ڕووی جەنگی زانیارییەکاندا کردەوە، هەڵبەت جەنگی زانیارییەکان شتێکی تازە نییە و لە سەرەتای بەکارهێنانی سیستمی زانیارییەکانەوە مرۆڤایەتی پیادەی کردووە.

کاتێکیش (رادیۆ) داهێنرا، وەك ئامرازێکی نوێ بۆ جەنگی زانیارییەکان خرایە کار، بەو پێیەش یەکێك لە لایەنەکان بەئامانجی دروستکردنی کاریگەریی دەروونیی لەسەر بەرابەرەکەی چەند زانیارییەکی بڵاوکردەوە، وەك زانیاری نهێنی یان ناڕاست بەمەبەستی کەمکردنەوەی متمانەی بەرابەر بەو زانیارییانەی بە دەستی دەگات. لەگەڵ دەرکەوتنی کۆمپیوتەر و بەستنەوەی بە تۆڕی ئینتەرنێتەوە، بەکارهێنانی ئەم داهێنانە نوێیەش رۆژ بە رۆژ پەرەی سەندو جەنگی زانیارییەکانیش ڕەهەندێکی نوێی بەخۆوە بینی. لێشاوی زانیارییەکان و ڕێکخستنی داهێنانە نوێیەکانی ئینتەرنێت و کۆمپیوتەر وایکرد زۆرترین کات بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ژیانی رۆژانە پشتیان پێ ببەستێ و بەکارهێنانی زانیارییەکان وەکو چەکێك، دژوارترین کاریگەری دروستکرد. لەگەڵ ئەوەشدا تائێستا بەکارخستنی زانیارییە کلاسیکییەکانی وەك ئامێری چاپ و بڵندگۆکان هەر لە نێو ریزبەندیی هۆیەکانی جەنگی زانیارییەکاندا ماونەتەوە، سەرەڕای ئەوەی کە دەتوانرێ وەکو هۆکارێکی یارمەتیدەر لە جەنگە کلاسیکییەکاندا بەکاربهێنرێن، هەروەها زۆرجار زانیارییەکان خۆیان دەبنە گۆڕەپانی جەنگی نێوان دوو لایەنی دژ بە یەك.

**جەنگی زانیارییەکان لە سێ رەگەزی بنەڕەتی پێکهاتووە (هێرشبەر، بەرگریکەر، زانیاری و سیستمەکانی). هەروەها دوو جۆر جەنگی زانیاری هەیە کە بریتین لە:**

**١- جەنگی زانیاری هێرشبەرانە:**

ئامانج لێی وەدەستهێنانی زانیاری دیاریکراوە یان ئەو سیستمی زانیارییانەیە کە لایەنی بەرابەر پشتی پێدەبەستێ، بۆ ڕێکخستن و زیادکردنی بەهای زانیارییەکانی لایەنی هێرشبەرە،



یاخود کەمکردنەوەی بەهای زانیارییەکانی لایەنی بەرگریکەرە. لێرەدا بەهای زانیارییەکان و شێوازی ڕێکخستنیان پێوەری سەرەکین بۆ زانینی رادەی کۆنترۆڵکردنی یەکێك لەو لایەنانە، لەلایەن ئەوی دیکە. زۆرجار ئەوەی لایەنی هێرشبەر لە شەڕی زانیارییەکاندا هەوڵی بۆ دەدات، دەشێ ئامانجی دارایی هەبێ یان ئامانجی سیاسی و سەربازی، زۆرجاریش تەنها مەبەست لێی دروستکردنی کاریگەری و دەرخستنی توانای ئەو لایەنەیە.

چەندین جۆر جەنگی زانیاری هێرشبەرانە بۆ ڕێکخستن و زیادکردنی بەهای زانیارییەکان، گرنگترینیان پرۆسەی سیخوڕیکردنە لەسەر لایەنی بەرگریکەر بۆ دزینی زانیاری نهێنی و ئامانج لێی زیاتر بازرگانیکرنە لە نێوان کۆمپانیاکان، یان ئامانجێکی ستراتیژی و سەربازییە لە نێوان دەوڵەتاندا. بە هۆی ئاسانی بڵاوبوونەوە و نەبوونی سانسۆر لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت ئەم پرۆسەیە بە شێوەیەکی بەرچاو تەشەنەی کردووە، وەك چەتەگەریی لەسەر داهێنانە تاکە کەسییەکان و دزینی بەرنامەکانی کۆمپیوتەرو دابەشکردنی بابەتی وێنەیی یان نووسراو بەبێ ڕەزامەندیی خاوەنە ڕەسەنەکەی. هەروەها (دزینی کەسێتیی یەکێکیتر) لە ریزی جەنگی زانیاری هێرشبەرانەدا پۆلێن دەکرێ، کە لایەنی هێرشبەر هەڵدەستێ بە بەکارهێنانی ناسنامەی کەسێکیتر بە مەبەستی ناوزڕاندنی ئەو کەسە، یاخود بۆ دزینی هەر شتێکی دیکەی پەیوەندیدار بەو کەسە. پرۆسەی جەنگی زانیارییەکانی تایبەت بە کەمکردنەوەی بەهاو سیستمی زانیارییەکانی بەرگریکەر، دوو شێوەی هەیە: یان تێکدان و پەکخستنی زانیارییە تایبەتییەکانی بەرگریکەرە، وەك (کۆمپیوتەر و سیستمەکانی پەیوەندی و گەیاندن)، یاخود دزین و شێواندنی زانیارییەکانە.

لە جەنگی زانیاری هێرشبەرانەدا، بەهاو سیستمی زانیارییەکان لەلای هێرشبەر بە شێوەیەکی گەورە پشت بە رادەی تواناکانی خودی هێرشبەر دەبەستێ بۆ گەیشتن بە سیستمی زانیارییەکانی بەرابەر، هەروا پشت بە گرنگی و بەهای ئەو زانیارییانەش دەبەستێ کە بۆ جەنگەکە دەیانخاتە گەڕ. بەشی دووەمی هێرشبەرانی جەنگی زانیارییەکان ئەوانەن کە هەوڵدەدەن زانیاری ورد و هەستیار لە ناوەندە بازرگانی و حکومییەکان بدزن و بەو ناوەندەیان بفرۆشنەوە کە پێویستییان بەو جۆرە زانیارییانەیە. بەشی سێیەمیش کە بە (هاکەرز) ناودەبرێن و لە جەنگی زانیارییدا مەبەستیان سەرکێشی و نیشاندانی توانای خۆیانە لە ئاست بەرابەرەکەیاندا. بەشی چوارەم ئەوانەن کە رکابەرایەتی یەکتر دەکەن و هەوڵدەدەن بۆ وەدەستهێنانی زانیاری ورد و هەستیار لەسەر یەکتر، هەریەکەشیان مەبەستیان ئەوەیە کێبڕکێی

ئەویتر بکەن و پێگەی باشتر بۆ خۆیان دروستبکەن. بەشی پێنجەم حکومەتی هەندێ لە دەوڵەتان دەگرێتەوە کە هەوڵدەدەن لەرێی جەنگی سیخوڕییەوە، زانیاری ستراتیژی و سەربازیی لەسەر وڵاتانی دیکە وەدەستبێنن.

**٢- جەنگی زانیاری بەرگریکارانە:**

هەموو شێوازەکانی خۆپاراستن و سنووردانان دەگرێتەوە بۆ بەرگرتن لە هەر هەوڵێکی تێکدانی سیستمی زانیارییەکانی لایەنی بەرگریکەر لەلایەن هێرشبەرەوە. ئەم شێوازەی خۆپاراستن بۆ سنووردارکردن یان کەمکردنەوەی مەترسییەکانی سەر ئامرازەکانی وەك کۆمپیوتەر و دەزگاکانی دیکەی بەرگریکەرە. پەرەسەندن و بڵاوبوونەوەی پیشەسازی تەکنیکی زانیارییەکان لەم ساڵانەی دواییدا بووە هۆی پەرەسەندن و بڵاوبوونەوەی زیاتری پیشەسازی و هۆیەکانی تێکدانی سیستمی زانیارییەکان. کەسێکی کەم ئەزموون لە رێگەی زۆربەی ماڵپەرەکانی ئینتەرنێتەوە دەتوانێ جۆرەها رێگەی تێکدان بدۆزێتەوە و هێرشی پێ ئەنجامبدات بۆ سەر ئەو کۆمپیوتەرانەی بە تۆڕی ئینتەرنێتەوە بەستراون و بە هۆیانەوە چەندین کاری تێکدان ئەنجام بدات. رێگەکانی تێکدانی سیستمی زانیارییەکان و زیانەکانیشیان جۆراوجۆرن، کاری تێکدان و دزینی زانیارییەکان و گۆڕینیان لە گرنگترین ئەو رێگە و شێوازانەن، هەندێ ئامرازی تێکدانی دیکەش هەڵدەستن بە زیانگەیاندن بە ئامێرەکانی ئەو سیستەمە. (لیوتار) لە بارەی ئەم سەردەمە دەڵێ: "زانین، وەك کاڵایەکی زانیاری بە گرنگترین بوارەکانی رکابەری جیهانی دادەنرێ لە پێناو وەدەستهێنانی هێزدا، دووریش نییە وڵاتانی جیهان بچێتە نێو جەنگێك لە پێناو کۆنترۆڵکردنی زانیاری وەکچۆن لە رابردوودا دەجەنگا لە پێناو کۆلۆنیالکردنی ناوچەکان و دەستکەوتنی ماددەی خاو و قۆستنەوەی".

## ناسنامە لە کۆمەڵگە زانیارییەکاندا:

کۆمەڵگەی زانیاری بە شێوەیەکی ئەندامی پەیوەستە بەهەردوو پرەنسیپی زانین و ئازادییەوە، کۆمەڵگەیەکی زانیاری لە دەرەوەی سیستمی دیموکراتی کە مافی هاوڵاتیبوون فەراهەم دەکات وێنا ناکرێن، ئەمە پێویستی بە ناسنامەییەکە بڕوای بە دیموکراتی هەبێ و لە پرەنسیپەکانی تێر نەبێ، چونکە ئازادی و گفتوگۆ جیاوازی بەهاگەلێکن، ناکرێ لە کۆمەڵگەی زانیاری جودا بکرێنەوە. کۆمەڵگەیەکی زانیاریش وێنا ناکەین لە دەرەوەی پێکهاتەی سەرەکی بێ کە مافی دەستپێشخەری و گەیشتن بە زانیاری بۆ تاکەکان دەستەبەر بکات. ئەم پێکهاتە



بنەڕەتییە بە مەرجێ دەزانێ کە سیستمێکی پەروەردەیی و توێژینەوەیی پێشکەوتوو پەیوەست بە تۆڕی زانیارییە جیهانییەکان، هەروەها کوولتورێکی دیجیتاڵی کە رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و دەزگا تایبەت و گشتییەکان تیایدا بەشداربن، هەبێ، چونکە ئاراستەی ستراتیژی کۆمەڵگەی زانیاری لە بنەڕەتدا خۆی لە پێکهێنانی کوولتوری تاك و رێکخستنی فەزای گشتی لەسەر هەردوو بیرۆکەی ئازادی و مەعریفە، دەبینێتەوە.

ئەم شۆڕشە کوولتورییە لە رەفتار و چەمکەکان پێویست بە بڕینی ناسنامەی کلاسیکی دەکات بۆ ناسنامەیەکی نوێ کە بتوانێ پێکەوە گونجان لە نێوان چەسپاوە کەلەپوورییەکان و مێشکی ئینتەرنێتدا دروستبکات. چەسپاوەکان بەشێکن لە ئێستاو، ئێستا تاکە زەمەنە کە خاوەنین بۆ ئەوەی تیایدا بژین، ناسنامەیش لەبەردەم بەرەنگاربوونەوەکانی کۆمەڵگەی زانیاریدا، بەشێکە لە پرۆژەی نوێکاری گشتگیر، نەك تەنیا بەمانا هزرییەکەی، بەڵکو بەمانا مەدەنی دەزگایی مەعریفەیەکەی کە بەهاکانی پەروەردە و رەفتار و رێکخستنی سیاسی و فەزای گشتی دەگرێتەوە. شۆڕشی ژمارەی ئەمڕۆ پەیوەست نییە بە پرسیار لە پەیوەندی بیرکردنەوەی رۆژئاوایی بە کۆمەڵگەی زانیارییەوە، بەڵکو پەیوەستە بە دۆزینەوەی شێوازە لێکۆڵراوەکانی چوونە نێو ئەم شۆڕشە کە نەخشەی جیهانی گۆڕی و کردی بە گوندێك، بەجۆرێك هەڕەشە لە کوولتورەکان بکات یان بە توانەوە یاخود بە چوونەیەك ئەگەر پێگەی خۆی لە ئابووری مەعریفە و شۆڕشی بەرهەمهێنانی دیجیتاڵی داگیر نەکات. ئەمڕۆ ١٢٪ی دانیشتوانی جیهان دەسەڵاتیان بەسەر زیاتر لە ٩٠٪ی قەبارەی بازرگانی جیهانیدا (ئەمەریکا، ژاپۆن، ئەوروپا) گرتووە، کە تەنها ژاپۆن کۆنترۆڵی ٤٤٪ی هەناردەکانی جیهانی کردووە، ئەم واقیعە تەرجەمەی شۆڕشی زانیاری و گەیاندن و تەقاندنەوەی مەعریفییە و واقیعێکە هەڕەشەی بە شێوازکردنی کوولتوری دەکات. ناسنامەی کلاسیکی توانای رووبەڕووبوونەوەی ئەم واقیعەی نییە، هەروەها وڵاتە کلاسیکییەکانیش توانای بەرەنگاربوونەوەی جهانگیریەتی نییە.

ئەگەر بڕوانینە نهێنی ئەو سەرکەوتنەی کە وڵاتانی پیشەسازی وەدەستیان هێناوە، دەبینین گرنگترین پێکهاتە لە کارلێکی گەشەپێداندا مرۆڤی زانایە. کارلێکی ئەمڕۆ لە نێوان هێزو مەعریفەیە، کۆمەڵگەی زانا، کۆمەڵگەیەکی بەهێز دەبێ، چیتر ژمارەی دانیشتوان و زۆری داهات و هێزی سوپا کاریگەری ئەوتۆی نەما لە دیاریکردنی سەرچاوە راستەقینەییەکانی هێز. مێشکە داهێنانکارەکان و کۆنترۆڵکەری تەکنیکەکانی زانیاری و گەیاندن ئەمڕۆ لەسەر

ئاراستە سیاسی و ئابووری و ناوەندەکانی بڕیار و هەژموونداا کاریگەر دەبن. بۆمان دەردەکەوێ کە پەیوەندی مشتومڕی نێوان ناسنامە و کۆمەڵەی زانیاری کە پەیوەندییەکی کاریگەر و قووڵە، لەوانەیە سەلبی بێ یان ئیجابی، بەپێی توانای کوولتورەکە بۆ تێکهەڵکێشی ناسنامەکە لە بزاڤی مێژوو لەلایەك و توانای مێشکی سیاسی بە بەرپرسیارێتی بڕیاردان لەسەر تاوتوێکردنی هەڵبژاردنە نوێیەکان لە سیستەمی هزر و ڕەفتارو دەزگاکاندا. جیاکردنەوەی ڕاستەقینە لە نێوان ناسنامە و شۆڕشی زانیارییەکاندا، کوولتوری دیموکراتییە بەمانا مەدەنییەکەی کە هاووڵاتای نوێگەری و هاووڵاتێتی ئازادی زانایە.

میدیا کرۆکی کۆمەڵگەی زانیارییە کە نەوەی دیموکراتییە، کە مەرجێکە لە مەرجەکانی ئازادی و هاووڵاتیبون و دەروازەی ڕاستەقینە بۆ برەودانی بە کردەیی دیموکراتی و کۆمەڵەی دیالۆگ و پەیوەندی بەستوودا، سەرەڕای ئەوەی کە کارلێکی گەیاندنی نابێتە هۆی دیموکراتی، بەڵام ڕۆڵی ناسنامەی کوولتوری نوێ خولقاندنی ئەم کارلێکەیە بۆ ئەوەی کۆمەڵگەی زانیاری تەنیا ئەفسانەیەکی تەکنیکی کوولتوری نوێ نەبێ لەنێو دەستی کەمینەیەك کە ڕێگا ئەلیکترۆنییەکان بەرەو میدیا بەکاردێنن بۆ هەرمێندان بە بەهاو پرۆژە بازرگانی یان سیاسییەکان. بڵاوبوونەوەی ئامرازەکانی گەیاندن هاوکات بوو لەگەڵ دوو ڕەوتی جیاواز لە سیستەمی هزری نەتەوایەتی، ڕەوتێك بانگەواز بۆ جۆرایەتی خولقێنەر و کوولتوری جیاوازی و گفتوگۆی شارستانییەتییەکان و کۆتایی عەقلانیەتی گشتگیردەکات و ڕەوتێکی لوتکەگیری تاکلایەنانە کە جیهانگیریی سەرمایەداری خستوویەتییە گەڕوو، لەمیانەی کوولتوری تاك هزرو یەکبوونی زۆرە ملێیانە تێپەڕی، لەژێر بەیداخی دیموکراتی ڕۆژئاوا. مۆرکی دەستەبژێری بۆ تەکنۆلۆژیای گەیاندن و میدیا خێرا بۆ مۆرکی جەماوەری دەگۆڕێ، واتە بەرەو پێکهاتەکانی ناسنامەی کلاسیکی ئاراستە دەگرێ، کە هەڵگری ناوەڕۆکی بەهادار بێ کە مەرج نییە ئامادەباش بێ بۆ مامەڵەکردن لەگەڵی بە تێڕوانینێکی کوولتوری ڕەخنەگرانەی کراوەوە، کە وا دەکات لەو توێژە کۆمەڵگەییە فراوانە تەنها بازاڕێکی بەکاربردن بێ بۆ ناوەڕۆککگەلێك کە بەشدار نابێ لە بەرهەمهێنان و ئاراستەکردنیدا. ئەم هۆشدارییە لە مەترسییەکانی جیهانگیریەتی زانیاری بۆ سەر ناسنامە، لەلایەن خودی بیرمەندانی ڕۆژئاواوە سەرچاوەی گرت بۆ دانانی ئاستێك بۆ ئەو گەشبینییە زیاد لە پێویستەی کە سەرانسەری جیهانی گرتۆتەوە.

ئایدۆلۆژیای ئەمڕۆ کوولتورە، ناسنامەی کوولتوریش تاکە قەڵغانە کە ماوەتەوە لەبەردەم کشانی جیهانگیرتییدا. کۆتایی ئایدۆلۆژیا کە (دانیل بێل) باسی لێوە دەکات، لە دایکبوونی



کۆمەڵگەیەکی پاش پیشەسازی ڕادەگەیەنێ، کە لەسەر تەکنۆلۆژیای زیرەکی و پیشەسازی میدیا دادەمەزرێ، کە سەبارەت بە ڕۆژئاوا کۆتایی ململانێکەیەتی لەگەڵ مارکسییەت و هەڵوەشانەوەی سیستەمی سۆسیالیستییە، بەڵام ئایا مانایەك دەبەخشێ بۆ ئەو وڵاتانەی کە نەچوونەتە نێو کۆمەڵگەی پیشەسازی و ململانێی هەژموونی نییە لەسەر جیهان لەگەڵ هزری گشتگیردا؟ ئایا شتێك دەگەیەنێ بۆ ئەو کۆمەڵگایانەی کە بەسەر داهێنانە زانیاری و پەیوەندییەکان زاڵ نەبوونە و هێشتا پەیوەستە بە چەسپاوەکانی ناسنامەکەی؟ ئەمە ئەو مەترسییەیە کە ئایدۆلۆژیای جیهانگیری و ئایدۆلۆژیای بەربڵاو کە بە ئامێرە بیستنی بینینییەکان کار دەکات و زانیارییە ژمارەییەکان هێزی مەرجی ئایدۆلۆژی هەیە بۆ وەرگر بەجۆرێك ملکەچی لۆژیکی بازرگانی دەبێ، کە مانای دۆڕانی کوولتورو پەرتوبڵاوکردنی ناسنامە دەگەیەنێ. لێرەوە ناسنامەی خاوەن توانای خۆڕاگر و خستنەسەر لە کۆمەڵگەی زانیاری، ئەو ناسنامەیە ڕەخنەگرەیە کە بە چەسپاوە کوولتوریی و نیشتمانییەکەی تێرە.

هەڵقولانی زانیارییەکان مێشکێکی ئابووری کۆنترۆڵی دەکات دژە لەگەڵ ڕەوتی ڕەخنەگرانە، هەروەها عەقڵی سیاسیش دژە لەگەڵ ڕەوتی ڕەخنەگرانە. گوندی ئەلیکترۆنیش کە مێشکی جیهانگیری هەوڵدەدا بیسەپێنێ، جیاوازی لە نێوان هەژاران و دەوڵەمەندەکان قووڵتر دەکات، لە نێوان خێراو لەسەرخۆکان، لە نێوان بەرهەمهێنەرانی مەعریفەو بەکاربەرانیدا. وەك دیارە ململانێی دواڕۆژ ئاراستە کراوە بۆ کۆنترۆڵکردنی کۆمپیوتەر و تەلەفزیۆن و تەلەفۆن کە دەکرێ لەسەر ئینتەرنێت بتوێنرێتەوە، بۆیە لە توانای ئەو هێزانەدایە کۆنترۆڵی تەکنیکەکانی ئینتەرنێت دەکەن، بەپێی تیۆری داروین "مانەوە بۆ چاکترین و بەهێزترینە" لە دواڕۆژدا کۆنترۆڵی جیهان بکەن.

## تەکنۆلۆژیای زانیاری:

تەکنۆلۆژیای زانیاری بریتییە لە سیستمێکی سێ ڕەهەندی، پێکدێت لە ئامێر (پێکهاتە مادەییەکانی کۆمپیوتەر و ئەو کەرەستانەی کە لەگەڵێدان) و بەرنامەکان کە (بەشە نا مادەییەکەی کۆمپیوتەر) و تۆڕەکان (کەرەستەی بەرنامەکان و ئامێری دیجیتاڵی جۆراوجۆری دیکە). بەمانایەکیتر چەمکی تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان ئاماژە بە هەموو تەکنۆلۆژیاکانی لەخۆگرتن و چارەسەرکردن و هەڵگرتن و گەڕاندنەوە و نوێکردنەوە و بەرهەمهێنانی زانیارییەکان و دابەشکردنی یان پێشکەشکردنی بۆ خەڵکی دیکە بە شێوە و وێنە و شێوازی

هێمایی جۆراوجۆر. تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان چوارچێوەیەکی فراوان لەخۆ دەگرێ لە تەکنۆلۆژیاو جێبەجێکردن و سیستەمەکانی کۆمپیوتەر و تۆڕەکان و سیستەمە زانیارییە کۆمپیوتەرکراوەکان، لەوانەش سیستەمەکانی پشتگیریکردنی کارگێڕی لە چالاکی و کرداری و ئەرکەکانیداو، لە سەرووی هەموویانەوە ئەرکی بڕیاردانی بڕیارە کارگێڕییەکان. لەم چوارچێوەیەدا لە چەمکی تەکنۆلۆژیای زانیارییەکاندا توخمی زانینی (زانینی چۆنێتی) و توخمی کارگێڕی بە مانای تەکنیکی کۆمپیوتەریی هەیە. سەرەڕای ئەوەش تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی و کوولتوری و مرۆیی لەخۆدەگرێ، کە ئەم ڕەهەندانەش لەو لێکۆڵینەوانەی کە تەنها ئاراستەیەکی زانستییان گرتۆتەبەر زۆر پشتگوێ خراون، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم تەکنۆلۆژیایە تەنها لە چوارچێوەیەکی کۆمەڵایەتی و کوولتوری ئاڵۆزدا نەبێ کار ناکات.

پێشتر ئاو و هەوا و خۆراك لە مەرجەکانی مانەوەی مرۆڤ بوون و بە ڕووبەڕووبوونەوەی گۆڕاوە گشتییەکان چەمکی پەیوەندی کردنیشی هاتە سەر، ئیتر توانای کۆمەڵگە بەسترایەوە بە توانای تۆڕی پەیوەندییەکانەوە کە شا دەمارەکەی پێکدێنێ و دواتر بنکەی ژێرخانیی بە مەبەستی پێکهێنانی کۆمەڵەی زانیاری سەرەڕای ئەوەی بەس نییە بۆ ئەکتیڤکرنی گەشەپێدان بە لەبەرچاو گرتنی مەرجەکانی مانەوە و مرۆڤی ئاسایی یاریزانی گەورەترینە لە کۆمەڵەی زانیاری و پشکی شێری بەردەکەوێ لە دەسکەوتنی زانیاریداو هاتنە نێو ژیانی چڕی زانیارییە ئەلیکترۆنییەکانەوە بۆ ئەوەی خەونی جیهانێکی بێ کاغەز وەدی بێ. پەرتووك بارگەی بەرەو تۆڕی ئینتەرنێت پێچایەوە و لەو تۆڕەدا خۆی نیشاندەدات، بەمەش بە ئاسانی هەڵدەگیرێ و دەگوازرێتەوە و دەکرێ زانیارییەکانی نێوی زیاتر بکرێ یان هەموار بکرێ، یان کۆپی بکرێ، یاخود وەربگێڕدرێ و خۆگونجاندن لەگەڵ ئارەزووی خوێنەر، هەروەها ئاگاداربوون لە دوایین پێشهاتی زانستی و پێکەوە گرێدانی دەق و دەنگ و وێنە و نیشاندانی وێنەی ڤیدیۆیی، بەمەش ڕوونتر و ڕێژەیەکی زۆرتریش لە خەڵك سوودی لێ دەبینن.

ئەو تەکنۆلۆژیای حەسانەوەیەکە، کە نەوەکانی پێشتر لێی بێبەشبوون، لە چوارچێوەی پرۆژەیەکی بیستنی- بینینی کارلێککرووداو داپۆشراو بە بنەماگەلی بەیاناتی ئینسکلۆپیدیا و فەرهەنگ و بەڵگە و بانکەکانی زانیاری چیمان بوێ و بۆ بگونجێ هەڵیدەبژێرین و زانیارییەکانیش بەردەوام نوێ دەبنەوە، ئەمەش وادەکات لە ساتی زانیاری بەرهەمهاتوودا بژین. ئێمە لە دەروازەی کودەتایەکی نوێی زانیاریداین، کە زانیاری مرۆیی پێشتر لاواز بوو، دە ساڵی ڕابردووش ئەوەندە زانیاری بەخشیوە کە بارتەقای هەموو ئەو زانیارییانەیە کە مێژوو



بە درێژایی پێنج هەزار ساڵی ڕابردووی خۆی بەخشیویەتی، ئەمە سەردەمی کۆنترۆڵکردنی سروشتە بە هۆی تەکنیکێتی زانیارییەکان لە ڕووی خێرایی و ئاستەوە.

هەمووان لەسەر ئەوە کۆکن کە پەیوەندییەکی زۆر توندوتۆڵ هەیە لە نێوان سەرکەوتن لە وەدیهێنانی ڕێژەی بەرز لە گەشەپێدان و شۆڕشی زانیاری یاخود دیجیتاڵی و ئەمە بۆتە پێویستییەکی هەر دەوڵەتێك کە لە خەمی پێشکەوتنی کۆمەڵگەکەیدا بێ، بەڵام چۆن دەوڵەتێکی تازە پێگەیشتوو دەتوانێ خۆی بگەیەنێتە کاروانی ئەو شۆڕشە هەنگاوە خێرایە؟ ئەگەر بە ئەزموونی ئەو وڵاتانە بچینەوە و ئەو ڕێگەیانەی کە گرتوویانەتەبەر، ئەوا خۆمان لەبەردەم سێ هەنگاودا دەبینینەوە، یەکەمیان هەوڵدان بۆ بەکارهێنانی بەرفراوانانەی جێبەجێکارییەکانی شۆڕشی زانیارییەکان، دووەمیان جەختکردنەوە لەسەر توێژینەوەکان و خەرجکردنی پارەیەکی یەکجار زۆر لەمبارەیەوە. سێیەمیش، بەکارهێنانی بواری تەکنیکی لە بواری فێرکردن و مەشقکاری هەروەك لە وڵاتانی دونیا پەیڕەو دەکرێ، کە مەعریفە و پێشکەوتن بە شێوەیەکی بەرفراوان بڵاو دەکرێتەوە.

شۆڕشی تەکنۆلۆژیای زانیاری و پەیوەندییەکان توانایەکی راستەقینە پێشکەشدەکات، لەگەڵ ئەوەشدا مەترسی گۆڕان لە زۆر ناوچەی جیهان زیاد دەکات، بۆئەوەی ئەم دێوزمەیە لابدەین پێویستە سیاسەتەکان پەرە پێ بدەین و دەزگاکان گەشە پێ بدەین کە بوار بە هەمووان دەدات سوودی لێ ببینن، ئەمەش خۆبەخۆ نابێ بەڵکو:

١- سیماکانی کۆمەڵگەی زانیاری دووپاتی دەکاتەوە کە زریانە گەورەکە نەتەوەکان دەگرێتەوە و هەموو بنەما فیکری و بیروباوەڕی و کوولتورییەکان لە ڕەگەوە هەڵدەتەکێنێ و دەیکاتە ئامرازێکی ئەلیکترۆنی ئەوەی ئەو وڵاتانە بەرهەمی بێنن بە کاری دێنێ. ئەمە وامان لێدەکات ڕووبەڕووی ئەم زریانە ببینەوە بە پڕچەکبوونمان بە زانیاری کە لە سەر بنەمای هۆشیارییەکی دروست و سوودێکی پێگەیشتووانە لە ئامرازەکانی، لە پێناو بڵاوکرنەوەی زانیاری کە بە خێر و خۆشی مرۆڤایەتی بشکێتەوە.

٢- پێویستە جیهانی و لۆکاڵیانە بیر بکەینەوە بەهەمان شێوەش ڕەفتار بکەین.

٣- بڵاوبوونەوەی تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان و توانەوە لە بۆتەی کۆمەڵایەتی و نوێکردنەوەی زانیارییەکان و ڕێکخستن و ئەرشیفکردنی، وادەکات لە زانین بنەمایەك بێ کە فاکتەرەکانی پێکەوە بەستنی کۆمەڵایەتی دیار بخات و نا ئامادەیی زانین و لێڵی زانیارییەکان بەرپرس دەبن لە هەڵوەشانەوە لە هەر کۆمەڵگەیەکدا، بە پێچەوانەوە بڵاوکردنەوەی زانین و

فەراهەمکرنی زانیاری کۆمەڵگە ئەکتیڤ دەکات و توانایەکی پێ دەدات دژی هەر داگیرکارییەکی کوولتوری.

پەرەسەندنی تەکنۆلۆژیا کاریگەری هەیە لەسەر پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و پێکداچوون و ئاڵۆزییەکانیان، لە دەستپێکردنی شۆڕشی پیشەسازییەوە و جێگرتنەوەی هێزی بازوو لەلایەن هێزی ژێرییەوە. بە هۆی بڵاوبوونەوەی تێکنۆلۆژییەکانی پەخشکردن و وەرگرتنی زانیارییەکانەوە، ناتوانرێ بگوترێ کە هیچ لایەنێك لەم جیهانەدا دەتوانێ گۆشەگیر بێ. دیاردەی جهانگیریەتی پەیوەندییەکی توندوتۆڵی هەیە بە شۆڕشی پیشەسازی و تێکنۆلۆژییەوە، ئەم دوو شۆڕشە توانییان کرداری گەیاندن زیاد بکەن و بازرگانی نێودەوڵەتی چالاك بکەن و وایان لێهاتووە کۆنترۆڵی ئامرازەکانی جێبەجێکردنی سیاسەتی دەرەوەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان دەکەن.

هەردوو راوێژکاری ئەمەریکی (جۆزێف نای) و (ویلیام ئۆنزا) پێیانوایە "ئەو وڵاتەی لە شۆڕشی زانیارییەکاندا یەکەم بێ ئەوا بەهێزترین دەبێ، ئەگەر لە رابردوودا باڵادەستی لە بواری چەکی ناوەکیدا مەرج بووە بۆ سەرکردایەتیکردنی هاوپەیمانییەتییەکان، ئەوا لەم سەردەمەدا باڵادەستی لە بواری زانیارییەکاندا دەتوانێ ئەم رۆڵە بگێڕێ، زانیارییەکان فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆرییەتی نوێی جیهانی دەکەن، بۆیە پلاندانەران و شارەزا ستراتیژییەکانی ئەمەریکا لەو بڕوایەدان کە گرنگترین گۆڕەپانەکانی جەنگی داهاتوو تێکنۆلۆژیای گەیاندن دەبێ".

**بۆ سوود بینین لە تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان دەتوانرێ چەند شێوازە هەنگاوێك بگیرێتە بەر:**

١- بەهێزکردنی رێکخراوەکانی تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان و پشتگیریکردنیان و دابینکردنی پێداویستی بۆیان و مەشقپێکردنی بەردەوام بۆ کادرەکانی لە پێناو بونیاتنانی توانایەکی تەکنەلۆژی کارا.

٢- دروستکردنی پەیوەندییەکی بەهێز لە نێوان سیاسەتە پەروەردەیی و زانستییەکان و تەکنۆلۆژیای زانیارییەکاندا، بە مەبەستی زیاد فێربوونی زانست و ئامراز و سیستمەکانی، لە پێناو گەرەنتیکردنی گەشەسەندنێکی زانستی و تەکنەلۆژی کە گونجاو بێ لەگەڵ رەوش و پێداویستییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان و ببێتە هۆی دروستکردنی گۆڕانکارییەکی پیشەیی لە سیستمی فێرکردندا، هەروەها سیستمی فێرکردن بە شێوەیەکی ئەرکییانە بە پلانەکانی گەشەپێدانەوە ببەستێتەوە.



٣- دروستکردنی هاوسەنگی لە نێوان گەشەپێدانی خۆیی بۆ تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان و هاوردنی ئەم تەکنۆلۆژیایە بە گوێرەی ستراتیژیەتێکی روون و دیاریکراو، کە جێبەجێکردنی پرۆژە بگونجێنێ لەگەڵ بونیاتنانی توانای زانستی و تەکنەلۆژی دوارۆژدا.

٤- هێنانە ئارای بارودۆخی گونجاو بۆ پێشکەوتنی زانستی بەگشتی و بەربەستدانان بۆ کۆچکردنی تواناکان لە بواری تەکنۆلۆژیای زانیارییەکاندا، لە میانەی بەهێزکردن و چاککردنی رەوشی مووچەیی و کارگێڕی و یاسایی و کۆمەڵایەتی کادرە زانستییەکان، لە توێژەرو هونەرییەکان و دروستکردنی توانا و رەوشی یارمەتیدەر بۆ گەشەسەندنی شارەزایی و پسپۆری.

٥- بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری ئەلیکترۆنی لە کۆمەڵگەدا.

٦- تەواوکردنی پەرەپێدانی ژێرخانی تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان و بە هێزکردنی رۆڵی لە هەموو کەناڵە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتییەکان بۆ سوود لێ بینینیان.

٧- گرنگترین هۆکارەکانی گەشەسەندنی کەرتی تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان بریتییە لە گەشەپێدانی سەرچاوە مرۆییەکان، ئەویش بە هەوڵی رێکوپێك بە مەبەستی زیادکردنی دەسترەنگینی و توانا نیشتیمانییەکان و بەرزکردنەوەی ئاستیان و گەشەپێدانی گیانی داهێنان و دەستپێشخەریکردن تیایدا، تا وای لێدێ بەرە بەرە لە کۆمەڵگەکاندا کۆمەڵە پیشەیی و تەکنەلۆژی و زانستییە پسپۆرەکان گەشە دەسێنن و لە بواری پسپۆری خۆیاندا توانادار دەبن و بەراستی تەکنۆلۆژیا بۆ خزمەتکردنی ئامانج و مەبەست و پێداویستییەکانی کۆمەڵگەکەیان وەردەگرن و بەکاردێنن.

٨- گەشەسەندنی کەرتی تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان لە خانەی یەکەمدا، بریتییە لە پرۆسەیەکی گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی و بیریی، تەنها هێنان و بەکارهێنانی ئامێرە تێکنەلۆژییەکان نییە، بەڵکو پێویستی بە عەقڵێکی نوێ و بیرێکی داهێنەر و دەزگاگەلێکی کۆمەڵایەتی هەیە کە لێهاتوو و کاریگەر بن.

لە پشت شۆڕشی دیجیتاڵییەوە، کاریگەرییەکی قووڵ لەسەر کتێبخانە و دەزگاکانی بڵاوکردنەوە هەیە، کە بریتییە لە کۆڵەکەکانی کتێبی دیجیتاڵی سێیەم، لە دەیەی کۆتایی بیستدا دەرکەوتنی کتێبخانەی ئینتەرنێتی و پێشرەوی کتێبی ئەلیکترۆنی بەخۆیەوە بینی، واتە ئەو سیدییەی دەرفەتی هەڵگرتنی دەق و خوێندنەوە دەدات، کتێبخانەکانی (وێب) هێدی هێدی زیادیکرد، لە کاتێکدا بەپێی بۆچوونی چاودێران گوایە ئەزموونی کتێبی ئەلیکترۆنی

تووشی شکست هاتووە، لەبەر ئەوە بۆ ماوەیەك جیهانی کتێبی کاغەز بەرەو سەرەوە هەڵکشا. پاش پێنج ساڵ پێگەی کتێبخانە ئەلیکترۆنییەکان پتەوتر بوو، ئەویش لەگەڵ سەرهەڵدانی کتێبخانەکانی ئەمازۆن و گۆگڵ و مایکرۆسۆفت و چەندەهای تر لە کتێبخانەی ئەلیکترۆنی زەبەلاح، بازاڕی کتێبی کاغەزی تووشی قەیران بووە. سەرچاوەی هەڕەشەی کتێبی کاغەز، بەتایبەتی کتێبی گیرفان لەمڕۆدا بریتییە لە مەرەکەبی ئەلیکترۆنی و کتێبی ئەلیکترۆنی. کتێبی ئەلیکترۆنی نوێ هەڵدەگیرێ و دەنووسرێتەوە، ناوەڕۆکەکەی چاك دەکرێ و دەسڕێتەوە و کاری زۆر و هەمەجۆر دەپارێزێ، مەرەکەبی ئەلیکترۆنی تەکنۆلۆژیایەکە بۆ نیشاندان یان چاپکردن تێیدا چەند تیوبێکی بچووکی رەنگا و رەنگی تێدا بەکاردێ، پیتەکان لەسەر کاغەزی ئەلیکترۆنی چاپ دەکات ئەویش پاش ئەوەی بە وزەی کارەبا دەبەسترێتەوە، کاغەزی ئەلیکترۆنی لە شاشەیەکی تەختی لینج دەچێ، رووناکی پەخش دەکاتەوە، زانایان هەوڵی کەمکردنەوەی بریقەی کاغەزی ئەلیکترۆنی دەدەن تاکو لە کاغەزی ئاسایی نزیك ببێتەوە، هەروەها زیاتر نەرم بێ تاکو بپیچرێتەوە قەد بکرێ، چاوەڕێ دەکرێ ئەم ماددە ئەلیکترۆنییە لینجە وابکات کتێب لابەرێ و دەستبەرداری نێوەندە مادییەکانی وەك کاغەز بین. دەزگاکانی چاپی ئەوروپی بەنیازن ئەم سیستمە ئەلیکترۆنییە نوێیە بەکاربهێنن، دەستیانکردووە بەگەڕان بە دوای شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ خوێنەردا، هەروەها ئاڵوگۆڕی دانەی ئەلیکترۆنی لەبازاڕ و کەناڵەکانی بازاڕەوە.

لێکۆڵەرەوان لەو باوەڕەدان کە شارستانییەتێکی نوێ سەرهەڵدەدات کە بنەما و تایبەتمەندی خۆی هەیە و دەرەنجامی کۆمەڵگەی زانیارییە و بە دیارترین سیماکانی لە شارستانێتییەکانی پێش خۆی جیا دەکرێتەوە، ئەویش سیمای بەجیهانیبوون و پەیوەستبوونییەتی بە هەموو ئەو کۆمەڵگەیانەی کە شۆڕشی زانیارییەکان دەیانگرێتەوە و دەبنە بەشێك لە کۆمەڵگەی زانیارییەکان، گەرچی کاتێك سەیری تێڕوانین و بۆچوون و بڕیاری پسپۆرە لایەنگرەکانی کۆمەڵگەی زانیارییەکان دەکەین، تاڕادەیەك روخساری گشتی ئەو شارستانییەتە چاوەڕوانکراوەمان لا گەڵاڵە دەبێ، بەڵام وێناکردنی راستەقینەی کارێکی ئەستەمە و هەندێ لە توێژەران گەیشتوونەتە ئەو راستییەی کە ئەو نموونە شارستانییە نوێیە، چەند کۆڵەکەیەکی دیاریکراوی هەیە کە دەکرێ لە چەند خاڵێکی سەرەکیدا پۆلێن بکرێ وەك:

١- دەرکەوتنی هۆشیاری جیهانی و قووڵکردنەوەی شۆڕشی گەیاندن و رۆشنبیری بە گەیاندن.

٢- ئاشکرابوون و دەرکەوتنی هۆشیاری گەردوونی ژینگە.



٣- دەرکەوتنی چەند بەهایەکی کۆمەڵایەتی نوێ، کە بیرۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ پۆست مۆدێرنیزم، وەك گواستنەوە لە جەختکردن لەسەر بەها ماددییەکان بۆ جەختکردن لەسەر ژینگەی نەبڕاوەو گۆڕان لە دەسەڵاتی دامەزراوییە بۆ دەسەڵاتی تاکەکەسی.

٤- گرنگیدان بە بەها رۆحییەکان کە شێوازگەلێکی جۆراوجۆر وەردەگرێ و مەرج نییە جێبەجێکردنی رێسای ئایینە ناسراوەکان بێ.

٥- دەرکەوتنی چەند شێوازێکی ژیان، کە شایەنی درێژەکێشان بێ و فاکتەرە دەرەکی و ناوەکییەکان کۆ بکاتەوە، واتە تەنها گرنگی بە شتە ماددییەکان نادات و ئامانجی پراکتیزەکردنی ژیانێکی هاوسەنگە لەگەڵ گۆڕانکاری لە بواری کارکردن و خۆراك و پەیوەندییە مرۆییەکاندا، هەروەکو ئەمڕۆ چەندین ئاماژەی ئەو گۆڕانکاریانەی سەرەوە ئاشکرا بوون.

لە کۆمەڵگەی زانیارییەکاندا ئەو وڵاتە دەیباتەوە و پێشدەکەوێ کە بتوانێ زۆرترین زانیاری لە هەموو بوارەکاندا دەستەبەر بکات، جەنگی گەشەی زانیاری تەکنەلۆژی لە ئاستێکدایە و لە رکابەری و پێشبڕکێی وەهادایە، کە لەوانەیە لە چاوتروکانێکی نائاگایانەدا زیانێکی ماددی زۆر تووشی وڵاتێکی پێشکەوتوو ببێ، لەو کۆمەڵگەیەدا دەزگا و ئیدارە و رێکخراوە حکوومی و ناحکوومییەکان پێویستە کەسانی زۆر پسپۆڕو شارەزا بەڕێوەیان ببات، بەرپرسە سەرکەوتووەکان دەبێ لەم کۆمەڵگەیەدا دیدێکی جیهانییان لە بواری کارەکانیاندا هەبێ، پێشبڕکێکانی ئەم چەرخە سەرەڕای جووڵە ئینتەرنێتییەکان، سنوورە نێودەوڵەتییەکانیشیان بەزاندووە و زۆر بە خێرایی دەگەنە شوێنە دوور و جیاوازەکانی سەر گۆی زەوی.

## باش و خراپی تەکنۆلۆژیای زانیاری:

کاریگەرییە باشەکانی شۆڕشی زانیاری لەسەر مرۆڤایەتی مەزنە و زەحمەتە بژمێردرێ، مرۆڤایەتی تاموچێژ لە باشی و دەسکەوتەکانی دەبینێ کە تۆڕی ئینتەرنێت کورتی دەکاتەوە لەوەی پێشکەشی دەکات:

- لە بواری زانستی، ئینتەرنێت هاوکار بوو بۆ دەوڵەمەندکردنی کاری ئەکادیمی زانکۆیی و ئاسۆگەلی نوێی کردەوە لەبەردەم توێژینەوەی زانستی لە سەرجەم لقەکانی. ئینتەرنێت وەکچۆن یارمەتی رێکخراو و حکوومەت و رێکخراوەکانی سەر بە ئەو دەدات، هاوکات یارمەتی هێزە ئۆپوزسیۆنەکان دەدات لە بەیەکگەیاندن و خۆ رێکخستنەوەیان.

– ماددەی دەوڵەمەندی پێشکەشکرد و زانیاری لە زۆر بواری ژیان فەراهەم کرد وەك: رابواردن، گەشتوگوزار، ئەمە وێرای مونتەدای گفتوگۆی ئەلیکترۆنی کە هاوکارە لە هاندانی کارلێك و بەیەکگەیاندنی نێوان مرۆڤەکان.

– شۆڕشی زانیاری کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر چالاکی بازرگانی بۆ سەرجەم کۆمپانیاو دەزگا بازرگانییەکان، بەمەش بازرگانی ئەلیکترۆنی گەشەی کرد بە پلە یەك پاڵی بە پسپۆڕانەوە نا بیر لە دەرکردنی دراوێکی ئەلیکترۆنی بکەنەوە، بەمەش شێوەیەکی نوێ لە شێوەکانی چالاکی ئابووری دێتە ئاراوە.

– رۆژنامەگەری ئەلیکترۆنی لە سەردەمی زانیارییەکاندا رۆڵێکی گرنگ دەگێڕێ، لە بڵاوکردنەوەی زانیارییەکان و رۆشنکردنەوەی بیرو بە یەکگەیاندن لە نێوان مرۆڤەکاندا.

– تۆڕی ئینتەرنێت هاوکارە لە هەرمێن بەخشین و فرۆشتنی هەموو جۆرە کتێبێك و یارمەتی خستنەڕووی ئەو ئەدەبیاتە دەدات کە حکوومەتە ستەمکارەکان قەدەغەیان کردووە.

**بەڵام کاریگەرییە خراپەکانی تەکنۆلۆژیای زانیاری بریتییە لە:**

– بەردەوامبوونی جیاوازی کۆمەڵایەتی و مەعریفی لە نێوان خەڵك جا لەناو یەك دەوڵەتدا بێ یان لە نێوان وڵاتاندا و بوونی خەڵکی پەراوێزخراوی نەخوێندەوار لە جیهانی شۆڕشی زانیارییەکاندا.

– واقیعی گریمانەیی، واتە ئەو واقیعەی کە لەسەر تۆڕی جاڵجاڵۆکەیی هەیە هێنایە نێو ژیانی مرۆڤ، ئەم واقیعە گریمانەییە بوار بە سوودمەندان و وەبەرهێنەرانی ئەم شۆڕشە دەدات یاری بە راستییەکان بکەن و کار بکەنە سەر لاوازەکان، لەو وڵات و تاکانەی کە خاوەن بڕێکی کەمتر لە زانیارین.

– کاریگەری تۆڕی ئینتەرنێت لەسەر منداڵان و تەنانەت لەسەر گەورەکانیش، دانیشتن بۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت و ئەو بڕە زۆرەی زانیاری کە دەستیان دەکەوێ، فشارێکی دەروونی و دەمارییان لەسەر دروستدەکات و نامۆییان زیاتر دەکات بەتایبەتی کاتێك دەگەڕێنەوە ناو واقیعی کردەیی، واتە تۆڕی ئینتەرنێت مرۆڤەکان دەباتە نێو پەیوەندی ناواقیعی و وای لێدەکات وا لێك بدەنەوە پێویستییان بە پەیوەندییە کردەییەکان نییە. ئەمە جگە لەوەی پەیوەندییە کۆنەکان هەڵدەوەشێنێتەوە، واتە بەشدارە لە داڕشتنەوەی جۆرە نوێیەکی خەڵك.



– تۆڕی زانیاری توانی وردترین زانیاری لە بارەی ژیانی تایبەتی تاکەکانی پەیوەست بە خۆی بزانێ، لە رێگەی چوونە نێو دۆسییە و داتا تایبەتییە هەڵگیراوەکانی سەر کۆمپیوتەر، ئەمەش بەزاندنی سنووری تایبەتمەندیی تاکەکان و مافی پاراستنی زانیارییە تایبەتییەکانە.

– گۆڕانکاری ریشەیی لە چەمکی کاری وەزیفی دروستکرد، بە هۆی کۆمپیوتەر و شۆڕشی زانیارییەکانەوە مرۆڤ دەتوانێ بەردەوام بێ لە کارکردن تا دوا ساتی ژیانی و کرێکارانی پەرتەوازە کرد و ئاستەنگی خستە بەردەم یەکبوونیان، هەروەها لە هەندێ بواردا ژمارەی وەزیفە فەراهەمبووەکانی کەمکردەوە.

– پێکهاتەیەکی نوێی لە ژیانی کۆمەڵایەتی بەرهەم نەهێنا کە لە رووی جۆرەوە لەوەی پێشتر باشتر بێ، هەروەها بە شێوەیەکی یاسایی هێشتا میکانیزمێکی دیموکراتی باشتری بەرهەم نەهێناوە لەوە باشتر بێ کە مرۆڤایەتی ناسیویەتی.

– بە شێوەیەکی خراپ کاریگەری هەیە لەسەر تایبەتمەندی کەسی و وڵاتان، تەنانەت هەندێ وای دەبینن کە هەڕەشەیە لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی وڵات و کۆمەڵگەکان و جۆرێکیتر لە تاوان دروستبووە کە بە (تاوانی کۆمپیوتەر) ناودەبرێ و شۆڕشی زانیاری هەلی نوێی بۆ سیخوڕیکردن بەهەموو لە نێوان کۆمپانیاو وڵاتان جۆرەکانییەوە فەراهەم کردووە.

– بەکارهێنانی کۆمپیوتەر و تۆڕی ئینتەرنێت مەترسی و کاریگەری خراپی هەیە بە هۆی ئەو شەپۆلە کارۆموگناتیسییەی کە بڵاوی دەکاتەوە، کە ژاوەژاو دەخاتە سەر تەلەفۆن و فرۆکەوانی و لەوانەیە هەندێ نەخۆشی لێ بکەوێتەوە، کە هێشتا نەناسراوە، بۆیە پێویستە لەگەڵ بەکارهێنانی کۆمپیوتەر وەرزش بکرێ و پشوو هەبێ.

– شۆڕشی زانیاری کار دەکاتە سەر مەسەلەی مافی دانەر و بڵاوکەرەوە، کە کۆپیکردن و لاساییکردنەوە زیاد دەکات، بۆیە هەندێ ماڵپەر ئاستێکی بۆ ئەم پرسە داناوە و بەربەستی ماددی لەبەردەم تەماشاکردنی زانیاری دیاریکراو داناوە.

– شۆڕشی زانیارییەکان لەگەڵ ئەوەی هاوکارە بۆ باشکردنی ئەدای پۆزەتیڤی سەرجەم جۆرە چالاکییە کۆمەڵایەتی و ئابووری و بازرگانییەکان، یارمەتیدەریشە بۆ چالاکییە رووخێنەر و خراپەکانی وەك، بازرگانی بە ماددەی هۆشبەر و سێکس و راکێشانی منداڵ بۆ نێو جیهانی سێکس و تاوان لەمیانەی ماڵپەرەکانی چاتەوە، کە پاڵی بە خزمەتگوزارانی ئینتەرنێتەوە نا کۆتوبەند بخەنە سەر چوونە نێو ئەو مونتەدایانەی کە مۆرکی سێکسی بێ پەردەی پێوە دیارە،

هەرچەندە ئەم هەنگاوە ڕووبەڕووی ڕەخنە بووەوە بەوەی فەزای ئەلیکترۆنی موڵکی هیچ کەسێك نییە و هەموو شتێك تیایدا ڕێی تێدەچێت.

- لە خراپترین کاریگەرییەکان ئەوەیە کە بە (مافیای کۆمپیوتەر) ناسراوە، کە لە ڕێگەی ئیمەیلەوە وردە وردە دەچێتە نێو کۆمپیوتەرە تایبەتی و گشتییەکاندا ، بۆ ئەوەی پرۆگرامگەلێکی تیا بڵاو بکاتەوە کە لە کاری بخات بۆیە ناوی لێنراوە (کرم) یاخود (ڤایرۆس)، لەبەرابەردا تۆڕێکی تایبەت پێکهاتووە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەم مەترسییە.

## کاریگەرییە کۆمەڵایەتییەکانی شۆڕشی زانیاری:

ئەم سەردەمە شۆڕشێکی تەکنەلۆژی گەورەی بەخۆوە بینی لە سەرجەم بوارەکاندا بەتایبەتی لە بواری تەکنۆلۆژیای زانیارییەکاندا، ئەم شۆڕشە ئەوەندە خێرایە ناتوانی فریای بکەوی و پێی بگەی، چونکە پڕە لە ناوەڕۆکی پێشکەوتن و داهێنان لە هەموو بوارە جیاوازەکانی ژیاندا. شۆڕشی تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان و گەیاندن پێکهاتەی کۆمەڵایەتی پەیوەندی کۆمەڵایەتی نوێی هێنایە ئاراوە کە پێشتر بوونیان نەبوو، تا ئێستاش ئەم شۆڕشە کاریگەری کۆمەڵایەتی و کوولتوری لەسەر کۆمەڵگە مرۆڤایەتییەکان هەیە، ئەو کاریگەرییە ئەرێنییەی کە لە تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان دەمانەوێ نایەتە دی، ئەگەر ئەم تەکنۆلۆژیایە تەنها ڕوویەکی کۆمەڵگە بگرێ و گۆڕانکارییەکی کۆمەڵایەتی یان پەرەسەندنێکی کوولتوری لەگەڵدا نەبێ، یاخود بەلای کەمەوە نەبێتە هۆی دروستکردنی هەندێ پێکهاتەی کۆمەڵایەتی دەزگایی نەك دەستەبژێری بۆ سەرکردایەتیکردنی ئەم گۆڕانکارییە و گەشەپێدانی سیستمی کۆمەڵایەتی و کوولتوری.

پەیوەندی ئۆرگانی لە نێوان شۆڕشی تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان و پەرەسەندنی بونیاتە کۆمەڵایەتییەکان و بەها باوەکەی بۆتە یاساگەلێکی کۆمەڵایەتی پەسەند و باو، تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان و گەیاندن و تەکنۆلۆژیای تۆڕەکان ئەمڕۆ سەرکردایەتی پرۆسەی دروستکردنی شێوازی ژیانی کۆمەڵایەتی نوێ بۆ مرۆڤایەتی دەکات بە شێوەیەکی وەها کە کاریگەری ڕیشەیی هەیە لەسەر ژێرخان و بەها سەرووە باوەکان. ئەمڕۆ شارستانێتی مرۆڤایەتی بە قۆناغێکدا تێپەڕ دەبێ کە بە خاڵی وەرچەرخان لە قەڵەم دەدرێ لە پێشکەوتنی چۆنایەتی تەکنۆلۆژیای گەیاندن و زانیارییەکاندا، کە لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی گۆڕانێکی ڕیشەیی گەورە لە بونیاتی کۆمەڵگە مرۆییەکاندا. تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان هەموو بوارەکانی ژیانی ڕۆژانەیان گرتۆتەوە و کاریگەری بەهێزیان لە بونیاتی بنەڕەتی و پەیکەری کۆمەڵگەکانی



جیهاندا کردووە، ئەم کاریگەرییانەش بە شێوەیەکی ڕیشەیی لەو کاریگەرییانەی کە شۆڕشی پیشەسازی هێنایە ئاراوە جیاوازن کە تا ئەمڕۆش کۆمەڵگە پیشەسازییەکان تیایدا دەژین. ئەم تەکنۆلۆژیایە زوو بێ یان درەنگ کاریگەری خۆی دەبێ لە بونیاتی کۆمەڵگە تازە گەشەسەندووەکان، لەوانەش کۆمەڵگەی خۆمان، هەرچەندە ئەم تەکنۆلۆژیایە لەوانەیە درەنگتر پێمان بگات و سەرەڕای ئەوەی کە تا ئێستا هەموو ڕەهەند و کاریگەرییەکەیمان وەرنەگرتووە.

پەرەسەندنی خێراو لەرادەبەدەری تەکنۆلۆژیای زانیارییە نوێیەکان و کاریگەرییە بەرچاوەکەی لەسەر بونیاتی کۆمەڵایەتی و ئابووری، هەڕەشەیەکی بەردەوام و خێرای هەیە لە گەورەکردنی ئەو کەلێنەی کە لە نێوان ئەو وڵاتانەی کە پشتیان بە ئابووری زانین و زانیارییەوە بەستووە و کۆمەڵگە تازە گەشەسەندووەکان هەیە، لە نێوانیاندا کۆمەڵگەی خۆمان، بۆیە ئەگەری پڕکردنەوەی ئەم کەلێنە لەوانەیە بە خەونێك دابنرێ، کە لە داهاتووی چاوەڕوانکراودا نایەتەدی، ئەگەر کۆمەڵگە تازە گەشەسەندووەکان هەوڵی پێویست و چڕوپڕ، بۆ فێربوون و وەرگرتنی تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان نەدەن و تێکەڵکردنی لەگەڵ پلانی گەشەپێدانی نەتەوەییداو لە بەها باوەکانی کۆمەڵگەکانمان و ژیانی ڕۆژانەماندا نەیچێنن.

**دەتوانین هەست بە کاریگەرییەکانی شۆڕشی تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان و گەیاندن لەسەر کۆمەڵگە لەم لایەنانەی خوارەوە بکەین:**

١- شۆڕشی تەکنۆلۆژیای گەیاندن سەرکردایەتی پرۆسەی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی — ئابووری و دووبارە داڕشتنەوەی بەها باوەکان دەکات. زۆر هەڵەیە گەر لەو بڕوایەدا بین تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان تەنها بریتییە لە دیاردەیەکی ماددی - ئابووری یان هۆیەکانی تەنها فاکتەرە ئابووری و زانستییەکانن و کاریگەرییەکانی تەنها لەسەر لایەنە ماددی و بەرهەمهێنەرەکانی کۆمەڵگەیە، بەڵکو بریتییە لە پرۆسەیەکی ماددی و کۆمەڵایەتی و شارستانێتی ئاڵۆز کە ڕیشەی دابەزیوەتە ناو سەرتاپای بونیاتی کۆمەڵایەتی و لەلایەن فاکتەری ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و کوولتوری جۆراوجۆرەوە کاری تێدەکرێ و کار دەکاتە سەر پێکهاتە ماددی و شارستانێتییەکانی کۆمەڵگە.

گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی بریتییە لە گۆڕانی کۆمەڵگە لەلایەنە ماددی و زانستی و تێکنەلۆژییەکان، هەروەها گۆڕانی لە لایەنە نموونەیی و کوولتوری و بیرییەکاندا، بەڵام لە ڕاستیدا گۆڕانی ماددی کۆمەڵگە خێراترە لە گۆڕانی بیریی و شارستانی، واتە کۆمەڵگە لەلایەنە تەکنەلۆژی و ئابوورییەکان بە خێرایی دەگۆڕێ، بەڵام لە لایەنە کوولتوری و

بیرییەکاندا لەسەرخۆ دەگۆڕێ. خێرایی لە گۆڕانی ماددیدا بەسەر گۆڕانی بیریدا دەبێتە هۆی پەیدابوونی کێشەی کۆمەڵایەتی و شارستانی جۆراوجۆر بۆ ئەو کۆمەڵگەیە. بۆ نموونە، لەوانەیە تەکنۆلۆژیا لە کۆمەڵگەیەکدا کە پەرە بستێنێ، بەڵام هەندێ لەو کۆمەڵگەیانە دەستبەرداری بەهاو دابونەریتە بەسەرچووەکانی خۆیان نەبن وەك دەمارگیری هۆزی، هەروەها تایبەتمەندییەکانی دیکەی کۆمەڵگە نەریتی و دواکەوتووەکان.

٢- کاریگەری تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان لەسەر بونیاتی کۆمەڵایەتی و تەکنۆلۆژیای باو، لە ئەنجامدا کاریگەری لەسەر ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و سەرچاوەکانی بەرهەمهێنانی سامان و دابەشکردنی.

مەبەست لە ژێرخان و بنەما پێکهاتەییەکان، ئەو دامودەزگایانەن کە لە ناو کۆمەڵگەدا بڵاوبونەتەوە، کە بڵاوکردنەوەی زانیارییەکان لە بارەی تەکنۆلۆژیا ئامادە دەکەن و توانای مرۆیی دەستەبەر دەکەن بۆ وەرگرتنی ئەو زانیارییانە، هەروەها ئەو کەناڵانەش ڕێکدەخەن بۆ سوودوەرگرتن لێیان. ئەم دامودەزگایانە بوونەتە پێویستی بنەڕەتی بۆ گەشەسەندنی کۆمەڵگەکان و پێشکەوتنی تەکنەلۆژی و پیشەسازییان و گەشەپێدانی تواناکانی کۆمەڵگەو، بۆ وەرگرتنی هەر نوێکارییەك لە هەموو بوارە تەکنەلۆژی و شارستانییەکان.

گرنگی ئەم ژێرخانەش تاڕادەیەکی زۆر جیاوازە بە گوێرەی ڕەوشی گەشەسەندن لە وڵاتی مەبەستدا، هەروەها بەگوێرە جۆری ئەو تەکنۆلۆژیایە کە حەز دەکات وەریبگرێ، تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان کاریگەری خۆی دەبێ لەسەر دامودەزگا بونیاتییەکانی کۆمەڵگە وەك خانەوادە و خزمایەتی و هاوسەرگیری و ئاستەکانی بژێوی و کار و دەستبەتاڵی و تێڕوانین بۆ ئازادی و کارکردنی ئافرەت و پێکهاتەی دانیشتوان و پێکهاتەی چینایەتی. پێشکەوتن لە بواری تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان و گەیاندندا کاریگەری روون و ئاشکرای هەیە لەسەر پەرەسەندنی پیشەسازی و زیادبوونی قەبارەی بەرهەمهێنان و گەشەسەندنی داهاتی نەتەوەیی. زیادبوونی داهاتی تاکەکەس هاریکاری خێزان دەبێ بۆ پەرەسەندن و چاکترکردنی بژێوی و باری کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و رۆحیی و دروستکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە تازەکان.

(فرانسیس فۆکۆیاما) یەکێکە لەو بیرمەندانەی کە بایەخێکی زۆری داوە بە دەرەنجامی کۆمەڵایەتی و ڕێکخستنی شۆڕشی زانیاری، لە کتێبی (متمانە) دوپاتی دەکاتەوە کە شۆڕشی زانیاری دیاردەیەکە بەلای کەمەوە پێش سێ سەدەیە لە کۆمەڵگە پیشەسازییەکان دەستپێکردووە، بەڵام تێبینی دابەزینی ڕێژەی دانیشتوانی سەرقاڵ بوو بە پیشەسازی کرا، لە



هەمان ئەو کاتەی کە پێکهاتەی زانیاری لە دەرەنجامی کۆتایی ئابووریدا بەرز بووەوە. بەمەش داهاتەکانی فێربوونی زیادی کرد و بەهۆیەوە کەلێن لە داهات و پایەی کۆمەڵایەتی لە نێوان کرێکارە خوێندەوار و نەخوێندەوارەکان دروستبوو. سەبارەت بە دیارخستنی سوودەکانی فێربوون ئەوا ئاستی گشتی فێربوون لە زۆربەی وڵاتە پیشەسازییەکان بە شێوەیەکی بێوێنە بەرزبووەوە ئەمەش لەوانەیە کاریگەری کۆمەڵایەتی و سیاسی بخولقێنێ. ئەوەی زۆر جێی بایەخە ئەوەیە کە فۆکۆیاما ئاماژەی پێداوە بەوەی چاخی زانیارییەکان بواری داوە بە ڕوودانی گۆڕانکاری گەورە لە بواری بونیاتە ڕێکخستنەکاندا، چیتر پێویست ناکرێ بە بوونی ڕێوشوێنی ڕێکخستنی کە لەسەر بنەمای سەنترالیزم و پلەکاری لە کۆمپانیاو دەستە حکوومییەکان و لە دامەزراوەکانی تردا کار بکات، بەوەی کاتێك پەیوەندیکردنەکان لەسەرخۆ و زۆر تێچوو بوون، ڕێوشوێنە ستوونییەکان بەوپەڕی تواناییەوە ڕۆڵی خۆیان دەبینن، چونکە لە هەڵقوڵانی پێویستی زانیارییەکانی کەمکردەوە.

بەڵام ئێستا پەیوەندیکردنەکان ئاسان بووە و تێچوونی کەمە ئەمەش بۆتە هۆی دەرکەوتنی نەسەقی نوێ کە سەروەرێتی شێوازی پەیوەندیکردنی ئاسۆیی نیشاندەدات، هەروەها ڕێوشوێنە پلەکارییە کۆنەکان شێوازی خۆی هەبوو لە لەسەرخۆکردن و شێواندنی هەڵقوڵانی زانیارییەکان، ئاڵوگۆڕی ڕاستەوخۆی زانیارییەکانیش لەمیانەی ڕێوشوێنە ساکار و تۆڕییەکان بە هۆی تەکنۆلۆژیای زانیارییەکانی ئەمڕۆ بۆتە هۆی زیادبوونی ڕێژەی توانا لە ڕێکخراوەکان کە سەرکەوتوو دەبێ لە دانانی ئەم نەسەقە نوێیانە. فۆکۆیاما لەم خاڵەدا بەتایبەتی ئاماژە دەکات بە گرنگترین سیمای ئەوەی ناودەبرێ بە کۆمەڵگەی زانیاری جیهانی، کە نموونەی کۆمەڵگەی پیشەسازی تێپەڕاند، ئەوەیە کە دەکرێ ناوی لێ بنێین کۆمەڵگەی تۆڕیی. پاشان فۆکۆیاما دەچێتە سەر خاڵێکیتر کە خۆی لەخۆیدا پرسیارێکی گرنگی لا دروستدەکات: ئایا شۆڕشی زانیاری بووە مایەی لاوازکردنی پەیوەندیکردنە کۆمەڵایەتییەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکان و وڵاتانیتری پیشەسازی؟ ئەو ڕەتی دەکاتەوە بەوەی ئەوەی گۆڕاوە ژمارە یان هێزی گەیاندنە کۆمەڵایەتییەکان نییە، بەڵکو فراوانبوونی چوارچێوەکەیەتی، لەبەر ئەوەی شۆڕشی زانیاری بواری بە تاکەکاندا پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەگەڵ هاوتاکانیان لە بیرکردنەوەدا ببەستن و ئەوانەی کە ئەندام نین لە کۆمەڵگە لۆکاڵییەکانیان، چونکە ئەم شۆڕشە وایلێکردن سنووری جوگرافی ببەزێنن، ئەوەتا هەریەکەمان چەندین ئارەزووی هەیە لەئاکامی شێوازی جیاجیای ئەو کۆمەڵگەیانەی کە کارلێکیان لەگەڵدا دەکات، بەم جۆرە بە هۆی شۆڕشی زانیارییەوە وەك

فۆکۆیاما دووپاتی دەکاتەوە، تاك دەتوانێ فرە ناسنامە بێ بۆ دەوڵەمەندبوونی کەسایەتی مرۆیی و دەرچوونی تاك لە چوارچێوە جوگرافیای تەسکی وڵاتەکەی بەرەو ئاسۆی فراوانی مرۆڤایەتی.

دەزگاکانی رۆژنامەوانی و میدیا رۆڵێکی بنچینەیی و گەوهەری لە گۆڕان و مشتومالکردنی بەها کۆمەڵایەتییەکاندا دەگێڕێ، زۆربەی کۆمەڵناسانی هاوچەرخیش کۆکن لەسەر ئەوەی کە شۆڕشی تەکنۆلۆژیای سەردەمی زانیارییەکان و جیهانگەرایی هەر تەنیا سروشتی دەوڵەتی نەتەوەییان نەگۆڕیوە، ئەوە ئەگەر هەر ئاوەژووی نەکردبنەوە. بەڵام پێویستە جەخت لەسەر ئەوە بکرێ کە توانای مرۆڤ هێندە ئەکتیڤ نییە لە ئاست زاڵبوون بەسەر ئەو چۆنێتییەی کە تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و رۆشنبیری ئێمەی پێ دەسازێنێ. کەسیش توانای ئەوەی نییە ئاراستەی بەرەوپێشچوونی بارودۆخەکانی ئێستا پێشبینی بکات، چونکە هەر پێشکەوتنێك ئەنتی پێشکەوتنێکی لە نێو خۆیدا هەڵگرتووە. دیارە ئەمەش لە بنچینەدا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئێمە ئێستا لە سەرەتاکانی سەردەمێکی نوێدا دەژین و هێشتا لە دەستپێکی ناسینەوەی پێشەکییەکانیداین و تازە هەست بە فیچەرەکانی دەکەین و لە هەوڵی دەستنیشانکرنی سیماکانیداین، گەرچی کاریگەرییەکانیشی لەوە بەهێزترن کەسێك بتوانێ پشتگوێیان بخات.

لە روانگەی ئەم هەموو پێشکەوتنە پرسیارێکی گرنگ دەکرێ: ئایا ئاسان فەراهەمبوونی پەیوەندی لەبەردەم تاکەکان، رێگە دەدات بە هەریەکەیان ئەو زانیارییانەی دەستبکەوێ کە لەگەڵ پێداویستییەکانی خۆی بگونجێ؟ یان کۆمەڵگەیەکی لێکهەڵوەشاوە بخولقێنێ و نەچێتە ژێر باری رێوشوێنێکی هاوبەش لە بەها کۆمەڵایەتییەکان؟ وڵامێکی تەواو نییە لەمبارەیەوە بەڵام، لەوانەیە هەردوو ئەگەر لەئارادا بێ، ئایندە ئەمە روون دەکاتەوە.

## جیهانێکی تر.. ململانێیەکی نوێ:

بۆچوونەکان زۆرن لە بارەی ئەم دیاردە جیهانییە و کاریگەری لە مەودای نزیك و دووردا، هەیانە کۆك و هەیانە ناکۆکە، بەڵام هەمووان کۆکن لە بارەی ئەوەی تەکنۆلۆژیای زانیاری جیاوازی گەوهەری هەیە لەوانەی پێشوو. بەکردەیی بۆتە فاکتەرێکی یەکلاکەرەوە لە دیاریکردنی چارەنووسی جیهانەکەمان، بە دەوڵەت و تاکەکانییەوە. تەکنۆلۆژیایەکی زەبر بەدەستە کە لەمیانەیەوە سەرجەم پایەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لە پێکدادانێکی کارا لەگەڵ



سەرجەم توخم و دیاردەکانی بێ جیاوازی تێپەڕ دەبن، مامەڵە لەگەڵ ژمارە و هێماکان دەکات بەهەموو جۆرەکانییەوە، لەگەڵ دەنگ و دەق و وێنە، لەگەڵ نووسراو و وتراو، لەگەڵ هەستپێکراو و هەست پێنەکراو، لەگەڵ توخمە ماددییە دیارەکان و نهێنییە بایۆلۆژی و سایکۆلۆژییە شاراوەکان...هتد. تەکنۆلۆژیایەك ئەمە تواناو تایبەتمەندییەکەی بێ، سەیر نییە کە جێبەجێکردنەکانی بەو خێراییە بەهەموو لایەکدا بڵاو بێتەوە.

کۆمەڵگەی زانیاری بەهاو چەمك و شێوازگەلی نوێ دەخاتەڕوو، بەرەنگاربوونەوەی سەختیش دەسەپێنێتە سەر تاکەکانی و هۆشداری ململانێگەلی نوێ دەدات و گرنگی زانین و کوولتور و زمان دەدرەوشێنێتەوە و پرسگەلی فەلسەفی پەیوەست بە مرۆڤ لە رووبەڕووبوونەوەی ئامێردا دەورووژێنێ. یەکەمجارە کە چارەنووسی نەتەوەکان بە توخمگەلی نامادی و هەستپێکراوەوە پەیوەستبێ، لە کاتێکدا خودی تەکنۆلۆژیا خولقاوی خواستی مرۆڤەکانە، لەمبارەیەوە ژمارەکان هەندێ راستی دەردەخەن وەك، ئاکامی گشتی پیشەسازی زانیاری لە ساڵی ٢٠٠٠ بە هەزار بلیۆن دۆلار دەنرخێنرێ، بەمەش بووە یەکەم پیشەسازی لە مێژووی جیهاندا کە ژمارەی تریلیۆن تۆمار بکات. هەروەها پێشخەرانی سیستمی سوپەر کۆمپیوتەر خەریکی سەرقاڵی گەیاندنی خێرایی ئەو جۆرەی کۆمپیوتەرن بە تریلیۆنێك کرداری ژمێریاری لە یەك چرکەدا کە بەرابەر ٥٠-١٠٠ هێندەی خێرایی ئێستا دەبێ.

تەکنۆلۆژیای زانیاری هەرچەندە پیشەسازییەکی تازەیە بەڵام، گەشە و باڵایەکی تەکنیکی بێ وێنە دەکات و سەردەمی زانیارییەکان بە سەردەمی زانست و دەزگایی مەزن دادەنرێ و سەرکەوتن تیایدا پەیوەستە بە باش بەکارهێنانی داهاتەکان بەتایبەتی داهاتە مرۆییەکان. لە شۆڕشە تێکنەلۆژییەکان، کۆمەڵگە وردە وردە سەرتاپای دەگۆڕێ و رێژەی گۆڕانکارییەکەی دەوەستێتە سەر سروشتی تەکنۆلۆژیا کاریگەرەکان و کارلێکی لەگەڵ توخمەکانی ژینگە کۆمەڵایەتییەکەی. تەکنۆلۆژیای زانیاری یەکەم تەکنۆلۆژیایە کە مامەڵە لەگەڵ زانین و سایکۆلۆژی و فەلسەفە و مرۆییەکان دەکات، بۆیە زەحمەتە پێشبینی کاریگەری ئەم تەکنۆلۆژیایە بکرێ تەنانەت ئەگەر بۆ داهاتوویەکی نزیکیش بێ، ئەو کاریگەریەشی کە تائێستا دەرکەوتووە تەنها بەشێکی زۆر کەمە لەو پێشبینییە ئەگەرانەی خراونەتەڕوو.

هەندێ بە گەشبینییەوە دەڕواننە تەکنۆلۆژیای زانیاری و پێیانوایە کە (تەکنۆلۆژیای هیوا)یە کە کەموکوڕی شۆڕشی پیشەسازی دووەمی تێدا نییە، تەکنۆلۆژیایەکە دەتوانێ لە چەند ساڵێکی کەم ئەوە وەدیبێنێ کە شۆڕشی پیشەسازی لە ماوەی چەند سەدەیەك نەیتوانی

وەدیبیێنێ. لەبەرابەردا رەشبینان وای دەبینن ئەم تەکنۆلۆژیایە دەبێتە مایەی فراوانبوونی کەلێن لە نێوان جیهانی پێشکەوتوو و جیهانی تازە گەشەسەندوو بەجۆرێك کار لە پێکهاتەی کۆمەڵگەی مرۆیی دەکات و دەبێتە هۆی زیادبوونی بێکاری و نامۆیی مرۆڤ زێدەتر دەکات و ژینگەی کارەکەی تێکدەچێ لەبەرابەر هەژموونی ئامێر و ئاڵۆزی سیستەمەکەی و برەوپێدانی سەنتراڵیزمی و زیادبوونی دەسەڵاتی بەرێوەبەران لەسەر کارمەندان، هەروەها ئەوان هۆشداری ئەگەری پەیدابوونی رکابەری و ململانێی توند دەدەن لە نێوان وڵاتە پێشکەوتووەکان بۆ کۆنترۆڵکردنی بازارەکان.

ئەم جیهانەی ئەمرۆ تێیدا دەژین جیهانی خێرایی و گەیاندنی زووی هەواڵ و نامە و تێبینییەکانە، شۆڕشی پیشەسازی ئەو راستییەی بۆ سەلماندین کە هەرچی زیاتر خێرابوونی ماشینەکان، مانای هێندە زۆرتری بەرهەم و لە دوا دەرەنجامیشدا مەبەستی هێندە گەورەترکردنی قازانج دەگەیەنێ. خێرایی، ئەو دەرکەوتە نوێیەیە کە چیدی هەموو بوارەکانی ژیانمان بە چەشنێك لە چەشنەکان دیاریدەکات و دەبێتە قەدەرێکی کۆمەڵایەتی نوێ، کە ناتوانین خۆمانی لێ دەرباز بکەین. ئەو وتەیەی کە دەڵێ: ئەوەی درەنگ بێ ژیان سزای دەدات، دەقاودەق لەم دونیایەدا کە خێرایی دەستنیشانکەری هەموو سەرکەوتن و بالادەستییەکە، راستێتی خۆی هەمیشە دەسەلمێنێ.

خێرایی بۆ خۆی لە جیهانی میدیای ئەلیکترۆنی دەبێتە ئامانج، ناوەرۆك و چەشنی رووداوەکان مەسەلەیەك نین، بەڵکو ئەوەی مەبەستمە، کێ یەکەم هەواڵی پێیە و کێ دەبێتە چاوگی ئەو هەواڵە. گەورە و بچووکی هەواڵەکان رۆڵی خۆیان لە دەستدەدەن و چیدی ئەوەی مەسەلەیە ئەو کاتەیە کە تا دوا ئەندازە کورت دەکرێتەوە بۆ ئەوەی هەواڵەکانی پێدا تێپەڕبن و بگەنە جێی مەبەست. بەم چەشنە وەکو (ڤیریلیۆ) دەڵێ: "زانیاری بۆ خۆی دەبێ بە خێرایی". ئەم خێراییەش کاریگەری گەورە و فەرامۆش نەکراو لەسەر چۆنێتی بینین و تێگەیشتن و هەست و نەستمان بەجێدێڵێ. پاوانکردنی شوێن و کاتی شتەکان دەبێ بە کۆڵەگە و خەسڵەتێکی گەوهەری سەدەی نوێ. کاتێك دەوترێ پاوانکردنی جیهان لە رێگەی خێراییەوە وەچنگ دەکەوێ، مانای ئەوەشە کە لە پاڵ ئەم حاڵەتەدا هێزی پاوانخواز وەکو جاران پێویستی بە دوو چاو نییە تا بەهۆیانەوە تەنها سنوورێکی دیاریکراوی توانای بینینی هەبێ، بەڵکو پێویستی بە چاوێك هەیە، کە هەموو شتەکان ببینێ و بزاوتیان دیاریبکات،



بۆ ئەم مەبەستەش چاو دەبێ بە کایەیەك بۆ کۆنترۆڵکردن، ئەو چاوەش کە توانای تێرکردنی ئەم ئەرکەی هەیە سەتەلایتەکانە.

تاکو توانای تەکنیك لە بینینی شتە بچووکەکان گەورەتر بێ، هێندەش توانای بچووککردنەوەی دونیا گەورەتر دەبێ، جیهانی خۆبزێو چیدی پێویستی بە چاوی ئاسایی نییە بۆ ئەوەی شتە راستییەکان ببینێ و لە نهێنییەکان بکۆڵێتەوە، جیهانی ئێستا لەلایەن چاوەکانی ماشینەوە چاودێری دەکرێ. ئەمە جیهانێکە کە بە خێراییەکی سەیر دەتوانێ وێنە و زانیاریمان پێکەوە بۆ بگوازێتەوە، دەتوانێ لە کات و ساتی فەرمان دەرکردنیدا هەموو ئەو زانیارییانە بەتوانای بینینەوە بخاتە بەردەستمان، واتە خێرایی بینین و زانیاری دەچنە ناو یەك قاوغەوەو لە یەك ئان و ساتدا پێکەوە کار دەکەن، بەم چەشنە تەکنۆلۆژیای نوێ دەتوانێ ئان و ساتێتی راستییەکانمان بداتێ. بەڕای (ڤیریلیۆ) ئەم توانایە قۆناغێکی نوێ لە هێزی بینین بەرهەم دێنێ، قۆناغی بێ مانابوونی بینینی ئاسایی و قۆناغی ونبوونی کات و شوێن، بینینی ئاسایی کە بینینێکی مرۆڤانەیە، لەم سەردەمەدا بێ نرخ دەبێ.

کرداری کۆکردنەوەی زانیارییەکان لەم جیهانە نوێیەدا بە وردترین و ئاڵۆزترین کێشە دادەنرێ کە رووبەڕووی ئەو کەسە دەبێتەوە کە دەیەوێ بڕیاری سیاسی بدات، چونکە شۆڕشی میدیا و شۆڕشی رێکخستنی زانیارییەکانن کە فەرمانڕەوایی هەموو رواڵەتێکی پێشکەوتنی تێکنۆلۆژی دەکەن لەم سەردەمەدا. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دوو گۆڕاوی سەرەکی کە بریتین لە:

١- زۆری زانیارییەکان و بەلێشاوهاتنیان لەسەر هەموو ئاستەکاندا.

٢- ئەو ئاڵۆزییەی کە مرۆڤایەتی ئەمرۆ تیایدا دەژیت پسپۆڕبوونی لە بواری کرداری کۆکردنەوە و رێکخستنی زانیارییەکانی کردووە بە راستییەکانی رەها، بە شێوەیەك کە تێگەیشتنی جیاواز و نموونەی جیاواز لە تێڕوانین و هەستکردن بە هەمان راستی دروستکردووە، لە بواری گواستنەوەی زانیارییەکان لە نێرەرەوە بۆ وەرگر یان لە سەرچاوەی زانیارییەوە بۆ ئەو کەسەی سوودی لێ دەبینێ. لە لایەنە سیاسییەکەی ئەوەمان بەبیر دێتەوە ئەو کەسەی بڕیاری سیاسی دەدات خۆی لە هەڵوێستێکدا دەبینێتەوە کە سێ تایبەتمەندی تێدایە: یەکەمیان ئەوەیە ئەو سیاسەتمەدارە هەر بە سروشت و پێکهاتەی خۆی شێوازێکی جەماوەری زاڵە بەسەر بیرکردنەوەیدا، ئەم سیفەتەش زۆرجار دژ لەگەڵ کرداری مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەکاندا. لەلایەکی دیکە لەسەری پێویستە زۆرجار زۆر بەخێرایی بڕیار بدات چونکە لەوانەیە خۆی لە

هەڵوێستەیەکدا ببینێتەوە، کە زیاتر لە چەند خولەکێکی بەدەستەوە نەبێ بۆ بڕیاردان لە کێشەیەك کە پێویستی بە بڕیاردانە. سەرەڕای ئەمەش لەوانەیە ناچار بێ بۆ بڕیاردان بەبێ هەبوونی زانیاری تازە و نوێ بووەوە، ئەمەش جۆرە مامەڵەکردنێك بەسەریدا دەسەپێنێ بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ زانیارییە کۆنەکانی گەر هەیبێ.

زانستی زانیارییەکان تەنها شێوازی مامەڵەکردن نییە لەگەڵ کۆمپیوتەرەکاندا، ئەم چەمکەش کە لە ناو زۆر لە چینە زانستییەکاندا بڵاوە راست نییە، چونکە پەیوەندی زانیاری بە بڕیاردانەوە لە سێ ئاستدا دەردەکەوێ: یەکەمیان، کاتێك کە زانیارییەکە دەبێتە بابەتێکی تێڕامان دواتر ئامرازێك بۆ پشتگیریکردنی بڕاڤەکە، کە دەبێ بەو شێوەیە ئەو زانیارییە دابنرێ کە بوار بدات بە بەکارهێنانی و بە سەربەخۆییەکی تەواو لە ناوەڕۆکی ئەو زانیارییە. دووەمیان کاتێك کە پێویست دەکات زانیارییەکە لەگەڵ زانیاری دیکەدا تێکەڵ بکرێ بەمەبەستی دۆزینەوەی گریمانێکی دیاریکراو یان گەیشتن بە تیۆرێکی دیاریکراو بۆ گەیشتن بە زانینێکی ئەنجام دیاریکراو، یان بۆ رادەی کاریگەری ئەو گریمانە لەسەر زانیارییەکە ئەمەش دەبێتە توخمێکی بنەڕەتی بۆ گفتوگۆکردن لە نێوان عەقڵی مرۆڤ و ئەو ئامێرە بێدەنگەدا.

بڕیارەکانی هەر وڵاتێك لەسەر ئاستی دەرەوەدا شێوەیەکی جێگیری هەتا هەتایی هاوکاری لەگەڵ وڵاتانی دیکەدا نییە، چونکە هاوکاری سیفەتی هەمیشەیی نییە لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا، کە زۆر ململانێی بەردەوامی بەخۆوە بینیوە لەوانەش هەردوو جەنگی جیهانی و جەنگە جۆراوجۆرە هەرێمییەکان، لەسەر ئەم بنەمایە دەتوانین بڵێین هەرچەندە لە چوارچێوەیەکی تەسکیشدا بێ، هەر بڕیارێك کە تارادەیەك سوود ببەخشێتە وڵاتێك لەوانەیە لە لایەنێکی دیکە زیان بگەیەنێتە ئەو دەوڵەتە. وردتر بڵێین لایەنەکانی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان تەماشای پەیوەندییە ژینگەییەکان دەکەن لە گۆشەنیگای توانای هەموو لایەنێك بۆ بەدەستهێنانی چی لە توانایدا هەبێ لە سوود و قازانج لەسەر حیسابی لایەنی بەرابەر، ئەمەش بەبێ بەدەستهێنانی زۆرترین زانیاری دەربارەی لایەنەکانی دیکە ناتوانرێ بەئەنجام بگەیەنرێ، بە لایەنی کەمەوە ئەو وڵاتانەی کە لە چوارچێوەی ئەو هەرێمەدا دەژین.

لێرەش گرنگی کۆکردنەوەی زانیارییەکان لە بارەی وڵاتێك لەبەر چەند پێویستییەك دەردەکەوێ، لە ئەنجامدا هێزی راستەقینەی ئەو وڵاتەت بۆ دەردەکەوێ، سەرەڕای ئەمەش ئەو زانیارییە بەدەستهاتووانە لە بارەی ئابووری و سیاسەت و کوولتور و ئایین و باری کۆمەڵایەتی و نەژادی لەو وڵاتەدا گرنگی زۆریان هەیە، چونکە بواری بڕیاردانی راست و دروست



دەرەخسێنن، بەمەش دەتوانرێ بە شێوەیەکی کاریگەرانە و ئاراستە دیار بڕیار بدرێ، بۆیە زانینی زانیارییەکان خۆی لە خۆیدا بەهێز دادەنرێ.

ئەگەر رادیۆ و تەلەفزیۆن سەرکەوتوو بووبن لە گۆڕینی میدیای سیفەت بۆ میدیای گرۆکار (کتلە) یان جەماوەر، ئەوا تەکنۆلۆژیای زانیاری هەوڵدەدات بۆ گواستنەوەی میدیای جەماوەری لە قۆناغی میدیای تایبەتمەندییەوە، پێشتر قسە لە بارەی پەخشەوە دەکرا لە چوارچێوەیەکی فراوان (broodcast)، بەلام ئێستا لە چوارچێوەیەکی تەسك (narrowcast)ەوە گوێبیستی دەبین، بەئامانجی پێکانی بارگاویی میدیایی بۆ توێژگەلی دیاریکراو.

میدیا لە سیستمی پەخشکردنی پەیامەکەی بۆ سەرجەم بینەران بەرەو سیستەمێك دەڕوات کە بوار بدات بە بینەر خۆی مادده میدیاییەکان و کاتی تەماشاکردنیان هەڵبژێرێ، یاخود هەڵبژاردنی بابەتەکانی رۆژنامەکەی لە چوارچێوەی بنەمایەکی گەورە لە مادده ئامادەکراوەکان بۆ بڵاوکردنەوە و دیاریکردنی شێوەی دەرهێنانی ئەو رۆژنامەیە، ئەمەش رووی نەدەدا ئەگەر ئەو پێشکەوتنە مەزنە لە بواری تەکنۆلۆژیای گەیاندن روونەدابایە، کە ئامرازی کرداری دەستەبەر بوون بۆ پێکەوەبەستنی ناوەندەکانی پەخشی میدیایی بە جەماوەرەوە لە رێگەی کێبڵەکانی پەیوەندیکردنی راستەوخۆ یان کۆدی تایبەتەوە. ئەمە سەبارەت بە پەیوەندی ناوەندەکانی میدیا بە بینەرانی، بەڵام سەبارەت بە پەیوەندی بینەر بە ئامێرەکانی وەرگری مادده میدیاییەکان، بەرەو یەکگرتن دەچێ لە سیستمێکی تەواو کە رادیۆ و تەلەفزیۆن و رێکۆردەر بە هەموو جۆرەکانی و ئامێری پیشاندان، کە هەموویان لەژێر کۆنترۆڵی کۆمپیوتەردا کار دەکەن و ڤیدیۆی وەڵامدەرەوە (interactive video) شۆڕشێکی راستەقینەیە لە جیهانی رۆشنبیری و فێربوون و کاتبەسەربردن، کە بینەر لەماڵەوە لەشوێنی دانیشتنی خۆیەوە، دەتوانێ چالاکی هاوشێوەی چالاکی راستەقینە ئەنجامبدات، بەم نزیکانە دەتوانێ سەردانی مۆزەخانەکان و گەڕان بە نێو پێشانگەکان و سەردانی شوێنەوارە دێرینەکان بکات. میدیا بە پاڵپشتی تەکنۆلۆژیای زانیاری دەتوانێ رۆڵێکی سەرکی ببینێ لە گەیاندنی خزمەتگوزاری فێربوون بۆ ناوچە گوندنشینەکان و پڕکردنەوەی کەموکوڕییەکان لەمبارەیەوە، گرنگی میدیاش زیاتر دەبێ لە پڕکردنەوەی کاتبەتاڵی و فێربوونی بەردەوام و بەرزکردنەوەی هۆشیاری روناکبیری بۆ جەماوەرێکی زۆر.

# بەشی چوارەم

## ئینتەرنێت

“من لەسەر ئینتەرنێت دەژیم“

(ئیستراديسۆن)

کۆششی مرۆڤ لە ساڵەکانی کۆتایی سەدەی بیستەمدا بۆ گەیشتن بە زانیاری بە شێوەیەکی ئاسان و خێراو کەمخەرج و توانای لێکدانەوە و تاوتوێکردن و بە زانستکردنی ئەو زانیارییانە گەیشتە ئاکام، مرۆڤی هۆشیار بە کەڵك وەرگرتنی لە هارد دیسك و ئۆفسێت و بە یارمەتی کۆمپیوتەر، دەتوانێ لە ماوەیەکی زۆر کەمدا دەستی بە کۆمەڵێکی زۆر لە هەواڵ و زانیاری بگات. داهێنانی تەکنەلۆژی نوێ لە بواری پەیوەندییە مرۆییەکاندا گۆڕانکاری زۆر گەورەی پێکهێناوە، بە جۆرێك ئاڵوگۆڕ و گەشەی تەکنەلۆژی لە پەیوەندییەکاندا زیاتر لە بوارەکانی دیکەی زانیاری مرۆڤایەتی گەشەی بەخۆیەوە بینیوە و نوێترین داهێنانە لە بواری گۆڕینەوەی زانیاریدا. تۆڕی ئینتەرنێت بە لوتکەی تەکنۆلۆژیای گەیاندن دادەنرێ و زاراوەی ئینتەرنێت ئاماژەیە بە کۆمەڵێك لە ئامێری کۆمپیوتەری پێکەوە پەیوەندیدارو زانیارییەکان لە نێوان خۆیاندا ئاڵوگۆڕ دەکەن و دەیانگوازنەوە، لەبەر سروشتە دینامیکییە کارلێکییەکەی بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش لەم ساڵانەی دواییدا بڵاو بۆتەوە.

سەختە گەر بمانەوێ بە وردی پێناسەی تۆڕی ئینتەرنێت بکەین، چونکە لە هیچ بوارێکی زانستیدا پێناسەیەکی دیاریکراوی نییە و شێوەی بەکارهێنانی ئەم تۆڕەش لە بوارێکەوە بۆ بوارێکی دیکە جیاوازە، دەتوانین وەك گەیاندن بەکاری بێنین بۆ ناردن و وەرگرتنی نامەی ئەلیکترۆنی، هەروەها بۆ مەبەستی کۆبوونەوە لە دوورەوە، سەرەڕای بەکارهێنانی لە ئاڵوگۆڕکردن و ناردنی دۆسیە و بەرنامەکان و ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕا، یان توێژینەوەکردن لە بابەتێکی هاوبەشی نێوانی دوو گرووپی خەڵکێك.

زاراوای ئینتەرنێت لە وشەی ئینگلیزی (Net)ەوە وەرگیراوە کە واتای (تۆڕ) دەگەیەنێ، دواتر لە واتا فەرهەنگییە ئاساییەکەوە گۆڕدرا بۆ واتایەکیتر لە بواری تەکنۆلۆژیا و زانیاریدا، کە تۆڕی زانیاری یان تۆڕی ناردنی تەلەفزیۆنی و رادیۆیی دەگەیەنێ، واتای تۆڕی جیهانی (Intrnational Net work) ناگەیەنێ، بەڵکو واتای پەیوەندی نێوانیی (ناوخۆیی) تۆڕەکان (Intrnational Net work) دەگەیەنێ. بە چەند ناوێکی تریش هاتووە، لەوانە (the net)، تۆڕی جاڵجاڵۆکە (the web)، رێگەی ئەلیکترۆنی خێرای زانیارییەکان ( electronic sapir highway). بەپێی زاراوە، زانیارییەکان گوزارشتە لە کۆمەڵێك کەرەستە و بابەتی زانیاری ئامێزی گرێدراو، جا ئەگەر تۆڕەکان لۆکاڵی بێ یاخود فراوان.



ئینتەرنێت لە ژمارەیەکی زۆر لە تۆڕ پێکدێ کە ئەوانیش تۆڕێکی سەرەکی پێکدێنن، بە هۆی بوونی کۆمپیوتەر دەتوانرێ زانیارییەکان وەربگیرێ، بە پێی پڕۆتۆکۆڵێك لە نێوان بەکارهێنەران و بەڕێوەبەرانی ئەم تۆڕەدا دەبەسترێ. لە رووی بەکارهێنانەوە بە هۆی پەیوەستکردنی ئامێری کۆمپیوتەر لە رێگەی هێڵی تەلەفۆنەوە یاخود بە هۆی سات تێل لایتەوە بە تۆڕی جیهانی ئینتەرنێت دەتوانرێ لەهەر شوێنێك و لە هەر جێگەیەك بەکاربهێنرێ و بەهۆیەوە لە گرنگترین رووداوەکانی رۆژ و نوێترین هەواڵەکان و بە هۆی ئەو ماڵپەرانەی کە تایبەت بە گەڕان بە دوای زانیارییەکان هەرچی زانیارییەك کە بمانەوێ بەدەستی دێنین، هەروەها دەبێتە هۆی شارەزابوون و بەیەك ناساندنی شارستانی و رۆشنبیری و دابونەریتەکانی کۆمەڵگەی جیهان.

تۆڕی وێبی جیهانی (W.W.W) ئەو سیستەمەیە کە یارمەتیمان دەدات لە هەڵدانەوەی هەموو بابەتەکانی ماڵپەڕەکان بە سیستمی لاپەڕەکان، کە تەنیا بە فشار خستنەسەری بە ماوس، ماڵپەڕەکانمان بۆ دەگۆڕێ بەوەی کە خۆمان دەمانەوێ. کەواتە ئینتەرنێت وەك چەمکێك بریتییە لە کۆمەڵێك تۆڕی گەیاندن پەیوەندیدار پێکەوە چەندەها لایەن و دەزگای گشتی و تایبەتی بەڕێوەی دەبەن، گەنجینەیەکی زۆری زانست و زانیاری لە کۆمپیوتەرە ئینتەرنێتییەکاندا هەڵگرتووە، ئەمەش بریتییە لەسێ تۆڕی سەرەکی کە گرنگترینیان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانە، دوای ئەوەش تۆڕە مامناوەندەکانی زانکۆ و دامودەزگا گەورەکان دێ، ئینجا تۆڕە بچووکەکان دێ وەك تۆڕە ناوخۆییەکان و ئەو کۆمپیێتەرانەی کە لەلای تاکەکەسانەوە بەکاردێ، ئەمانەش هەموویان سەرچاوەی لە بن نەهاتووی زانیاری جۆراوجۆرن، کە بواری بۆ ملیۆنەها مرۆڤ لە سەرتاسەری جیهاندا دەرەخسێنن بۆ گەیاندن بە هۆی تێکەڵکردن و کاملکردنی تەکنۆلۆژیای گەیاندن و کۆمپیوتەرەوە.

ماڵپەر (home page)یش کە پێکهاتەیەکی سەرەکی تۆڕی ئینتەرنێتە بریتییە لە دەستنیشانکردنی شوێنێك یان رووبەرێك بۆ ئەوەی ئازادانە بانگەشە بۆ ئەو بابەتە یان کەلوپەلە بکەی کە دەتەوێ، بێ ئەوەی هیچ سنوورێك بۆ دەربڕینی بیروباوەڕەکەت هەبێ دوای دروستکردنی، ماڵپەرەکە پێویستی بە بوونی هێڵی تۆڕی ئینتەرنێت هەیە. دوو جۆری سەرەکی ماڵپەر هەن، یەکەمیان بەخۆڕایی دەتوانی دروستی بکەی، بەڵام توانای بارهەڵگرتنی تێدا زۆر نییە بۆیە بە شێوەیەکی فراوان بەکار نایەت، چونکە ناتوانی بەدڵی خۆت گوزارشت لە هەموو بابەتەکان بکەی، کە پاشکۆی (rd٤) یان (st٢) دێ پێش ئەوەی (com)ی بدەیتێ. جۆری

دووەم کە دوای ناوی ماڵپەرەکە راستەوخۆ (com) یان یەکێك لە جۆرەکانیتر دێن، ماڵپەر پاش تەواوبوونی دەخرێتە ناو تۆڕ و دەکرێ بخوێنرێتەوە.

ماڵپەڕ بەمانای کۆمەڵێکی تێکهەڵکێش لە فایلەکانی وێبی جیهانی ( world wide web) دێ و لەو فایلانە کە لە سەرەتادا کار دەکەن و بەناوی ماڵپەر یاخود لاپەڕەی سەرەکی دێ، واتە لە کاتی پەیوەستکردنی ئامێری کۆمپیوتەر بە هۆی تەلەفۆنەوە بە تۆڕی ئینتەرنێت یەکەم لاپەڕەی کە دەبێتەوە بە هۆی لێدانی ناونیشانی ئەو لاپەڕەیەی کە مەبەستە، ئەوە ماڵپەری ئەو شوێنە یاخود ئەو کەسە یاخود ئەو دەزگایەیە کە مەبەستە، ئەمەش بە زۆری کۆمپانیاکان یاخود تاکەکان یان دەزگاکان بە هۆی پێدانی ناونیشانی سەرەکی لاپەڕەکەیان یاخود ماڵپەرەکەیان، دەتوانین بچینە ناو ماڵپەرەکانیان و لە دوای ئەودا لە ماڵپەرەکانەوە دەتوانین بچینە ناو ئەو لاپەڕە لاوەکییانەی کە پەیوەستن بە لاپەڕە سەرەکییەکە.

لە رووی سیاسییەوە، ئینتەرنێت بۆتە ئامرازێك بۆ ئاڵوگۆڕکردنی بیروبۆچوونەکان، جگە لەوەی گرنگترین ئامرازی ئاڵوگۆڕکردنی بازرگانییە لە نێوان وڵاتاندا، بڕی ئەم ئاڵوگۆڕە لە ساڵی ٢٠٠٠دا گەیشتە نزیکەی دوو سەد ملیار دۆلار. بۆ بەجیهانیکردنی میدیا و گەیاندن، ویلایەتە یەکگرتووەکان هەوڵیداوە بۆ بەکارهێنانی ئەم تۆڕە بۆ گەیاندنی مەبەستەکانی، ئەویش بە بازاڕ پەیداکردن بۆ هەموو جۆرە بەرهەم و شمەکەکانی و بڵاوکردنەوەی کوولتورەکەی بە جیهاندا، هەروەها ناردنی بیروبۆچوون و دابونەریتی رۆژئاوایی بەگوێرەی شێوازی ژیانی ئەمەریکی، لە رێگەی پۆستی ئەلیکترۆنییەوە. ناردنی زانیارییەکی زۆر بە شێوەیەك کە لە بەرژەوەندی مەبەستەکانیدا بێ، لەم رێگەیەشەوە دەتوانێ چاودێری وڵاتە تازە گەشەسەندووەکان بکات و ئاگای لە جموجۆڵیان بێ. هەروەها هەوڵدان بۆ باڵادەستکردنی دەسەڵات و تاکڕەوی خۆی بە هۆی هەبوونی تەکنۆلۆژیای زانیارییەوە، سەرەڕای باڵادەستی بانك و پێگە زانیارییەکانی لەسەر ئەم تۆڕەدا، کە بێگومان دەربڕی تێگەیشتنی خۆیەتی لە بارەی هەموو دۆزێك لە جیهاندا. سوود وەرگرتن لە نەخوێندەواری تەکنەلۆژی لە جیهانی سێیەمدا، هەروەها بەربەست دانان لەبەردەم ئەو وڵاتانەدا لە برەودان بە پێشکەوتنیان، سەرەڕای ئەوەی هەندێ لەم وڵاتانە ئازادی تەواویان نییە یان بواری تەواویان بۆ نەڕەخساوە لە سوود وەرگرتن و هەڵبژاردنی ئەم لێشاوە زانیارییە، بۆ ئەوەی هەندێ لەو زانیارییە هەڵەو چەواشەکراوانە راستبکاتەوە کە پەیوەندیدارن پێیەوە فاکتەرێکی تری ئەم باڵادەستییەیە.



## سەرهەڵدانی ئینتەرنێت:

پەیدابوونی تۆڕی ئینتەرنێت دەگەڕێتەوە بۆ دوا مانگی ساڵی ١٩٦٩، کاتێك وەزارەتی بەرگری ئەمریکا دەستیکرد بە کردنەوەی پرۆژەیەکی ئەزموونی، تۆڕێکی ئینتەرنێتی سازاند بۆ بەستنەوەی وەزارتەکە بە کۆمپانیا گرێبەستەکان لە بواری توێژینەوەی سەربازی و ئەو زانکۆ و دامودەزگایانەی کە لەلایەن ئەم وەزارتەوە پارەیان پێدەدرا. بە هۆی پێشکەوتنی خێرای ئەم تۆڕە لە ساڵانی حەفتا و هەشتاکانی سەدەی رابردوودا حکوومەتی ئەمەریکا کاروباری رێکخستن و بەڕێوەبردنی ئەم تۆڕەی بە بەشداربووانی و هەندێ لیژنەی هونەری وڵاتەکەی سپارد. هاوکات پنتاگۆن بڕیاریدا بە ئەنجامدانی پرۆژەی سیستمی گەیاندن بۆ پێکەوە بەستنی نێوان کارگێڕییە جیاوازەکانی (ARPaNet) بە هۆی ئەوەی ئاژانسی پرۆژە توێژینەوە پێشکەوتووەکان (Darpa) بە جێبەجێکردنی پرۆژەکە هەستا، بە هاوکاری هەوڵە توێژینەوەییەکانی زانکۆ ئەمەریکییەکان، تەوەرە یەکەمەکان کە لە ئاکامی ئەم پرۆژە توێژینەوانە دەرکەوتن خۆی لە گەیشتن بە پەرەپێدانی تۆڕی ئارپا نێت دەبینێتەوە کە لە ساڵی ١٩٦٩ دروستبوو.

لە ساڵی ١٩٧٧ ئەم تۆڕە کۆمەڵە پرۆتۆکۆڵێکی پێشخست ناوی لێنا (پرۆتۆکۆڵی سانسۆر لەسەر ناردن و پرۆتۆکۆڵی ئینتەرنێت) کە تۆڕی ئینتەرنێتی پیشانداو بۆ یەکەمجار سیماکانی دیاریکرد. ساڵی ١٩٨٢ بۆ یەکەمجار زاراوەی ئینتەرنێت بەکارهات، کە بە هۆی ئامێرێکی بچووکەوە ئەنجامدەدرێ کە بە مۆدیۆم (modem) دەناسرێ، ئەم ئامێرە بەکاردێ بۆ گۆڕینی زانیارییەکان بۆ کۆکردنەوەی ئاماژەیەکی کارەبایی کە بە هۆی هێڵی تەلەفۆنەوە دەنێردرێ، هەروەها ئەمڕۆ ئامێری پێشکەوتووی دیجیتاڵ و سەتەلایت بەکاردێ بۆ وەرگرتنی داتاو زانیاری. لە ساڵی ١٩٨٦ دەزگای زانیاری نیشتیمانی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان یەکەم بنەمای تۆڕی ئینتەرنێتی داناو ناوی لێنا تۆڕی دەزگای زانیاری نیشتیمانی (NFNET). دواتر لە ساڵی ١٩٨٩ ناوی بۆ ئینتەرنێت گۆڕا، دوای ئەوەی حکوومەتی ئەمەریکا بڕیاریدا بە راگرتنی هاوکارییە مادییەکەی و کارکردنی وەك تۆڕێکی بازرگانی، ژمارەی ئامێرەکانی پەیوەست بە ئینتەرنێت گەیشتە سەد هەزار ئامێر.

لە ساڵی ١٩٩٠ (تیم بیرنرزلی) لە تاقیگەکانی ناوەندیی ئەوروپا بۆ توێژینەوەی وزەی ئەتۆمی (cern) لە ژنێڤ زمانی (html) ی داهێنا، ئەمەش بووە شێوازێکی زۆر ئاسان بۆ بەستنەوەی زانیارییەکان لە سەرتاپای ئینتەرنێتدا، هەروەها رێگەی خۆشکرد بۆ پەیدابوونی

تۆڕی جیهانی (WWW)، کە لە ماوەی چەند ساڵێکدا زیاتر لە تۆڕی باسکراو گەشەی سەند، کە ئەو ژمارەی پێشووە لە ساڵی ١٩٩٢ بۆ ملیۆنێك ئامێر بەرز بووەوەو لە ساڵی ٢٠٠٠ بووە ٢٠٠ ملیۆن و ئەمڕۆش بە ٦٥٠ ملیۆن ئامێر دەخەملێنرێ کە پەیوەستبن بە ئینتەرنێتەوە، کە ژمارەیەکە دەکاتە بەرابەر نزیکەی یەك لە دەی دانیشتوانی سەر زەوی. بەرە بەرە پێشکەوتن لەم بوارەدا وایلێهات کە لە توانای هەموو کۆمپیوتەرێکی کەسیدا بوو سوود لەو تۆڕە وەربگرێ.

## خەسڵەت و شیانەکانی ئینتەرنێت:

مەودایەکی فراوان هەیە لە خزمەتگوزاری دەستەبەربوو لە ڕێگەی تۆڕەکانی ئینتەرنێتەوە، بەجۆرێك ئینتەرنێت ئامرازێکی گەیاندن و سەرچاوەیەکی فێربوونی بازرگانی و ئامرازێکی خۆش رابواردن و هەڕمێن خستن و برەوپێدانی پێشکەوتووە بۆ ئەوپەڕی سنوور. ئینتەرنێت بایەخیکی جیاوازی لە هەموو بوارەکانی سیاسی و هزری و سەربازی و ئابووری و کۆمەلایەتی و زانستی بۆ خۆی پەیداکردووە و تەنها ناوەندێکی نویێ نییە، بەڵکو شتێکە وا دەکات، کە کاری کۆمەڵێك لە هۆکاری پەیوەندی پێکەوە بکرێ، بەهەمان ئەو ڕێگایانەی کە تەلەفۆن و تەلەفزیۆن کاری پێدەکەن، مرۆڤ سەری سووڕ دەمێنێ لە بارەی ئەو هەموو خزمەتەی ئەم تۆڕە لەسەر هەموو ئاستەکان پێشکەشیدەکات.

### دیارترین خزمەتگوزارییەکانی ئینتەرنێت:

١- ئامرازێکی گەیاندن: لەو کاتەی ئینتەرنێت برەوی پێدراوە وەك ئامرازێك بۆ هەموو شێوەکانی گەیاندن بەکاردێ، بەتایبەتی گەیاندنی دوو قۆڵی کارلێککراو، کە گفتوگۆ بە دەنگ و وێنە دەبێ و زانینی گرنگترین رووداوە جیهانی و ناوخۆییەکان لە خێراترین کات و بە کەمترین تێچوون. هەروەها خزمەتگوزاری پۆستی ئەلیکترۆنی (E-Mail) بۆ ئاڵوگۆڕی نامەی ئەلیکترۆنی لە نێوان هاوبەشەکان لە هەر کوێیەکی جیهاندا بێ و لە چەند ساتێکی کەمدا. هاوکات بەکارهێنانی ئینتەرنێت وەك سەرچاوەیەکی سەرەکی هەواڵ پشتی پێدەبەسترێ، پێشکەوتنی تەکنەلۆژی لە بواری کۆمپیوتەر گەیشتۆتە بوارەکانی هەواڵی تەلەفزیۆنی، بەجۆرێك دەکرێ تۆڕی جاڵجاڵۆکەیی لەلایەن پەیامنێرانەوە بەکاربهێنرێ بۆ ناردنی بەرهەمە هەواڵییەکانیان بۆ کەناڵە تەلەفزیۆنییەکانیان لە سەرانسەری جیهاندا.



٢- سەرچاوەیەکی فێربوون و رۆشنبیری: ئینتەرنێت تا ئەوپەڕی سنوور فێربوون و رۆشنبیریی پێشکەشدەکات، بەکارهێنەرانی دەتوانن بگەنە بنەمای داتاو دەقی وتاری گۆڤارەکان و بڵاوکردنەوەی توێژینەوە و سەرچاوە جیاوازەکانی ئینسکلۆپیدیا و بەڵگەنامە و چاپەمەنییە جۆراوجۆرەکان لە سەرانسەری جیهاندا، هەروەها یارمەتی توێژەر و قوتابیان دەدات لە پەیوەندی راستەوخۆیان بەیەکتر بۆ ئاڵوگۆڕی راوبۆچوون لە بارەی تاقیکردنەوە توێژینەوەیی و زانینە هاوشێوەکان. هەروەها ئینتەرنێت توانای نوێ بۆ فێربوونی کراوە و فێرکردن لە دوورەوە دەڕەخسێنێ بۆ ئەو قوتابیانەی کە لەناوچە دوورە دەستەکاندا دەژین و ئاسانکاری پێویستی فێرکارییان بۆ فەراهەم دەکات بۆ توانادارکردنیان لە فێربوون بەدرێژایی ژیانیان. هەروەها بەخشینی توانای بەشداریکردنە لە گردبوونەوە نێودەوڵەتییەکان و ژوورەکانی چاتدا.

٣- سەرچاوەیەکی بازرگانی: لەم ساڵانەی دواییەدا بواری کارکردن وردە وردە بایەخی زۆری پێدەدرێ لەسەر ئینتەرنێت، بەڵام هێشتا زۆر پرسی هونەری هەن پەیوەستن بە قەبارەی چوارچێوەو مەودای بەرسڤەوە، کە هێشتا پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە بۆ ئەوەی بگەینە راستگۆیی و بڕواپێکراوی مامەڵە بازرگانییەکان لەسەر ئەم تۆڕە (web)، کە تۆڕێکی تەواوە لە بازاڕە بازرگانییەکان کە کاڵاو هاوردە یان فرۆشیار و بەکاربردنە لە سەرانسەری جیهان خۆیان تیا دەنوێنن.

٤- ئامرازێکی ئاسوودەکردن و هەڕمێنکردن: ئینتەرنێت توانایەکی بێ کۆتایی هەیە، بۆ ئەوەی ببێتە سەرچاوە و ئامرازێکی ئاسوودە و هەڕمێنکردن بۆ بەکارهێنەران بە سەرجەم تەمەن و ئاست و بایەخەکانیان، ئێستاش ژمارەیەکی یەکجار گەورە لە یارییەکانی کۆمپیوتەرو بوار و خەسڵەتەکانی ڤیدیۆ و دەنگییەکان وێنەی تەلەفزیۆنی راستەوخۆ دەگرێتەوە، ئەمە جگە لە خزمەتگوزارییە بیستن و بینینییەکان وەك ناردنی نامەی دەنگییان بۆ کەسێ یان هەندێ کەس و پەخشکردنی زانیارییە بیستن و بینینییەکان، بواردان بە تەماشاکردنی دیوکۆمێنتە جۆراوجۆرەکان. هەروەها ئینتەرنیت رۆڵێکی گەورەی بینیوە بۆ بە زانستیکردنی کۆمەڵگەکان و نزیککردنەوەی سنوورەکان لە یەکتر، هەروەها دروستکردنی گۆڕانکاری جۆراوجۆر لە ناو کۆمەڵ و کۆمەڵگەکاندا چ بە لایەنی باش بێ یان خراپ.

چاوەڕوان دەکرێ لە ساڵانی داهاتوو ئینتەرنێت ببێتە سەرچاوەیەکی سەرەکی لە بەرهەمە هەڕمێنکردنەکان کە لەسەر رادیۆ و تەلەفزیۆن و ڤیدیۆ و (CDRom) دەستەبەر بووە، بەمشێوەیە ئینتەرنێت بووە ئەو ئامرازە کاریگەرانە لە دەسکەوتنی بەرهەمەکانی هەڕمێنکردن.

**خەسڵەتە تایبەتییەکانی ئینتەرنێت:**

١- ڕەوایی و ڕاستگۆیی: سەرجەم کۆت و پێوەندەکان لەسەر بەکارهێنانی خزمەتگوزاری وێب لە بواری ئەکادیمی پەیوەستن بە درککردنی ڕەوایی و ڕاستگۆیی و بەڵگەنامە ژمارەییەکان، واتە وەرگرتنی بەڵگە دەستەبەربووەکان لە شێوەی ئەلیکترۆنیدا تەنیا بە بەشێك لە تۆماری ئەکادیمی فەراهەمبوو بۆ توێژینەوەی زانستی پەیوەستە و گرفتی یەکەم کە پەیوەستە بە ڕەوایی، پەیوەستە بە نهێنی ئەدەبی، ئاسانی کۆپیکردنی دەقە ئەلیکترۆنییەکان هەڵی ناهاوسەنگ دەرەخسێنێ بۆ قسە هەڵبەستن و دزینی ئەدەبی. بەڵام گرفتی دووەم پەیوەستە بە سەختی لە دەستنیشانکردنی بەڵگەنامە ئەلیکترۆنییەکان. گرفتی سێیەم پەیوەستە بە خێرایی و بەردەوام لە ناوچوون، وایلێهاتووە هەندێجار بە تێڕوانینێکی نێگەتیڤ سەیری تۆڕی ئینتەرنێت و خزمەتگوزاری وێب دەکرێ، سەرەڕای ئەوەی پێشکەشی کردووە لە چوارچێوەی پاڵپشتی گەیاندنی جیهانی و پەلەکردن لێی و پشتگیری لە بڵاوکردنەوەی لۆکاڵییانەی بۆ زانیارییە ئەلیکترۆنییەکان و ئاسانکاری بە ئەنجامدانی پرۆسەکانی وانەوتنەوە بەهاوکاری کۆمپیوتەرە و پاڵپشتی ستراتیژییەتەکانی فێرکردن لە دوورەوە، هەروەها وێب دەتوانێ لە زیادبوونی داهاتی دەزگا بازرگانییەکان بەکاربهێنرێ لەمیانەی ڕێکلام و پاراستنی پەیوەندییە بازرگانییەکان و ئەنجامدانی پرۆسە جۆراوجۆرەکانی هەرمێنکردن، بەجۆرێك پاڵپشت بێ بۆ جهانگیریەتی و ڕووبەڕووی دیاریکردنی ڕکابەری بازرگانی ببێتەوە.

٢- ڕزگاربوون لە وەهم و مشتومڕ: لەم ساڵانەی دوایی هەندێ بەڵگە ئاشکرا بوون بەوەی بەکارهێنانی ئینتەرنێت لەوانەیە تارادەیەك لەسەرخۆ و بێ ئومێدانە بێ و تۆڕی ئینتەرنێت مشتومڕو ناکۆکییەکی زۆری دروستکرد لە نێوان ئەو بەکارهێنەرانەی کە لە بنەمادا لە زانایان و شارەزایانی کۆمپیوتەر و سیستمەکانی زانیاری بوون کە بانگەشەی ئازادی زانیارییەکانیان دەکرد، بەڵام بە گەشەی ئینتەرنێت و تەواوبوونی لەگەڵ پێداویستییەکانی کۆمەڵگە و پەیڕەوکردنە بازرگانی و گرێبەستییەکەی بەسیفەتێکی گشتی، زۆر لە حکوومەتەکان هەوڵیاندا هەندێ یاسا دابڕێژن کە کۆنترۆڵی ماددە پێشکەوتوو و فەراهەمبووەکانی سەر ئینتەرنێت بکەن کە لەو بەکارهێنانە ناگونجاوانە بیپارێزن کە لەگەڵ بەها و دابونەریتی کۆمەڵگە یەکناگرێتەوە، لە ئەنجامی ئەمەدا ململانێ و مشتومڕ لە بارەی پرەنسیپی ئازادی لە بڵاوکردنەوە و ئاگاداری دەرکەوتن.

٣- کەمیی تێچوون: سەرەڕای پێشکەوتنی خەسڵەتی بازرگانی ئینتەرنێت بە خێراییەکی زۆر، بەڵام زۆر لە دەزگا و ڕێکخراو و زانکۆ و پەیمانگە توێژینەوەییەکان زانیاری و



سەرچاوەکانیان بەبێ بەرابەر بۆ بەشداربوان دەستەبەر دەکات، وەك پشتگیرییەك بۆ ئەرکەکانی توێژینەوە کە کات و ماندوبوونێکی کەمی دەوێ، ئەکتیڤی تێچوونی تەکنۆلۆژیا پەیوەستە بە ڕێنماییکردنی کاتی دیاریکراو بۆ بەکارهێنەران و وردیی بودجە دەستەبەربووەکان لە خزمەتگوزارییە جیاوازەکان.

٤- ئاسانی بەکارهێنان: پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیای پێشکەوتوو و پەرەپێدانی پرۆگرامکارییە نوێیەکان بەتایبەتی ئاستگەلی نوێ و زۆر پێشکەوتوو بۆ کارلێکە دینامیکییەکان دەبێتە هۆی بەکارهێنانی ئینتەرنێت بەئاسانی.

٥- نوێگەری و دەستبەجێیی: تۆڕی وێبی جیهانی هەموو نوێیەکی تۆمارکراو لەسەری پێشکەش بە بەکارهێنەرانی دەکات، بەمەش وێب وەك ئامرازێکە بۆ کەمکردنەوەی مەوداکان و کۆتاییهێنان بە سنووری دەستکرد لە نێوان بوارەکانی فێربوونی پێکەوە بەستراو.

چەند ساڵێکە ئینتەرنێت بە چەشنێکی خێرا خۆی خستۆتە ناو پێکهاتەی جیهانی مرۆڤەکانەوە، ئەم دۆخە نوێیە وای لە زۆربەی زانایانی ئینفۆرماتیك و دەروونناسان کردووە بگەنە ئەو بڕوایەی کە ئینتەرنێت وەکو بەرهەمێکی کۆمەڵگەی زانیاری و تەکنۆلۆژیای پەیوەندی داهاتووی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لە بناغەوە دەگۆڕێ. لە ماوەی ئەم چەند ساڵەی دواییدا بەشداربوانی تۆڕی ئینتەرنێت بەڕێژەیەکی زۆر زیادی کردووە، کە دەتوانن ئینتەرنێت بۆ پۆستی ئەلیکترۆنی و بەرنامەی پەیوەندیکردن بە کۆمپیوتەری دیکەوە و بەرنامەی ئاڵوگۆڕی فایل و دۆسییەکان و وێستگەی گفتوگۆکردن و گرێدەری تۆڕی جاڵجاڵۆکەیی جیهانی (W.W.W) بەکار بێنن. بێگومان ئەم ئامرازەش لایەنی باش و خراپ لەخۆدەگرێ لێرەدا ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین:

**لایەنە باشییەکانی:**

- کۆکردنەوەی سەرجەم ئامرازەکانی میدیای زانیاری کە مرۆڤ- پێویستی پێیان هەیە، بە بەکارهێنانی نوێترین تەکنۆلۆژیای سەردەم لە گشت بوارەکاندا.
- لە جیهانی ئینتەرنێتدا هەموو کەس و گرووپێك دەتوانێ پیایدا بێ پاسپۆرت و بێ سانسۆر و بێ لێپرسینەوە هاتوچۆ بکات، مرۆڤ تێیدا دەتوانێ هەموو ئەو زانیاریانەی کە دەیەوێ وەریبگرێ، یان بڵاوی بکاتەوە.
- ئینتەرنێت بۆتە ناوەندێکی بازرگانی و لە توانایدا هەیە پەیمانی ڕێککەوتن و گرێبەستە بازرگانییەکان بەهۆیەوە مۆر بکرێ.

– بەکارهێنانی لەلایەن گشت توێژ و چینەکانی کۆمەڵ، بەمەش کارمەندان زیاتر شارەزای بوارەکەی خۆیان دەبن و دەتوانن ڕۆژانە لەو کۆڕ و سمینارانەی لە بوارەکانیان ساز دەکرێ بەشدار بن.

– بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیری و زانستی جەماوەر بە گشتی و لاوان بەتایبەتی، چونکە بەکارهێنەر شارەزای ڕووداوە گەرم و تازەکانی جیهان دەبێ و دەتوانێت ببێتە خاوەن هەڵوێست و بڕیار بدات.

**خراپییەکانی:**

– نەبوونی هیچ یاسایەکی نێودەوڵەتی بۆ سزادانی ئەو بەکارهێنەرانەی کە لە ڕێگەی تۆڕی ئینتەرنێتەوە هێرش دەبەنە سەر بیرو دابونەریتە پیرۆزەکانیتر و دەبنە هۆی دروستبوونی چەندین کێشەی کۆمەڵایەتی ترسناک.

– بە فیڕۆدانی کاتێکی زۆر لەلایەن لاوان بە تایبەتی بە کردنەوەی ماڵپەرە سێکسییەکان، هەروەها زۆرجار بە هۆیەوە تووشی لادان و بەدڕەوشتی دەبن، بەوەی ئەو لاوە هەوڵدەدات بەهەر جۆرێك بێ پارە پەیدا بکات بۆ چوونە سەر ئینتەرنێت بۆ دامرکاندنەوەی غەریزەکانیان.

– دیارنەبوونی خاوەنەکەی بۆ ئەوەی لە کاتی پێویست ئەگەر کارێکی ناڕەواو نایاسایی بکرێ سزا بدرێ، ئەمەش ڕێگە خۆشدەکات بۆ ئەوەی گەندەڵکاری بکرێ.

– لە ئەنجامی بازرگانی ڕێگە پێنەدراو لە ڕێگەی ئینتەرنێت، خەڵکێکی زۆر پارەیەکی چاکیان دەستدەکەوێ وەك پارە سپیکردنەوە.

– زیادبوونی ژمارەی ئەو ماڵپەرانەی کە لەلایەن ڕێکخراو و کۆمەڵە تیرۆریستەکانەوە بەکاردەهێنرێن، بۆ ڕێکخستن و سەرپەرشتیکردنی کردە تیرۆریستییەکان لەسەرانسەری جیهاندا، لە هەمووش مەترسیدارتر ئەوەیە کە ناکرێ ئەم ماڵپەرانە قەدەغە و بنبڕ بکرێن.

## ئینتەرنێت و گۆڕان لە کۆمەڵگە:

لە بیست ساڵی ڕابردوودا ئابووریی جیهان بە هۆی پەرەسەندنی بەکارهێنانی کۆمپیوتەر و بەکارهێنانی زیاتر و لەبەردەستبوونی ئینتەرنێت وەك تۆڕێکی پەیوەندی گشتی، گۆڕانێکی زۆری بەسەردا هاتووە. هەر بەو ڕێژەیە کە چالاکییە ئابوورییەکان لە ساڵانی ١٩٥٠ دا بە تەلەفۆن و لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا بەهێڵی ئاسنین گرێدراو بوون، ئەمڕۆ ئەو چالاکییانە بە بەردەوامی لەسەر بنەمای توانای تۆڕەکانی ئینتەرنێت ئەنجامدەدرێن، ئەو



گۆڕانکاریانە لە حاڵێکدا ڕوویانداوە کە تەکنۆلۆژیا و پیشەسازیش شۆڕشی خۆیان تاقیکردۆتەوە. ئینتەرنێت، کە سەرەتا وەك تۆڕێك بۆ گۆڕینەوەی خێرای زانیارییەکان لە نێوان کۆمپانیاکان و ئاسانکردنەوەی چالاکییە بازرگانییەکان لە ئاستی کەم و زۆردا دروستببوو، ئێستا وەك ئامرازێك بۆ دەربڕینی بیروڕاکانی لێهاتووە، لە ئاکامدا ڕەهەندە سیاسی، مۆدێلەکانی میدیا و ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی لە حاڵی گۆڕاندایە.

میدیاکان، هاووڵاتیانی ڕۆژنامەنووس، نووسینی وێبلاگ و چالاکییە کۆمەڵایەتییە ئینتەرنێتییەکان، لوتکەی لەناوچوونی پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکانی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم و پەرەسەندنی پەیوەندیی نوێ نیشاندەدات. پاش بڵاوبوونەوەی مانگی دەستکرد و خزمەتگوزارییەکانی تۆڕی ئینتەرنێت، جیهان بوو بە دێیەکی زۆر بچووك هەر ڕووداوێك لە هەر سووچێکی ئەم گۆی زەمینە ڕوودەدات پاش چاوترووکانێك هەموو خەڵکی پێی دەزانن.

ئێمە لەبەرابەر دوو جۆر لە ڕەخنە و ڕاڤە کردنین، سەبارەت بە کاریگەرییە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی تەکنۆلۆژیای پەیوەندی مۆدێرن، ئەو تەکنۆلۆژیایەی کە لە سەردەمی دروستبوونی ڕادیۆوە، وەکو مۆدێلێکی پەیوەندی بەستن، ئامادەیەو بە تێپەڕبوون بە سینەماوە تا دەگاتە ئینتەرنێت. لەلایەکەوە زاناو فەیلەسووفانی وەکو (ئێنتزنبێرگەر و ماکلۆهان و لیتگەڤن) توانای دیموکراسی میدیای ئەلیکترۆنی زەق دەکەنەوە و ئاراستەی دوارۆژی بۆ مرۆڤایەتی گەشبینانە دەبینن. لە بەرابەردا فەیلەسووفانی وەکو (ئەدۆرنۆو هابەرماس و ڤیریلیۆ ... هتد)، مەترسییەکانی ئەم میدیایە بۆ سەر ئازادییە دیموکراسییەکانی ناو کۆمەڵگەو پرۆسەی بەکۆمەڵگەبوونی نوێ دەستنیشان دەکەن و دوارۆژی مرۆڤایەتیش ڕووبەڕووی ئەگەری گەورە و ترسناك دەکەنەوە. ڕاستییەك هەیە کە بناغەی میدیای دیجیتاڵی نوێیە، ئەویش ئەوەیە کە چ کۆمپیوتەر و چ ئینتەرنێتیش میدیای خوێندنەوە نین، بەڵکو پتر میدیای ئۆرگانیزەکردن و پاراستن و نمایشکردن و وەرگرتن و ناردن و کۆنترۆڵکردنی زانیارین.

لەم جیهانە ئەلیکترۆنییەدا ئێمە توانایەکی گەورە و جێگۆڕکێمان هەیە، دەتوانین هەمیشە لە نیشتمانێکەوە بۆ ئەویدی هاموشۆ بکەین، ئەو نیشتیمانەی کە بە دڵمان نەبێ دەتوانین بە پرتەی ماوسێك زوو بەجێی بهێڵین. ئینتەرنێت ئەو خانووە جاڵجاڵۆکییەیە کە بەردەوام لە گەورەکردنەوەی ڕووبەرەکانیدایە و تاڵەکانی بە چەشنێکی خێرا لە کشان و چنینی خانەی تردایە و هیچ ڕووبەرێك نامێنێتەوە کە بێبەری بێ لە پەلاماری جاڵجاڵۆکیانەی ئەم دەرکەوتە، واتە بۆ ئەوەی هەبێت دەبێ بەشێك بیت لە کۆمەڵگەی ئەم سیستمە نافیزیکییە.

لەم سەردەمەدا ئینتەرنێت یەکێکە لە کەناڵە سەرەکییەکانی پەیوەندیکردن لە نێوان خەڵك لە سەرتاسەری جیهاندا، ئەو کەناڵە گرنگ و پڕ بایەخەی پەیوەندیکردنە کە بە هۆیەوە خەڵکان لە هەر گۆشەیەکی ئەم جیهانەوە دەتوانن پەیوەندی لەگەڵ یەك ببەستن. لە ساڵی ١٩٩٧ ژمارەی بەشدارانی تۆڕی ئینتەرنێت بەلایەنی کەم بە شانزە ملیۆن بەشداربوو خەمڵێنرا، لە کاتێکدا ئەم ژمارەیە لە ساڵی ١٩٩٥ پێنج ملیۆن بەشداربوو بوو، بەڵام لە ساڵی ١٩٩٨ ژمارەی کۆمپیوتەرە بەشداربووەکانی پەیوەست بوو بە تۆڕی ئینتەرنێتەوە پەنجا ملیۆنی تێپەڕاند و لە ساڵی ٢٠٠٦ هەژدە هەزار رۆژنامەنووسی ئەمەریکی کاریان لەدەستداوە بە هۆی بەکارهێنانی ئینتەرنێت لەلایەن خەڵکەوە، ئێستا رۆژانە زیاتر لە یەك ملیار کەس ئینتەرنێت بەکاردێنن.

بە پێی لێکۆڵینەوەیەك کە ئەمساڵ دامەزراوەی لێکۆڵینەوەی (Pew) ئەنجامیداوە و لەگەڵ زیاتر لە ٧٤٢ شارەزای بواری کۆمپیوتەر و سیاسەت و بازرگانی دواوە، تا ساڵی ٢٠٢٠ بڵاوبوونەوەی تۆڕی ئینتەرنێتی خێراو هەرزان، دەبێتە هۆی وەدیهێنانی ملیۆنان ئامێر لە سەرانسەری جیهاندا. زیاتر لە نیوەی ئەو کەسانە لە بارەی داهاتووی ئینتەرنێت گەشبین بوون، لەبەرابەردا ٤٦٪ی بەشداربوان بە ترسەوە باسیان لە داهاتووی ئینتەرنێت کردووە. نزیکەی ٦٠٪ی ئەم شارەزایانە رایانگەیاندووە کە ئینتەرنێت لە هەندێ وڵاتان بۆتە هۆی زیادبوونی کێشەی کۆمەڵایەی و هەندێ تاوان کە دەتوانرێ بە کۆنترۆڵی دروست و بەجێ بەئاسانی چارەسەر بکرێ. لێکۆڵینەوەکە جەخت دەکاتەوە لەسەر بەربڵاوکردنەوەی تەکنۆلۆژیا بۆ پێشکەوتنی ئینتەرنێت لە داهاتوودا.

لەوەتەی مرۆڤایەتی لە بووندایە، ئامرازێکی ئەوتۆی پەیوەندی بەخۆوە نەدیوە کە هەڵگری ئەو خەسڵەتانە بێ وەك ئینتەرنێت هەیەتی، بەڵام ئایا ئەوەش ئامرازێکی ئازادە، یان چەشنی زۆربەی دیاردەکانی نێو جیهانەکەمان ملکەچی تاك جەمسەرییە؟ تا ئەمڕۆش ئەمەریکا کۆنترۆڵ و دروستکەری زیاتر لە ٧٠٪ی ناوەڕۆکی ئینتەرنێتە، بەڵام لەچاو ئامرازەکانی دیکەی پەیوەندیی، لەو خاڵەدا بێ وێنەیە کە بە توانایەکی بەرزەوە بواری سوود وەرگرتن لە ئامرازەکانی دیکەی پەیوەندی و میدیا دەرەخسێنێ، تەنها لە رێگەی تاکە ئامێرێکەوە ئەویش کۆمپیوتەرە و لە رێی یەك تۆڕەوە بێ ئەوەی مەسەلەکە پێویستی بە مەعریفەیەکی باوەڕپێکراو بە پرەنسیپەکانی تەکنۆلۆژیا هەبێ، کە لەم بەکاربردنەی پرۆسانەدا بە شێوەیەکی ئاڵۆز و جۆراوجۆر پشتی پێ دەبەستێ، وەکو (فینت سرف) سەرۆکی ئەنجوومەنی



بەڕێوەبەرایەتی ئینتەرنێت دەڵێ: "ئینتەرنێت لە زۆر رووەوە لە ئامرازەکانی دیکەی پەیوەندی پێش خۆی دەچێ، بەڵام بەوە جیادەکرێتەوە کە بەکارهێنانی زۆر و جۆراوجۆرەوە لە توانایدایە لە یەك کاتدا چەند کارێك بکات، ئەمەش لە توانای هیچ ئامرازێکی دیکەدا نییە.

چەند گلەیی و رەخنەیەك لە ئینتەرنێت هەن، (دیبۆرا سۆیار) دەڵێ "برێکی زۆر لەو زانیاریانەی ئینتەرنێت پێشکەشی دەکات هەروا بەئاسانی بڕوا بە راستییەکەی ناکرێ و ناشتوانرێ بڕیار لەسەر راستی و دروستی ئەو زانیارییانە بدرێ، چونکە نەکەوتوونەتە ژێر چاودێری پێداچوونەوە". ئەمە دەبێتە هەڕەشەیەکی راستەوخۆ لە داهاتووی ئینتەرنێت، لەوەی تا بڕی زانیارییەکانی نێو ئینتەرنێت زیاتر بێ ئاستی باوەڕ پێکردنیان کەمتر دەبێتەوە و بێ سوود و بێ ماناتر دەبێ. لەلایەکی دیکە ناوبراو ئاماژە بەوە دەکات دەورووبەرەکەی جیا ببێتەوە، واتا گەرچی لە رێی پۆستی ئەلیکترۆنییەوە پەیوەندیان زۆرە، بەڵام لە چۆنییەتی پەیوەندییە راستەوخۆ و گەرم و گوڕەکان دوور دەکەونەوە، ئینتەرنێت لێرەدا هەرچەندە ئامرازێکە بۆ بەردەوامی و قووڵکردنەوەی پەیوەندییەکان بە ئاسانی و بە خێرایی، لە هەمانکاتدا دەبێتە هۆی جیابوونەوە و تێکچوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان.

لەگەڵ ئەوەی خەڵکی بە شێوەیەکی گشتی رووی لێدەکەن کەچی هێشتا زۆربەی خەڵك لەم خزمەتگوزارییانە بێبەشن، یان ژمارەیەکی زۆری وڵاتان کۆسپ لە بەردەم بەکارهێنانیدا دادەنێن، بەتایبەتی وڵاتانی جیهانی سێیەم، ئەمەش کەلێنێکی گەورە دروستدەکات لە توانای پەیوەندی و وەرگرتنی زانیارییەکان لە نێوان (ئەوانەی هەیانە و ئەوانەی نیانە)، یان دروستبوونی بۆشاییەکی گەورە لە نێوان نەوەی کۆن و نەوەی نوێدا، لە نێوان باوك و باپیر لەگەڵ نەوەکانیاندا، بێگومان نەوەکان لە توانای بەکارهێنانی کۆمپیوتەر و ئینتەرنێتدا پێش باوانیان دەکەون، ئەمەش شتێکی سروشتییە، چونکە باوکان ناتوانن بەئاسانی دەست لە نەریت و جۆری بیرکردنەوە و کارکردنیان هەڵبگرن، بۆیە پێویست وابوو چارەسەری ئەم حاڵەتە بکرێ، پێدەچێ تاکە چارەسەریش بریتی بێ لە بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری ئینتەرنێت لەسەر فراوانترین ئاستەکانی و کار بۆ دابینکردنی خزمەتگوزارییەکان بکرێ بە شێوەیەك بۆ هەمووان بێ، بە چاوپۆشین لە توانای ئابووری و زەینی کەسەکان ئەمەش لە بەرژەوەندی حکوومەتەکانە ئەم سیاسەتە رەچاو بکات، هەتا سوود لەو زانیارییانە وەربگرێ کە لەسەر تۆڕە جیهانییەکانە، لە پێنا و هێنانەدی گەشەپێدان و باڵابوونی ئاستە رۆشنبیری و سیاسی و ئابوورییەکانی میللەتەکەیان. بە پێی هەندێ ئامار، زیاتر لە ٤٠٠ ملیۆن کەس لە جیهاندا ئامێری

ئینتەرنێت و کۆمپیوتەر بەکاردێنن رەنگە ئەم رێژەیە کەمتر بێ لەکۆی دانیشتوانی جیهان، گەرچی هیوای بەرزبوونەوەی ژمارەکە بۆ یەك بلیۆن کەس لە ماوەی چەند ساڵی داهاتوودا دەکرێ، زیادبوونی ژمارەی بەکاربەرانیش لە جیهانی سێیەمدا هەستپێکراوە.

ئەو سەختییەی دەکەوێتە بەردەم کاری بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری ئینتەرنێت بەرای زۆر کەس پێویستی بە دانانی سیاسەتێکی بڕیار لەسەر دراوی وردی بەڕێوەبردنی ئینتەرنێت دەبێ، هەروەها بایەخدانی پێویست بە پرۆسەکانی پەرەپێدانی ژێرخانی تۆڕەکە (بەتایبەتی خودی کۆمپیوتەر) و خستنەگەڕی ئەو پرۆتۆکۆڵانەی تایبەتن بە گۆڕینەوەی زانیارییەکان، لەگەڵ چەندین ئەرکی دیکەی بەڕێوەبردن کە دابینکردنی ئەم خزمەتگوزارییانە لە هەموو جیهاندا زامن دەکات. ئێستا دەستەی ئینتەرنێتی تایبەت بە ناو و ژمارەکان (ICANN) ئەمەریکی ئەم کارەی لە ئەستۆ گرتووە، چەند هەوڵێکی ناوخۆییش هەیە بۆ رزگارکردنی ئەم دەستەیە لە قۆرخکاری ئەمەریکی، کە زۆر لە وڵاتانی یەکێتی ئەورووپی و تازە پێگەیشتووی نیگەران کردووە، زۆر لە وڵاتان ئەوەیان رەتکردەوە کە هەژموونی ئەلیکترۆنی ئەمەریکی باڵادەست بێ، ئەویش لە پاڵ دەسەڵاتە زۆردارییەکەی بەسەر هەموو ئامرازەکانی میدیا و ئامرازە رۆشنبیرییەکانی دیکە. لەبەر ئەوە ئەم دەستەیە دووچاری زۆر لە هۆکارەکانی کێشکردن لەلایەن هێزە سیاسییە جیاوازەکانەوە دەبێتەوە، بەتایبەت لە رووی هەژموونی زانیارییەکان یان ئەوەی ئێستا بەناوی (هەژموونی کۆد) دەناسرێ.

ئەم ترسە لە هەژموونی رۆشنبیری ئەلیکترۆنی لە رێگەی ئینتەرنێتەوە، بۆ نەوەکانی سەدەی رابردوو دەگەڕێتەوە، بەتایبەتی کە زمانی ئینگلیزی زمانی کۆمپیوتەر و ئینتەرنێتە، واتە زۆربەی ئەو شتانەی لە لاپەڕەکانی ئینتەرنێتدا دەردەکەوێ هەموو بە زمانی ئینگلیزییە و ئەو میللەتانەی نیگەران کردووە کە بە زمانی ئینگلیزی نادوێن، بەوەی زمانی ئینگلیزی وا دەکات زمان و کوولتوری ئەوان بچێتە پەراوێز. مەسەلەکە هەر چۆن بێ، ئەوانەی بایەخ بە سیاسەت و داهاتووی ئینتەرنێت دەدەن، بە هیوان کە ئینتەرنێت زیاتر پەرەسەندن و توانای باشتر بە خۆوە دەبینێ، بە جۆرێك لەگەڵ گۆڕانگارییەکاندا بگونجێ، بۆیە ئێستا باس لە داهاتووی ئینتەرنێت ناکەن، بەڵکو باس لە (ئینتەرنێتی خێرا) دەکەن، بە جۆرێك ئێستا گاڵتە بەم ئینتەرنێتە و خاوی کارکردنەکەی دەکرێ، واتە وشەی کۆتایی لە پەرەسەندنی ئینتەرنێتدا هێشتا نەوتراوە، چونکە تا ئێستاش زانست و تەکنۆلۆژیا پێکەوە لە هەوڵی هێنانەدی توانای زیاتردان.



مرۆڤ کە بیر لە داهاتووی ئینتەرنێت دەکاتەوە، ئەوەندە بەسە بپرسێ جیهان بەر لە پۆستی ئەلکترۆنی و ئەو تەکنۆلۆژیایە چۆن دەژیا؟ یان گوگڵ و دەیانیتر چۆن رووبەڕووی پەیوەندیکردنیان بە جیهانەوە دەبوونەوە. کە بێ ماندوبوون وەك ئەمڕۆ رۆژانە لاپەڕەی سەدان رۆژنامە و گۆڤار و هەواڵ و نوێترین فیلم و بابەتە هونەرییەکانی دیکە ببینێ، کە راستەوخۆ ئەو کەسانە ناناسێ، کەچی لە بایەخەکانیاندا بەشدارە. زۆر لە قوتابخانە فیکری و ئیجتیهادییەکان وای دەبینن کە تۆڕی ئینتەرنێت هۆکارێکی سەرەکییە لە سیستەمی هەژموونی نوێی هاتوو لە رۆژئاواوە کە ویلایەتە یەکگرتووەکان رابەرایەتی دەکات.

ئایا ئینتەرنێت وا دەکات جیهان ئازادتر بێ؟ هەندێ بە بەڵێ دووپاتی دەکەنەوە، وەك (جۆن بیری بارلو) لە دەزگای سنووری ئەلیکترۆنی، کە لە ساڵی ١٩٩٦ سەربەخۆیی ئەندێشەیی ئینتەرنێتی راگەیاند، ئەو دووپاتی دەکاتەوە کە ئینتەرنێت ماڵی نوێیە بۆ ئازادی عەقڵ و فەزای کۆمەڵایەتی ئینتەرنێت بە تەواوی بەتاڵە لە زوڵم و زۆرو لە هەر بنەمایەکی ناچار یان هۆکارێکی راستەقینە بۆ ترس، یاخود دەرکەوتنی لاگیری بە هۆی رەگەز یاخود بنچینە یان دەسەڵات و هێز جا ئابووری بێ یان سەربازی و هەر کەسێك لە هەر شوێنێك بێ لە فەزای ئینتەرنێت دەتوانێ بیر و هەستی راستەقینەی وەك ئەوەی دەیەوێ دەربڕێ.

بەڵام رایەکی پێچەوانە هەیە کە رەخنەگرانی کۆمەڵایەتی دەری دەبڕن وەکو (هێربێرت شیلیر) مامۆستای خانەنشینکراو لە زانکۆی کالیفۆرنیا ساندیاگۆ و پسپۆر لە بواری گەیاندن، کە دەڵێ:: ئەمەریکا زیاترین بەکارهێنەری ئینتەرنێتی تێدایە، بە دەست نایەکسانی لە گەیشتن بە زانیاری دەناڵێنێ، ئەمە سەرەڕای ناوەڕۆکی هەژارانەی زانیاری، بۆ ئەوەی تەنگژەی کۆمەڵایەتی لەو وڵاتە قوڵترو بەربڵاوتر بێ، ئەمە وێرای توانا بۆ تێگەیشتنی کێشە نیشتیمانییەکان لەگەڵ لاوازییەکی زۆر لە مادەی پووچ و ورووژاو غیابی زانیارییە کۆمەڵایەتییەکان. هەروەها (روززاك) کە لە رەخنەگرانی تێکنەلۆژییە جەخت لەسەر توانا زۆرەکان بۆ حکوومەتەکان بۆ چاودێری پەیوەندییەکان و داگیرکردنی تایبەتمەندییەکانی خەڵك و ئەنجامدانی جەنگی تەکنیك بەرز دەکاتەوە. بڕوا وایە کە "ئینتەرنێت بە دڵنیاییەوە دەرەنجامی دیاریکراو دەخولقێنێ، جا دەرەنجامی باش بێ یان خراپ، کە لە رووی تەکنیکییەوە بە پرەنسیپی (حەتمیەت) ناسراوە". بەواتایەکیتر، ئەو تێڕوانینەی کە دەڵێ: ئینتەرنێت وەك هەر تەکنۆلۆژیایەکی رووت ئامرازێکە، چینێك بەکاری دێنێ بۆ مەبەستێکی ئامانجدار. لەم تێڕوانینەوە، نە باشە و نە خراپە، بەڵام زۆر بێلایەنە و کاریگەری لەسەر کۆمەڵگە پشت بە

چۆنێتی بڵاوبوونەوە و تەوزیفکردنی دەبەستێ، هاوکات (کرانز بیرج) پێیوایە تەنانەت بێ لایەنیش نییە.

ئینتەرنێت هەلی فراوانی لە بەردەم خەڵکێکی زۆر لە سەرجەم وڵاتانی جیهان ڕەخساند لە دەربڕینی ڕاکانیان و ڕێکلامکردن بۆ خۆیان، بەتایبەتی ئەو کۆمەڵانەی کە پێشتر هەلی ڕادەربڕین لە بارەی خود و خستنەڕووی بۆچوون و غەمەکانیان نەبوو، لەبەر هۆکاری سیاسی یان ئایینی یاخود کوولتوری. ئەو کۆمەڵانە بە کردەیی سوودیان لەو توانا زۆرانە وەرگرتووە لە تۆڕی ئینتەرنێت بۆ بەکارهێنەرانی فەراهەم کردووە، بەڵام ئەو کۆمەڵانە بەجیاوازی مەرجەعییەتەکانیان زۆر درکیان بەوە کرد کە حکوومەتەکان هاتوونەتە نێو بازنەی ململانێ و دەستیان کردووە و هەوڵی گەمارۆدانیان دەدەن لەسەر ئەم ئامرازە نوێیە، کە هەندێ کێشەیان بۆ دروستدەکات لەبەر ئەو رووبەرە ئازادییەی کە دووره لە کۆنترۆڵی، بۆیە پەنای بردە ئامرازگەلی سادە لە مامەڵەکردنی لەگەڵ پرسی ئازادی ڕادەربڕین کە دەست بەسەراگرتن و سانسۆرە، یاخود بەکارهێنانی ئامرازی نوێ لەمیانەی پرۆگرامی فلتەری ئەلیکترۆنی، هەروەها هەندێ وڵات پەنا بۆ قۆرخکردنی پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری دەبات، ئەمە وێرای بەکارهێنانی چارەسەری باو و کلاسیکی کە تۆمەتبارکردنی ئەوانەیە، کە هێڵی سوور دەبەزێنن لەژێر ناوی (ناوزڕاندن و جنێودان و ڕەچاو نەکردنی ئاداب و بەهای گشتی ...هتد)، دواتر بەندکردنیان.

حکوومەتە دکتاتۆرەکان بواریان بە ئینتەرنێت داوە لە وڵاتەکانیان لە ژێر بارودۆخی کۆنترۆڵکراو، لە زۆربەی ئەو وڵاتانە ئینتەرنێت دەگاتە ڕێژەیەکی سەدی بچووك لە دانیشتوان، هەرچەندە لەوانەیە لەبەر گەشەپێدانی نزمی ئابووری یان کۆمەڵە کۆتوبەندێکی حکوومی بێ. هێشتا زووە حوکم لەسەر کاریگەری ئینتەرنێت لەو وڵاتانە بدەین. ئینتەرنێت بە تەنیا گۆچانێکی جادووگەری نییە هەموو ستەم و چەوسانەوەیەك لە نێوبەرێ، بەڵام ئامرازێکی گرنگ بە جەماوەر دەبەخشێ کە دەتوانێ بە هۆیەوە یارمەتیبەخش بێ بۆ هاوسەنگی هێز لە سەرەوە، ئینتەرنێت ئەسانسۆرێك نییە، کە بەرەو ئازادیمان ببات، بەڵکو ئەسانسۆرێکی لەکار کەوتووە، پێویستە قادرمە بەکاربێنێ بۆ ئەوەی سەربکەوێ.

ئینتەرنێت دەکرێ یارمەتی ئاسانکاری توانا نوێیەکان بدات بۆ قەڵاچۆکردن و ئاستەنگ دانان لە بەردەم ئازادی مرۆڤایەتی. بەڵام دەستکەوتنی ئازادی مرۆیی تەنیا بەکاری قورس دەبێ بۆ ئەنجامدانی گۆڕانکاری شەخسی و دامەزراوەیی. هەندێجار نوێنەرانی دەسەڵات جا



سیاسی بێ یان گەورە پیاوانی کار یاخود بەڕێوەبەرە پەروەردەییەکان، تێڕوانینێکی ئایندەییان لا دەبێ لە چۆنێتی ئەوەی ئینتەرنێت دەتوانێ زانیارییەکان بڵاو بکاتەوە و بیگەیەنێتە کۆمەڵگە و دەزگاکانیان و ریفۆرمەکان ڕادەگەیەنن کە هێز و هەژموون دەگوازێتەوە بۆ کەسەکان لە خوارەوە. زۆر لەو خەڵکانەی کە لە خوارەوەن ئەو توانایانەی کە ئینتەرنێت پێیان دەبەخشێ و پێشتر نەیانبینیوە بە خۆیانەوە دەستی بەسەردا دەگرن و هەوڵدەدەن لە پێناو دەسکەوتنی هێز و هەژموون و ئازادی و زۆرجاریش لە دژی بەرگری لە سەرەوە.

## کودەتای سپی ئینتەرنێت:

(بیل گێتس) بەڕێوەبەری کۆمپانیای مایکرۆسۆفت، ڕایگەیاند کە بە هۆی فیلمە ڤیدیۆیی و ماڵپەرە ڕۆژنامەوانییەکان کە توانای دەبێ بۆ بەستنەوەی کۆمپیوتەر و تەلەفزیۆن بە یەکتر، لە پێنج ساڵی داهاتوو کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت کودەتایەك بەسەر بەکارهێنانی تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەی کاغەزدا دەکەن. گێتس وتی: لە پێنج ساڵی داهاتوودا خەڵکی پێکەنینیان بەم ڕۆژەمان دێ، بە کردار ئینتەرنێت توانیویەتی گەنجان بۆ لای خۆی ڕابکێشێ و تاڕادەیەکی زۆر لە تەلەفزیۆن دووریان بخاتەوە. وەك ئەو پێشبینی دەکات بە تێپەڕبوونی کات مرۆڤ زیاتر لە کۆمپیوتەر نزیك دەبێتەوە هاوکات بەسەربردنی کات بۆ تەماشاکردنی تەلەفزیۆن بەرەو کەمبوونەوەیەکی بەرچاو دەچێ. گێتس پێیوایە مرۆڤ دەتوانێ بە شێوەیەکی خێراتر زانیاری پێویستی لە ڕێگەی ئینتەرنێت دەستەبەر بکات و ئاگای لە هەواڵەکانی جیهان بێ.

لەگەڵ بەربڵاوترکردنی ئینتەرنێت شارەزایان لە هەوڵدان، هەندێ ئامێر بەکاربێنن کە لە خۆشەویستی تەلەفزیۆن کەم نەکەنەوە و لەو بڕوایەدان کە لە کاتێکدا ڕۆژ بە ڕۆژ حەزەکان بۆ سەیرکردنی بەرنامەکانی ڤیدیۆیی لەسەر ئینتەرنێت زیاتر دەبێ و خزمەتگوزاریی دەنگی بەربڵاوتر دەبێ، بەکارهێنەرانی ئەمڕۆ حەزیان لە بەرنامەی نوێ و جۆراوجۆرە، ئینتەرنێت توانیویەتی ئەو جۆراوجۆر بوونە کە خوازیاری زۆرە بخاتە بەردەستی بەکارهێنەران و هەموو چین و توێژێك بۆ لای خۆی ڕابکێشێ. لەبەرابەر ئەم توێژە بەربڵاوەدا کە بەرەو لای ئینتەرنێت دێن، ڕۆژانە لە ڕێژەی بەکارهێنەرانی تەلەفزیۆن کەم دەبێتەوە و پێدەچێ تا ساڵانێکیتر تەلەفزیۆنەکان ئێکسپایەر بن.

بەکارهێنانی کۆمپیوتەر و تەلەفۆن و تەلەفزیۆن لە سیستەمگەلی تێکچڕاو و پێشکەوتوو، بەجۆرێك لە ڕێگەیەوە دەتوانرێ نامە و زانیاری لە ڕێگەی مانگی دەستکردو

سیستەمە زانیارییە ئەلیکترۆنییەکان ئالوگۆڕ بکرێ. لەهەمبەر پێشکەوتنە شیاوەکان لە بواری تەکنۆلۆژیای گەیاندن و زانیارییەکاندا، لە شوباتی ١٩٩٥ وەزیرانی دارایی و ئابووری حەوت ولاتە پیشەسازییە گەورەکان گەیشتنە ڕێککەوتنێك لە بارەی پەرەپێدانی جوولە و داکشانی زانیاری بە ڕێگەیەکی زۆر خێرا، لەمیانەی ئەوەی ناودەبرێ بە ڕێگەی زانیاری خێرا، هەروەها باس لە دلنیابوون لە گواستنەوەی زانیارییەکان کرا بەبێ ئاستەنگ و خۆ لادان لە هەر ئاستەنگێك کە دێتە پێش پەرەپێدانی کۆمپانیا گەورەکانی تایبەت بەم تەکنۆلۆژیایە.

لە نیسانی ٢٠٠٧ حکوومەتی ئەمەریکا رایگەیاند کە لە بەرنامەیدایە خزمەتگوزاری ئینتەرنێت بۆ پەیوەندیکردن لە ئاسمان بەکاربهێنێ، چۆنییەتی دامەزراندنی ئەم ئامێرە بێتەلەی ئینتەرنێت لە ئاسمان لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٩ دا دەبێ لە چوارچێوەی بەرنامەی (ئایریس)ی سەر بە وەزارەتی بەرگری ئەمەریکا. ئەم بەرنامە تازەیە ڕێگە بە سەربازە ئەمەریکییەکان دەدات بە دەنگ و ڕەنگەوە پەیوەندی بکەن. ئەم پرۆژەیەش لەگەڵ کات پێش دەکەوێ و یارمەتیدەرە بۆ گەیاندنی زانیاری راستەوخۆ لە نێوان مانگە دەستکردەکان بێ ئەوەی پێویستیت بە پەیوەندیکردن بە وێستگەکانی سەر زەوی هەبێ.

**دەکرێ ئەو رۆڵە گرنگەی کە تەکنۆلۆژیای پەیوەندییەکان لە کۆمەڵگەی نوێ دەیگێڕێ، بیگەڕێنینەوە بۆ چەند هۆکارێکی سەرەکی، گرنگترینیان ئەمانەن:**

١- گۆڕانی ئابووری بۆ جیهانێتی، ئەمەش کارێکە زەحمەتە لێك جیا بکرێنەوە، ئایا جیهانێتی دەرەنجامی بلاوبوونەوەی تۆڕەکانی زانیارییە؟ یاخود بلاوبوونەوەی تۆڕەکانی زانیاری یەکێك لەو دیاردانە بووە، کە بۆتە مایەی دیاردەی جیهانێتی؟

٢- لەگەڵ زیادبوونی خێرایی ریتمی جموجوڵی کارەکان و ئالۆزبوونی، پێویستی بە خێرایی ئالوگۆڕی زانیاری گەشەی کرد لە نێوان شوێنەکانی کاری جیاواز لە نێو دەزگایەك یان چەند دەزگایەکدا.

٣- ئاراستەگرتن بۆ داڕزاندنی میدیای جەماوەری بۆ ئەوەی پێکراوتر بێ (نموونە کلاسیکییەکەی تەلەفزیۆنی کێبڵە)، لە پێناو جۆراوجۆرێتی خزمەتگوزاری میدیایی و ڕێکلامی و پەخشکردنی بۆ جەماوەری ئامانجدار، لە جیاتی شێوازی پەخشی باو کە سەرجەم جەماوەر وەریدەگرێ، ئەم پەیوەستبوونەی جەماوەر بە سەنتەرەکانی میدیا لەمیانەی تۆڕگەلی تایبەتییەوە دەبێ.



٤- پرۆسەی بڕیاردان تەنها پشت نابەستێ بە زانیاری فەراهەمبوو لە نێو دەزگادا، بەڵکو زۆرجار پشت بە زانیاری لە دەرەوەیدا دەبەستێ، بە هۆی تێکئالانی جیهان و پێکەوەبەستوویی رووداوەکانی.

٥- زیادبوونی ئاراستەگیری دەزگاکانی کار بەرەو کەمکردنەوەی جموجوڵی تاکەکان و قەرەبووکردنەوەی بە پەیوەندی تەلەفۆنی و فاکس و سازدانی کۆنگرە لە دوورەوە، بەمەبەستی دەستەبەرکردنی وزە و کەمکردنەوەی تێچوونی پارە و کات.

پەرەسەندن و گەشەسەندنی ئینتەرنێت بە پانتایەکی زۆرەوە، واتە گەشەسەندنی خێرایی ئینتەرنێت و گرنگیدانی ولاتان بە ئینتەرنێت، بە هۆی گەشەسەندنی ئینتەرنێتەوە راگەیەنەرە گشتییەکان وەك رادیۆ، تەلفزیۆن و رۆژنامە زیاتر پێشکەوتن، ئێستا سەرچاوەی سەرەکی ئەو راگەیەنەرانە ئینتەرنێتە. فیلم و سینەماو مۆسیقا بە هۆی ئینتەرنێتەوە لە پەرەسەندندان. گۆڕانکارییەکان کە گشت کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی گرتۆتەوە، ئەمڕۆ هەموو کەس لە هەر شوێنێکی دونیادا بۆ سەرچاوەی زانیاری پشت بە ئینتەرنێت دەبەستێ.

پەیوەندی بەستن بە ئینتەرنێت لە ڕێگەی تەلەفۆنی نۆرماڵەوە، هێدی هێدی دەبێتە مێژوو، واتە ئیدی بە ئامێری تەلەفۆن ئینتەرنێت ناگوازرێتەوە، هەروەك لە پێشوودا هێڵی تەلەفۆن بە کێبڵ رادەکێشرا، پاشان ئەم تێکنەلۆژییە گەشەی سەند، ئینتەرنێتیش وایە. ئەمڕۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی پێویستی زیاتری بە خێرایی راگواستنی زانیارییە، لە ئەمەریکا ئینتەرنێتی خێرا ٨٠٪ هاوبەشانی گرتۆتەوە، چونکە لەگەڵ چوونە سەرەوەی دیقەی کامێراکان و میدیایەکانی دی، گواستنەوەی فایلە مەزنەکان بەخێراییەکی زۆر پێویستە، هەرچەندە هەندێ ولات لەم بوارەدا خێرایی ئینتەرنێتیان زۆر لە خوارەوەیە.

لەلایەکیترەوە رای گشتی ئەلیکترۆنی لەم جیهانە خەیالکراوە (ئینتەرنێت)دا راو پێشنیاز و بیر و بەشداری هەموو ئەو کەسانەیە کە تۆڕی ئینتەرنێت بەکاری دێنن، هەروەها هەموو ئەو تۆڕ و ئەو بیروڕایانە دەگرێتەوە کە کەسێکی خاوەن ئاراستەی فیکری و سیاسی دیاریکراو دەری دەبڕێ، یان ئەوانەی لە پاڵ ئایدۆلۆژیایەکی دیاریکراودا گوزارشت لە ئەزموونی تاکەکەس یان گرووپێك دەکەن. مەبەست لەمانە گەیشتنە بە دەرەنجامێکی سیاسی گشتی لە ڕێگەی ئەو نامانە کە تۆڕی ئینتەرنێت دەیگەیەنێ بە هەموو ئەوانەی ئەو خزمەتگوزارییە بەکاردێنن و بواریان بۆ دەڕەخسێنێ ئەو کەنالانە ببینن کە کەسانێتر بەکاری دێنن تا رای گشتی ئەلیکترۆنی دروستببێ، بەمەش دەتوانین بڵێین رای گشتی ئەلیکترۆنی گوزارشتە لە رای

هەموو ئەوانەی ئەم ئامرازە تێکنەلۆژییە بەکاردێنن بۆ گوزارشتکردن و بەیەکگەیشتن و دیالۆگکردن لەگەڵ یەکتریدا.

دروستبوونی رای گشتی ئەلیکترۆنی پەیوەندی بە دوو بنەمای سەرەکییەوە هەیە، کە بریتین لە ئاستی زانستی و بوونی تۆڕی خزمەتگوزاری ئینتەرنێت، لە هەریەك لەم بنەمایانەش چەند لقێکی لێ دەبێتەوە کە بوونیان کاریگەرە. ئەمە دەمانخاتە بەردەم پرسیارێکی تەریب لەگەڵ تیۆری رای گشتی کلاسیکی کە بریتییە لەوەی دەوڵەت لە کۆمەڵی مۆدێرندا دەسەڵاتی بەسەر هەموو ئامرازەکانی رای گشتی هەیە.

**ئامرازەکانی رای گشتی ئەلیکترۆنی بریتین لە:**

١- (E-Mail): ئیمێل وەڵامدەرەوەی تەکنۆلۆژیایە بە پێداویستی پۆستی ئەم سەردەمە دادەنرێ، ئێستا رۆژانە ٩٧ ملیۆن ئیمێل رەوانە دەکرێن. هەموو کەسێك بە بەرابەرێکی ماددی کەم دەتوانێ ئەم خزمەتگوزارییە بەکاربێنێ و پەیوەندی بکات بە کەسانیترەوە، نامە و وێنەی فۆتۆگرافی و وێنەی ڤیدیۆیی بگۆڕنەوە بێ ئەوەی کەسێك سانسۆریان بخاتە سەر.

٢- (Groups): بەکارهێنانی ئەم ئامرازە بەربڵاوترە و بەشداریکردن تیایدا بێ بەرابەرو لە رێگەی ئیمێلەوە دەبێ، ئەم گرووپانەش گوزارشت لەو کۆمەڵە کەسانە دەکات کە هەمان ئارەزوو بایەخدانیان هەیە، یان لە خەسڵەتێکی تایبەتدا هاوبەشن.

٣- (Chatting): ئەم ئامرازە لە زۆر لە ماڵپەرەکاندا هەیە و بەبێ بەرابەر دەتوانرێ بۆ گفتوگۆی دەنگدار و بە وێنە، یاخود بۆ کۆڕ و سمینار بەکاربهێنرێ، لە پاڵ ئەمەشدا چەند بەرنامەیەك هەیە کە هەموو بەکارهێنەرێك دەتوانێ لە رێگەیەوە رای خۆی دەرببڕێ لەوانە بەرنامەکانی پالتاك و یاهو و ماسنجەر.

٤- (Vote): لە زۆربەی ماڵپەرەکانی سەر تۆڕی ئینتەرنێت ئەم بەشە هەیە، لە رێگەیەوە خاوەن و رێکخەرانی ماڵپەرەکە دەیانەوێ رای بەشداربووان وەربگرن بێ ئەوەی بایەخ بۆ ئینتیما و سنووری جوگرافی تاکی بەشداربوو بدەن.



## دەروازەی قۆناغێکی تازە:

ئینتەرنێت بە گەورەترین تۆڕی زانیارییەکان دادەنرێ و رایەڵێکی گەورەیە زیاتر لە دە هەزار تۆڕ پێکدەهێنێ کە دەتوانرێ لە هەزارەها کەناڵی ئاسمانییەوە پەیوەندییان پێوە بکرێ و لەو رێگەوە بە خێرایی لە بوارەکانی زانست و نۆژداری و روناکبیری و کۆمەڵایەتی و ئابووری و میدیادا زانیاری ئاڵوگۆڕی پێدەکرێ، رایەڵەی ئینتەرنێت هۆکاری بەستنەوەی هەموو کونجێکی جیهانە، بە هۆی ئینتەرنێتەوە شارەزای شارستانێتی و دابونەریت و زانستی دونیا دەبین. ئینتەرنێت وەك ئینسکلۆپیدیایەکی زۆر گەورە، تۆڕێکی جیهانی فراوانە کە بە هەزاران تۆڕو ملیۆنەها کۆمپیوتەر لەسەرانسەری جیهاندا لەخۆ دەگرێ، کە لە رێگەی سەدان پرۆتۆکۆڵی گەیاندن و وەرگرتنەوە بە یەکەوە پەیوەستن و موڵکی کەس و گرووپ و پرۆتۆکۆڵێکی تایبەت نین، بەڵکو هەریەك لە پێکهاتەکانی لەلایەن دەزگا گشتییە جیهانییەکانەوە بەڕێوە دەبرێ و بەشداربووان لە رێگەیەوە دەتوانن لە بارەی هەر بابەتێکی دیاریکراوەوە، لە شێوەی دەقێکی نووسراو، یان نەخشە یان لە رێگەی پۆستی ئەلیکترۆنییەوە زانیاری وەدەستبێنن، چونکە ملیۆنەها دەزگای کۆمپیوتەری پێوە بەستراوە، کە زانیاری لە نێوانیاندا ئاڵوگۆڕ دەکرێ و بە شێوەیەکی بەرچاو لە جیهاندا بڵاوبۆتەوە بۆتە یەکێك لە سیما دیار و پێشکەوتووەکانی بواری شۆڕشی زانیارییەکان و میدیا، لە داهێنانی چاپخانەوە تا ئێستا بە گەورەترین داهێنان و دەستکەوتی ئەو بوارە لە قەڵەم دەدرێ.

هیچ کەس یان کۆمپانیا یاخود وڵاتێکی دیاریکراو نییە، کە بە خاوەنی تۆڕی ئینتەرنێت بناسرێ، چونکە ئەم تۆڕە چەندین تۆڕی کۆمپیوتەر پێکەوە دەبەستێتەوە، هەر یەکێکیش لەم تۆڕە کۆمپیوتەریانە لە چەندەها دەزگای کۆمپیوتەر پێکدێ، کە رەنگە ئەو کۆمپیوتەرانەش موڵکی لایەنێك یاخود چەند کەسانێك بن، هەر لایەنێکیش یاخود کەسێك خۆی بەرپرسیارە لە چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ تۆڕی ئینتەرنێت و ئەو ماددە و بابەت و پرۆگرامانەی پێشکەشی دەکات. پێکهاتەی ژێرخانی تۆڕی ئینتەرنێت بەسەر چەندین دەستە و دەزگای جۆراوجۆر دابەش دەکرێ، کە چەندەها حکومەت و زانکۆ و کۆمپانیا خزمەتگوزارییە گەورەکان دەگرێتەخۆ. سەبارەت بە لایەنی بە یەکگەیاندنە سەرەکییەکان، ئەوا بەگوێرەی چەند رێککەوتنێکی مۆرکراو لە نێوان کۆمپانیا گەورەکانی میدیا بەڕێوەدەچێ. هەرچەندە تۆڕی ئینتەرنێت ئەنجومەنێکی بەڕێوەبردنی نییە تاکو جۆرە رێکخستن و هەماهەنگییەك هەبێت،

که کۆمەڵێك لە دەزگا و لایەنە نێودەوڵەتییەکان دەیکەن، کە هەوڵدەدەن بۆ دەستنیشانکردنی پێوەرە تەکنیکەکانی تۆڕی ئینتەرنێت.

تا ئێستا هیچ کەسێك خاوەنی ئینتەرنێت نییە، راستە حکوومەتی ئەمەریکا لە رێگەی وەزارەتی بەرگری و ئەویش لەمیانەی دەزگای نەتەوەیی بۆ زانستەکان خاوەنی یاسایی تۆڕی جیهانی ئینتەرنێتە، بەڵام ئەمڕۆ ئەم تۆڕە دوایی گەشەکردن و پەرەسەندنی کەس ناتوانێ ئیدیعای خاوەندارێتی بکات، ئەمەش وایکرد لە بری چەمك خاوەندارێتی چەمکی کۆمەڵگەی ئینتەرنێتی بەکاربهێنرێ، هەروەها تەمویلکردنی تۆڕی ئینتەرنێت لە کەرتی حکوومییەوە خراوەتە سەر کەرتی تایبەت، بەم هەنگاوەش رێگە والا بوو لەبەردەم دروستبوونی چەند تۆڕێکی هەرێمی کە زیاتر بازرگانین و سەر بە کەرتی تایبەتن، هەموو کەسێکیش دەتوانێ لە رێگەی بەشداریکردنەوە کەڵك لە خزمەتگوزارییەکانی وەربگرێ، لەگەڵ ئەمانەشدا ناتوانین ١٠٠٪ بڵێین کەس دەسەڵاتی نییە بەسەر تۆڕی ئینتەرنێتەوە، چونکە ئەوانەی خاوەنی یاسایی تۆڕەکەن دەتوانن بە بیانووی یاسایی و سیاسییەوە یان هەر بیانوویەکیتر، هەر ماڵپەرێك دابخەن یان چاودێری بخەنە سەری، ئیتر بە شێوەیەکی هەیکەلی بێ وەك کۆنترۆڵکردنی ژێرخانی تۆڕەکە و قۆرخکردنی هەندێ زانیاری یان پاوانکردنی سەرمایە و هاوکاری نەکردنی لایەنەکانیتر کە خاوەنی ژێرخانی بنەڕەتی نین وەك کارەباو ئامرازەکانی پەیوەندیکردن بە تۆڕەکە، وەك نەبوونی ژێرخانی بنەڕەتی لە زۆر لە وڵاتانی جیهانی سێیەم، ئەم دیاردەیەش بە دابەشبوونی دیجیتاڵی یان جیاوازی رەگەزپەرستیانەی دیجیتاڵی ناودەبرێ.

لە رووی گەشەکردنەوە ئینتەرنێت خێراترین ئامرازی گەیاندنە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، لە کاتێکدا رادیۆ پێویستی بە ٣٨ ساڵ هەبوو تاکو پەنجا ملیۆن بەکارهێنەر پێشوازی لە بەرنامەکانی بکات و تەلەفزیۆن بە ١٣ ساڵ هەمان ژمارەی وەدەستهێنا و تەلەفزیۆنی کێبڵیش بە دە ساڵ، کەچی تۆڕی ئینتەرنێت تەنها بە پێنج ساڵ بەو ژمارەیە گەیشت و کەمتر لە دە ساڵی ویست تاکو ٥٠٠ ملیۆن بەکارهێنەری کۆکردەوە. نابێ شۆڕشی دیجیتاڵی بەپێی ئەو بڕە ناوەڕۆکە هەڵبسەنگێنین کە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاوی دەکاتەوەو، هەروەها بە ژمارەی ماڵپەرەکان نییە کە رۆژانە دروست دەکرێن، بەڵکو بەپێی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی و سیاسی و کوولتورییەکانە. ئینتەرنێت بۆتە فاکتەرێکی بنەڕەتی ژیانی زۆر لە کۆمپانیا و تاك و حکوومەتەکان و نەوەی نوێی مندالآن بە (نەوەی دیجیتاڵی) ناودەبرێن، بەو پێیەی هەر لە سەرەتای گەشەیەوە ئینتەرنێت لە دەوروبەریدایە. ژمارەی بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت بە زمانی



ئینگلیزی لە پلەی یەکەم دێ بە رێژەی ٢٨،٩٪ ئینجا چینی ١٤،٧٪ و ئیسپانی ٨،٩٪ و ژاپۆنی ٧،٦٪ و ئەڵمانی ٥،٢٪ و فەرەنسی ٥٪ و پورتوگاڵی ٣،٦٪ و کۆریی ٣٪ و ئیتاڵی ٢،٧٪ هەروەها عەرەبی ٢،٥٪.

بە بەراورد لەگەڵ ژمارەی دانیشتوان لە بەشداریکردن لە ئینتەرنێتدا، وڵاتی دانیمارك بە پلەی یەکەم دێ لەسەر ئاستی جیهان بە رێژەی ٣٢٪ ئینجا کۆریای باشوور ٢٩٪، بەریتانیا ٢٢٪، ئەمەریکا ١٩،٥٪، ئیسپانیا ١٥،١٪. سەبارەت بە بەرزترین ژمارەی بەکارهێنانی ئینتەرنێت لە جیهان بۆ ساڵی ٢٠٠٧، ئەمەریکا بە پلەی یەکەم هات بە ٢١١،١ ملیۆن بەکارهێنەر (لە کۆی ٣٠٢ ملیۆن کەس). زۆربەی وڵاتە پێشکەوتووەکانی رۆژئاوا لە رووی تەکنۆلۆژیاو سیاسییەوە جۆرە سیستمێکی سانسۆر پەیڕەو دەکەن، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە کاروباری تیرۆریستی و سێکس بە منداڵ و هەرزەکاران هەیە، هەروەها زۆر لەو پرسانەی بە ئاسایشی وڵات پەیوەستن.

زۆر کەس وایان لە ئینتەرنێت روانی کە راکردن و رزگاربوونە لە هەموو شێوەکانی سانسۆری سەپێنراو بەتایبەتی لە رووی ئایینی و سێکس و سیاسەت، بۆیە خوێنەران بە دوای راستیدا دەگەڕێن بۆ تێرکردنی غەریزەی مرۆڤ، کە گەڕانە بە دوای خێر و هەق و جوانیدا. بەمەش پێویستی و داواکاری لەسەر بازاڕی ئینتەرنێتی میدیایی زیادی کرد، لەبەر ئەوەی هەموو شتێك پیشاندەدات و دوورە لە چاوی دەسەڵات و هەژموونی حکوومەتەکان، بەمەش پارسەنگی هێز بە لای ئەوەی یەکەمدا شکایەوە و دەسەڵات هەلی دەستپێشخەری لەدەستداو، چیتر ناتوانێ خۆی رابگرێ لەبەردەم شەپۆلی زریانی گەورەی ئینتەرنێتدا کە لە خەیاڵەوە نزیکە، هەرچەندە هەوڵی جیاجیای بێ ئاکام هەیە بۆ ئاستدانان لە بەردەمی و داپۆشینی راستییەکان. مانگانە دوو ملیۆن بەشداربووی تازە ئەم تۆڕە بەکاردێنن، واتە لەهەر خولەکێکدا ٤٦ بەشداربووی تازە، هەروەها ئامارەکانی تۆڕی (NUA)ی ئەمەریکی ئەوە دەخەنە بەرچاو کە لە ساڵی ١٩٩٨دا ژمارەی بەشداربووان تەنها ١٣٤ ملیۆن بووە و لە ساڵی ٢٠٠٧یشدا ژمارەکە گەیشتۆتە ٢٤٥ ملیۆن بەشداربوو، هەروەها لە ویلایەتە یەکگرتووەکان و کەنەدا ژمارەی بەشداربووان ٧٠ ملیۆن کەسە، کە تائێستاش ئەم دوو وڵاتە بە پێشەنگی وڵاتانی بەکارهێنەری ئەم ئامرازە دەژمێردرێن. بەپێی رووپێوێك دەرکەوتووە، کە رێژەی بەکارهێنانی ئینتەرنێت لە ئەمەریکا لە یەك هەفتەدا ٤،٢ کاتژمێر و لە ئەوروپا ٣،٢ کاتژمێرە، لە ئوستراليا ٣،٦ کاتژمێرە و لە هەمانکاتدا بەرێژەی ٤٤٪ی ئەمەریکییەکان لە ماڵەوە ئەم

خزمەتگوزارییە بەکاردێنن، بەرابەر بە ڕێژەی ٣٨٪ لە ئوسترالیاو ٣١٪ لە بەریتانیاو ئەڵمانیا، ١٦٪ لە فەڕەنسا.

زۆربەی ئەو شمەکانەی کە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاوکراونەتەوە لە ٨٠٪یان بە زمانی ئینگلیزییە لە هەمانکاتدا ژمارەی ئەو کەسانەش کە ئینتەرنێت بەکاردێنن بۆ دەستکەوتنی ئەو شمەکانە کە خۆیان لە بنەڕەتدا زمانی ئینگلیزی زمانی دایکیان نییە، بە شێوەیەکی فراوان لە زیادبووندان لە ژمارەی ئەو کەسانەی کە زمانی ئینگلیزی زمانی دایکیانە. ڕێژەی ئەو کەسانەی کە بە ئینگلیزی قسە ناکەن و لەڕێی ئینتەرنێتەوە دەیانەوێ بە زمانی ئینگلیزی شمەکیان دەستبکەوێ ڕێژی ٤٤٪ لە کۆی ئەوانەی کە ئینتەرنێت بۆ ئەو مەبەستە بەکاردێنن پێکدەهێنن. زمانی ئینگلیزی بەسەر ٦٥٪ی بەرنامە ئیزگەییەکان و ٧٠٪ی فیلمەکان و ٩٠٪ی دیکۆمێنتە هەڵگیراوەکان لە ئینتەرنێت و ٨٥٪ی تەلەفۆنە نێودەوڵەتییەکان زاڵبووە، ئەمەش بە پاڵپشتی کوولتوری میدیایی کە قۆرخە سەرمایەدارییەکان هەژموونیان کردووە، بۆ نموونە: چوار ئاژانسی جیهانی ٨٠٪ی زانیارییەکانیان کۆنترۆڵ کردووە و چوار گرووپی میدیایی سەرەکی کۆنترۆڵی ٩٠٪ی ڕۆژنامە بەریتانییەکانیان کردووە، هەروەها ١٠٪ی کۆمپانیاکانی ڕێکلامی ئەمەریکی کۆنترۆڵی ٨٠٪ی سەرجەم خەرجی ڕێکلامی ئەمەریکایان کردووە، کە بریتییە لە ٢٥٠ ملیار دۆلار.

دیاردەیەکی دیکە لە ئەگەری سەرهەڵدانی زمانێکی یەکگرتوو کە بۆتە جێی نیگەرانی، سڕینەوەی ڕۆشنبیری هەندێ کۆمەڵی جیاجیای جیهانە کە بە شێوەیەکی کتوپڕ بەهای بڵاوبوونەوەی هۆکاری نوێی پەیوەندیکردن بەتایبەت ئینتەرنێت، نەمانی هەندێ زمانی ئەو کۆمەڵگەیانە بێت. جیهانگیریش هۆکارێکی سەرەکییە بۆ مردنی ئەو زمانە بێ هێزانە، چونکە لەجیاتی ئەوەی بەهێزیان بکات لە بڵاوبوونەوە و نزیککردنەوەی نێوان گەلان بەپێچەوانەوە بەرەو نەمانیان دەبات. لەلایەکیترەوە چەند هەوڵێکیتر هەیە بۆ داهێنانی زمانێکی نوێ کە بگونجێ لەگەڵ بەکارهێنانی کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت و بەئاسانیش بەکاربهێنرێ، بەڵام تا ئێستا روخساری ئەو زمانە دەرنەکەوتووە لەگەڵ توانای بەکارهێنان و ئەگەری جێبەجێبوونی ئەو کارە، ئامانج لە داهێنانی زمانێکی گشتیی جیهانی ئاسانکارییە بۆ نزیکبوونەوە و لێکگەیشتن لە نێوان گەلان. ئینتەرنێت و هۆکارەکانیتری پەیوەندیکردنی نوێ هەوڵدەدەن بۆ لابردنی بەربەستی نێوان کۆمەڵگە جیاجیاکانی جیهان، ڕەنگە هۆکارێکی سەرکەوتوو بۆ



ئەنجامدانی ئەو کارە پەرەپێدانی بواری وەرگێڕان بێ لە نێوان زمانە جیاجیاکان بە پشتبەستن بە ئینتەرنێت، چونکە دەتوانرێ بە ئاسانترین شێوە ئەو کارە ئەنجامبدرێ.

گەشەسەندنە مەزن و بە دوای یەکەکانی تەکنۆلۆژیای گەیاندن و زانیاری بۆتە هۆی وەرچەرخانی بەرەنجامەکانی لقە مەعریفییە جیاوازەکان، زانیاری دیجیتاڵی بۆ سانایی وەدەستهێنان و ئەنبارکردن و گەڕاندنەوە و گواستنەوەی لە ئامێرێکەوە بۆ ئامێرێکی تر، بە خەرجییەکی کەم و هەرزان و بەماوەیەکی کورت و کاتێکی زۆر کەمدا، کە وای لێهاتووە ئەم سەردەمی ئەمڕۆ کە گۆڕانکاری زۆری بەخۆوە دیوە پێی بگوترێ (سەردەمی دیجیتاڵی) ئەم ستایشەش بۆ (ئیستر دایسۆن) دەگەڕێتەوە، کە ژمارەیەك لە کۆمپانیای پیشەسازی ئەلیکترۆنی لە ئەستۆی خۆی گرتبوو، ئەم ناوانە بە ناواخنی ئاماژە بە فراوانی چوارچێوەی بەکارهێنانی ئینتەرنێت دەکات و بەوپێیەی خەسڵەتێکی بنەڕەتی و جیاوازە، هەروەها متمانە پێکردنی لە زۆربەی کاروبارەکانی ژیاندا، ئیسترادیسۆن دەڵێ:: "من لەسەر ئینتەرنێت دەژیم". ئەم کاریگەرییەی ئینتەرنێت لە گەیاندنی ئەلیکترۆنی ئاڵوگۆڕدا لە ژێر ڕۆشنایی بەکارهێنانەکانیدا هەموو شتێکی لە ژیان دەگۆڕی، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە بێ بوونی ئینتەرنێت کۆمەڵگە دەوەستێ، واتە کۆمەڵگە لە بەشداریکردنی سەردەمی ژمارەییدا، بە بێ ئەم ئامێرە دەبێتە چڤاتێکی دواکەوتوو دابڕاو لە ڕیزی گەشەسەندنە خێراو قووڵەکان کە جیهانی هاوچەرخ بەخۆوەی دەبینێ.

پێشکەوتنی تەکنەلۆژی یەکێکە لە خەسڵەتە دیارە سەرەکییەکانی سەدەی بیستەم، مشتومڕێکی درێژخایەن لەئارادایە سەبارەت بە ئەگەری ئەوەی ئەم سەدەیە سەبارەت بە نەوەکانی داهاتوو تەنها ببێتە قۆناغێك لە پێشکەوتنی ژیانی کۆمەڵگە، لێکچوو لەگەڵ قۆناغی دەرکەوتنی ژیان بۆ یەکەمجار لەسەر رووی زەوی، ئەوەش لە ئەنجامی پێشکەوتنی تەکنەلۆژی بێشومار لە بواری ئامێرە زیرەکەکاندا کە توانای بیرکردنەوەیان هەیە و زۆر لە توانای ئێستای مرۆڤ زیاترن، کۆمەڵگەی مرۆیی ئێستا بەرەو چوونە ناو قۆناغ و سیستمێك دەڕوات کە جیاوازییەکی گەوهەری لەگەڵ رابردوو ئێستادا هەیە، بە جۆرێك کەسانێك هەن پێیانوایە جیاوازی لە نێوان ئەو بوونەوەرە زیرەکە بیرکەرەوانەدا لەگەڵ مرۆڤی ئێستا، وەك جیاوازی زیرەکی نێوان مرۆڤ و زیندەوەرانی دیکەیە.

کەواتە ئایندەی نزیك خاڵی گۆڕانی تەواو دەنوێنێ، گۆڕان لە هەموو ئەوانەی باو و زانراو و ناسراو بوون، پرۆسەی گۆڕان و گۆڕانکاری خێراش بەردەوام دەبێ، کە هیچ سنوورێك ئاستی بۆ دانانێ یان پێشکەوتن و بەردەوامبوون و خێراییە لە ئاست بەدەرەکەی هیچ بەربەستێك نابێتە

ڕێگری، ئەمەش گرنگترین مەرج و روخساری تاکانەیی لە بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری دیاری دەکات، ئەمەش بە پێودانگی تاکانەیی بەرای هەندێ لە بیریارەکان ماوەیەکی زەمەنی ئایندەیی دەنوێنێ، کە ئەستەمە بە تەواوی کاتەکەی دیاری بکرێ، هەروەها ئەستەمە پێوانەی ئەو خێراییە سەرسوڕهێنەرە بکرێ لە لێشاوی پێشکەوتن و گۆڕانکاری تەکنەلۆژی و ئەو تێکچونانەی بەهۆیانەوە ڕوودەدەن لە شێوازی ژیان و پەیوەندییەکانی نێوان مرۆڤەکان لەلایەك و پەیوەندی نێوان سەرتاپای جیهان لەلایەکی دیکەوە.

## میدیای ئەلیکترۆنی:

یەکێك لە هەنگاوە گرنگەکانی تری جیهانی ڕۆژنامەگەری دەرکەوتنی میدیای ئەلیکترۆنی بوو، کە بۆتە یەکێك لە تایبەتمەندییە بەرچاوەکانی جیهانی پێشکەوتووی ئەمڕۆ، چونکە دەتوانرێ پەیامەکان لە دوورییەکی زۆرەوە و لە کاتێکی کەمدا وەربگیرێ و بگوازرێتەوە. میدیای ئەلیکترۆنی دەروازەیەکی نوێی بەرووی بیرو ئەندێشە و خەیاڵی مرۆڤدا کردەوە، بە شێوەیەك کە زانیاری لێیەوە بووە خاوەنداری گشتی و شێوازێکی مۆدێرنی بۆ سوودوەرگرتن و بەرهەمهێنانی زانیارییەکان لە ڕێگەی سەرجەم ژانرە خوێنراو و بیستراو و بینراوەکانەوە وەدیهێنا، بە لەبەرچاوگرتنی هەموو کۆت و بەندە کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکان و سانسۆرە دەرەکییەکان.

ئەو جیاوازیانەی کە لە میکانیزمی کارکردن لە ڕۆژنامەی کاغەزی و ئەلیکترۆنیدا هەیە، وایکردووە خەڵکی ئێمە هێشتا بە ریتمی ڕۆژنامەی کاغەزی کار لە ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی بکات، ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە میکانیزمی کارکردن لە ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنیدا لە هەموو رووەکانی هونەری ڕۆژنامەوانییەوە جیاوازە. لەمەوە بۆمان روون دەبێتەوە کە ڕۆژنامەی ئینتەرنێتی ئامرازێکی میدیاییە و لە ڕێگەی تۆڕەکانی ئینتەرنێتەوە دەگاتە جەماوەر. لە هەندێ زاراوەی نزیك لێیەوەش جیاوازە وەك هەواڵی ئەلیکترۆنی، کە بەر لەو بەکارهێنراوە بۆ ئاماژەدان بە شێوازێکی پیادەکردنی ڕۆژنامەوانی کە ئامێرە ئەلیکترۆنییەکان وەك رادیۆ و تەلەفزیۆن لەناو کۆمەڵە سیستمێکی دیاریکراوی وەك تیلیدەقدا ئەنجامی دەدەن. دەرکەوتنی شوێنی ئەلیکترۆنی لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت، جۆرێك شۆڕش بوو لە تەکنۆی ڕۆژنامەوانی. ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی لەسەر ئینتەرنێت کاریگەری هەیە لە جووڵانەوەی ڕۆژنامە و لە ناو خۆیدا کە بە ڕێگەی زۆر ئاسان دەتوانێ دەنگوباس و رووداوی دەستبکەوێ یەك بە یەك و ماوەی کورتکردنەوەی، بۆ ئەوانەی چاوەڕێی رووداوەکانن کەمتر لەوەی بڕۆن بۆ بازاڕ



ڕۆژنامەیەك یان گۆڤارێك بکڕن و نرخی بەشداری چاپەمەنییەکانی بە هەموو جۆرەکانی بۆ سووك کردووی.

زۆرجار ماڵپەرە ئەلیکترۆنییەکان وتاری هەواڵئامێز بڵاو دەکەنەوە، کە خوێنەر بە ئاسانی دەیخوێنێتەوە، هەروەك ئەو وتارانەی کە لە ڕۆژنامەکاندا بڵاو دەکرێنەوە، هەندێجاریش بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت وا هەڵدەبژێرن کە بەشێك تۆمارکراوی ڤیدیۆیی ببینن بەمەش ئینتەرنێت وەك پەخشی تەلەفزیۆنی لێدێ، هەر بابەتێك لە ئینتەرنێتدا بڵاو ببێتەوە دەتوانرێ هەموو ئەو گۆشانەی تیادا بەکاربهێنرێ کە لە ئینتەرنێتدا دابینکراوە، ئەمە ئەو هۆکارە نوێیەیە کە وا لە خوێنەر یان ئەو کەسەی ماڵپەرەکەی کردۆتەوە دەکات، ببێتە بەشداربوویەك و شێوازی تایبەتی خۆی بەکاربێنێ لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو زانیاریانەی دابینکراون.

(جۆناسان دیۆب) دەڵێ: " نووسین لە ئینتەرنێتدا ئاوێتەیەکە لە نووسین بۆ ڕۆژنامەگەریی چاپکراو یان بینراو و بیستراو". ئەوەش دووپات دەکاتەوە کە "ئەو شێوازی سادە و کورتکراوەی ئەوانە پێیان باشە کە لە ڕاگەیاندنە بینراو و بیستراوەکاندا کار دەکەن، وادەکات ئەوەی لە ئینتەرنێتدا دەنووسرێ بەئاسانی بخوێنرێتەوە و بەدواداچوونی بۆ بکرێ". ئاماژە بەوەش دەدات کە "زۆر لە ماڵپەرە ئەلیکترۆنییەکان بنەما سەرەکییەکانی نووسینی نوێ پشتگوێ دەخەن، پەیڕەوکردنی شێوەی وتوێژی شتێکی باشە، بەڵام هەر دەبێ ڕێزمان و زمانەوانی تیایدا ڕەچاو بکرێ". هەواڵی ئینتەرنێتی دەبێ کورت و پوخت و مانادار بن، پێچ و پەنایان نەبێ و ئەگەر کرا وێنەیان لەگەڵدا بێ وا چاکە تەواوی درێژەی هەواڵەکان پەخش نەکرێ و لە ناو لینکێکی تردا دابنرێ. (سکزت ئەتکینسۆن) بەڕێوەبەرێکی هەواڵی تەلەفزیۆنییە، دەڵێ:: "وا بۆ ئینتەرنێت بنووسە وەکچۆن نامەیەکی ئەلیکترۆنی بۆ هاوڕێیەکەت دەنووسی، ئەمەش مانای ئەوە نییە ناتوانیت هەڵە بکەی یان وابێ مانای سەرگوزشتەکەت ون بکەی یان لە چوارچێوەی دەرچوو بی، بەڵکو تا دەتوانی لە نووسینەکەتدا شێوازێکی خۆشەویست ئامێزانە بەکاربێنە".

لەگەڵ ئەوەی ماڵپەڕە هەواڵییەکان لە ئینتەرنێت وەك نەریتێك هەڵبژاردنی جۆراوجۆری بۆ بەکارهێنەرانی دابینکردووە، بەڵام پێویستە لەسەر نووسەران پێشەکی دوور و درێژ یان ئاڵۆز وەلانێن، کە خوێنەر ناتوانێ خێرا لە مەبەست بگات، پێشەکییەکە دەبێ هاندەر بێ بۆ بەردەوامبوون لە خوێندنەوەدا، ئەگەرنا خوێنەر روو دەکاتە خوێندنەوەی بابەتێکیتر، بابەتەکان لە ئینتەرنێتدا بەگشتی لەو بابەتانە کورتترن کە لە ڕۆژنامەکاندا دەنوسرێن، باشوایە بابەتێکی

ئینتەرنێتی لە سنووری ٨٠٠ وشەدا بێ و لە یەك پەڕەدا بنووسرێ. توێژینەوەکان سەلماندوویانە کە بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت وادەخوازن و ئارەزوو دەکەن، پەڕەکە تا کۆتاییەکەی بخوێننەوە. بەڵام پاساویشیان پێ نییە بۆ ناچاربوونیان لە چوون بۆ پەڕەکانیتر تا بابەتەکە تەواو بخوێننەوە، بەڵام بۆ ئەوەی وەرگرتن و تێگەیشتنی بابەتەکە ئاسان بێ، بۆ ئەوانەی لە ئینتەرنێتدا دەنووسن (دیۆب) پێشنیاز دەکات دەقی بابەتەکە دابەش بکرێ بۆ چەند بڕگەیەکی جۆراوجۆر و مانشێتی فەرعی بەکاربێ و بابەتەکە دابەشبکرێ بۆ چەند خاڵێکی دیاریکراو بۆ پێشکەشکردنی بیروڕاکان بە ڕێگەیەکی زۆر جیاوازتر لەوەی لە ڕۆژنامەگەری چاپکراودا ڕوودەدات.

تەلەفزیۆن کۆکراوەی سۆما (بینایی) و ئۆراڵ (وتە) بە چاو و گوێ، وەك ناوەندێکی نوێ دووبارە دروستکردنی ئاراستەی نوێ بۆ هەریەك لە کات و شوێن، تەلەفزیۆن هەواڵەکان پەخش دەکات بۆ ئەوەی جەماوەر بیبینێ، ڕۆژنامەنووسیی نووسراویش لە هەواڵەکان و پێشکەشکردنی درێژەدا خۆی دەبینێتەوە، بەڵام ئینتەرنێت بواری پێشکەشکردن و هەواڵ و ڕوونکردنەوە و ئاوێتەبوونەکان دەدات و پێشکەشی دەکات، بۆ ئەوەی ئەمەش بەرجەستە بێ ڕۆژنامەنووسانی سەر ئینتەرنێت زانیارییەکان بە شێوەی جۆراوجۆر پێشکەشدەکەن، بە بەکارهێنانی شێوازی هەمەچەشن.

ڕۆژنامەگەری لە ئینتەرنێتدا ڕێگە بۆ خوێنەران ئاسان دەکات بۆ قسەکردنی ڕاستەوخۆ و خێرا لەگەڵ نووسەر یان سەرنووسەرەکاندا، لە ڕێگەی ئیمێل، یان گفتوگۆی ڕاستەوخۆ (Chat)ەوە، جگە لەوەش زۆر ماڵپەر هەن شوێنی دیاریکراو تەرخاندەکەن بۆ پێشکەشکردنی ڕاوبۆچوون و کاردانەوەکانی خوێنەران تا کەسانی تریش ئاگایان لەوەبێ کە نووسەرەکە دەینووسێ و وەڵامی بدەنەوە. ئەمەریکییەکان بۆ ئاگاداربوونیان لە هەواڵەکان بەر لە هەر شتێك ڕوو لە ئینتەرنێت دەکەن، توێژینەوەیەك ئەو ڕاستییەی سەلماندووە کە لەگەڵ ئەوەی هێشتا خوێنەری ڕۆژنامەکان ماوە بەتایبەتی لاوان، بەڵام ئێستا ئینتەرنێت بۆتە تاکە ئامرازێکی میدیا وەك دەبینرێ خواست لەسەر ڕۆژنامە ئەمەریکییەکان بەڕێژەی ١١٪ کەمبۆتەوە و بینەرانی کەناڵە ناوخۆییەکانیش ٣٤٪ سەرەڕای زیادبوونی کەناڵە ئاسمانییەکان، کەچی ئەمریکییەکان تا دێ زیاتر ڕوو لە ئینتەرنێت دەکەن.

(نورا پول) بەڕێوەبەری پەیمانگەی توێژینەوەی هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی نوێی سەر بە زانکۆی (مینیسوتا) دەڵێ: "ئەگەر هەندێ سەرچاوە لەژێر کۆنترۆڵی بەکارهێنەری ئینتەرنێتدا بوایە، ئەوا دەبووە هۆی ئەوەی بابەتەکە شێوەی نوێ وەرگرێ لە شێوەکانی پێشکەشکردنی بابەتەکان". هەروەها (جۆناسان دیۆب) باس لەو کاریگەرییانە دەکات کە ئینتەرنێت و هەندێ لە شێوازە تەکنۆلۆژیا نوێیەکان لەسەر هۆکارەکانی میدیا دروستیدەکەن و دەبنە مایەی گۆڕانکاری تیایاندا و دەڵێ: "ئەو ڕۆژنامەنووسانەی کارەکەیان لەسەر ئینتەرنێت دەکەن دەبێ بیر لە زۆر ئاست بکەنەوە لە یەك کاتدا وەك: وشەکان، هزر، بونیادی بابەتەکە، دیزاین، هۆکارەکانی ئاوێتەبوون، دەنگ، ڤیدیۆ، وێنە". ڕۆژنامەنووسەکان ڕاهاتوون لەسەر نووسین بە بەکارهێنانی چەند نموونەیەك بۆ ڕێکخستنی دەق کە بەستراوەتەوە بە پەیوەندی نێوان سەرەتاو کۆتایی، بەڵام لە ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی ئەم بنەمایە نەماوە، چونکە لاپەڕەی پێشوازی هەیە لە ڕۆژنامەدا پێکدێ لە گۆشەکانی ڕۆژنامە بۆ ئەوەی خوێنەر ڕێگەیتر بگرێ بۆ گەیشتن بە مادە ویستراوەکان، دەتوانرێ خاڵە پێویستییەکان دیاریبکرێ لە چەسپاندنی ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی. ئینتەرنێت ڕێگە بە بەشداربووانی دەدات بە چەندین شێواز پەیوەندی پێکەوە بکەن و سوود لە یەکتری وەربگرن وەك گۆڕینەوەی پۆستی ئەلیکترۆنی و گواستنەوەی فایل و گەیاندنی هەواڵەکان و کەڵك وەرگرتن لە هەزاران بنکەی زانیاری و ئەنجامدانی دایەلۆگ و ڕاپرسی لەگەڵ یەکتر و گەشتکردن بەناو کتێب و گۆڤارو ڕۆژنامەکانی تۆڕی ئینتەرنێت زیاتر دەبێ ژمارەی لاپەڕەکانی و دیۆکۆمێنتەکانی لەگەڵ ژمارەی بەشداربووانی زیاتر دەبێ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سوود و کارئاسانییەی کە ئەم تۆڕە پێشکەشیدەکات.

ئینتەرنێت توانایەکی نێونەتەوەیی زەبەلاحی هەیە لە پرۆسەی کۆکردنەوە و دابەشکردنی هەواڵی نێودەوڵەتی، هەرچەندە کاریگەرییەکەی زۆر لەوەش زیاترە، لە ساڵی ١٩٩٤دا بیست ڕۆژنامە هەبوو، لە ساڵی **١٩٩٩** دا گەیشتە (٤٩٢٥) ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی کە (٢٧٠٠) یان هی ویلایەتە یەکگرتووەکانە، ژمارەی ڕۆژنامە و ماڵپەڕی ئەلیکترۆنیش ڕۆژ بە ڕۆژ ڕوو لە زیادبوونە. میدیای فرە ڕەگەز و کێبڵ و ئێزگەی دیجیتاڵ و تۆڕی گەیاندن، لە کێبڕکێدان لەگەڵ میدیای چاپکراو و دەیانەوێ سوود لە خزمەتگوزاریی ئینتەرنێتی نێودەوڵەتی وەربگرن. ئەرکی بەرچاوی ئینتەرنێت لە گەیاندنی داهێنراودا خۆی دەنوێنێ کە یارمەتیی کەسان دەدات لە بەشداربوون بە بیروڕاو خەم و خولیا لەگەڵ کەسانی دی (کە بریتییە لە هەواڵ و زانیاری) بۆیە بە سیمایەکی بەرچاوی ئەم سەردەمەیە کە پێی دەگوترێ سەردەمی گەیاندنی نێودەوڵەتی، زۆربەی گۆڕانە کتوپڕەکان بەر لە ٢٥ ساڵ لەگەڵ پەیدابوونی کۆمپیوتەر ڕوویاندا، بەجۆرێ کە کەسانی پسپۆری بواری میدیا و گروپەکانی دی، لە هەمانکات و زووبەزوو دەیانتوانی بگەنە

هەواڵەکان کە هەر ئەوە نییە ئینتەرنێت بەکاردێنن، بەڵکو لەرێی بەشداریکردنیان لەم زانیارییەدا لە هەر شوێنێکی جیهاندا، پەیوەندی کۆمەڵایەتی دروستدەکەن.

تا ئەم کاتە جیهانگیریی میدیا دەرکەوتەکانی زۆر بە روونی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان و ژاپۆن و رۆژئاوای ئەوروپا و وڵاتانی دیموکرات و پیشەسازیدا بەدیدەکرێن، چونکە کۆمەڵگەی دەوڵەمەند و پیشەساز و پێشکەوتوویان هەیە، بەرادەیەك، کە لە ئایندەیەکی نزیکدا بۆشایی میدیا لە نێوانیان زۆر کەم دەبێ و گەشەسەندنی یەك بەدوای یەك دەیانگرێتەوە. کەچی نەتەوە هەژارەکان هەرچەندە لە توانایاندا دەبێ هەواڵ و زانیاری بەدەستبێنن و دەزگای میدیاش دابمەزرێنن، بەڵام لە رووی ئابووری و ژێرخانی ئابوورییەوە هەژار و دەستکورت دەبن و بۆیان ناکرێ پشتیوانی لە چالاکییەکانیان بکەن. لەکۆی ٩٤ دەوڵەتی ئەفریقیا لەساڵی ١٩٩٩دا تەنیا گەلانی ١٢ دەوڵەت تۆڕی ئینتەرنێتیان بەکاردەهێنا. پسپۆڕانی سیاسەتی نێودەوڵەتی هۆشداری ئەوەیاندا ئەگەر دەوڵەتانی ئەفریقیا زوو تۆڕی ئینتەرنێت بەدەست نەهێنن، هەر بە هەژاری دەمێننەوە و رووبەڕووی گرفتی ئابووری دەبنەوە کە لە ئاکامدا دەبنە دەوڵەتی پەراوێز.

لە زۆربەی وڵاتانی پێشکەوتوو، تەنانەت بەوانەی لە ئەفریقیاشدان، چاوگەکانی میدیای ئاسایی بریتین لە دەزگای وردو بچووك، وەك هەندێ رۆژنامەی رۆژانەو کەناڵی تەلەفزیۆن کە تەنیا ژمارەیەکی کەم لە بینەران پرۆگرامەکانی دەبینن. هاوکات ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ئەو وڵاتانە گوێ لە ئیزگە نێودەوڵەتییەکان دەگرن (کە بە زۆری ئاراستەکراون)، بەتایبەتی کە زۆربەی ئامرازەکانی میدیای ئەو وڵاتانە هی حکوومەتن. لەو دەوڵەتانەی کەوتوونەتە بەشی باشووری گۆی زەوی و لەبن باری کەڵەکەبووی قەرزدا دەناڵێنن، ملیۆنەها هەژار هەن ناتوانن بگەنە ئەو ئاستەی سیستمی گەیاندنی ئەلیکترۆنی بەکاربێنن، بەمجۆرە کەلێنێکی قووڵ کەوتە نێوان ئەو دەوڵەتانەی ئامرازی گەیاندنیان هەیەو ئەوانەی نیانە. لە وڵاتانی پیشەسازیدا، ئامرازی میدیای نوێ، ئەرکی ئامرازەکانی دیکەی میدیای گۆڕی.

ئەم تۆڕە پەیوەستە بە دەیەها تۆڕی هەرێمی و ناوخۆیی، بەڵام لە بارەی هەواڵ و زانیارییەکان دەتوانرێ راستەوخۆ لە زیاتر لە پەنجا رۆژنامەی ئەمریکی سوود وەربگرێ کە لەلایەن کۆمپانیای (knight-ridder)ەوە بڵاو دەکرێنەوە، سەرەڕای کۆمەڵێ رۆژنامەی هەڵبژێردراو لە وڵاتانی کەنەداو بەریتانیا. هەروەها دەتوانرێ پەیوەندی راستەوخۆی هەبێ لەگەڵ ئاژانسەکانی ئەسیۆشێتد پرێس و رۆیتەرز و ئاژانسی رۆژنامەنووسی فەرەنسیدا. ئەمە لە کاتێکدایە کە ژمارەی کۆمپیوتەرە بەکارهێنراوەکان لەم بوارەدا گەیشتۆتە زیاتر لە دە ملیۆن کۆمپیوتەر، کە لە ساڵی ٢٠٠٠ دا



گەیشتە نزیکەی (٣٠٠) ملیۆن کەس. بەمشێوەیە ئەم تۆڕە توانیویەتی کۆمەڵگەیەکی تەواو دروستبکات، کە خاوەن دابونەریتی خۆیەتی، سەرەڕای هەبوونی زمانی تایبەتی خۆی، بەمەش دەتوانین بڵێین ئینتەرنێت بۆتە دەربڕی نموونەیی رۆشنبیری دوای سەردەمی نوێگەریی.

ئەم کەناڵە نوێیە لەم چەند ساڵەی دواییدا بە شێوەیەکی زۆر فراوان بۆ وەدەستخستنی زانیاری بەکار دەهێنرێ، بەرادەیەك وای لێهاتووە کە لای کەسانێك جگە لە ئینتەرنێت هیچ کەناڵێکی میدیایی تر بۆ زانیاری وەدەستخستن بەکارناهێنرێ. هەر لە سەرەتای پەیدابوونی ئینتەرنێتەوە و بڵاوبوونەوەی بە نێو خەڵکی ئاساییدا، مشتومڕێکی زۆر لەسەر باوەڕپێکراوێتی پەیدابووە. چونکە ئەمیش وەك گۆڤارو رۆژنامە و رادیۆ و تەلەفزیۆن و کەناڵەکانی تری میدیا سەرچاوەیەکە بۆ زانیاری پەخشکردن و گۆڕینەوەی بیروڕا و شمەك کڕین و زۆر کاری سەیری تر، بەڵام ئەو زانیاریانەی کە لە ئینتەرنێتدا بەرچاومان دەکەوێ سەلمێنراو و باوەڕپێکراو نین. ئینتەرنێت ناجێگیرترین سەرچاوەی زانیارییە، چونکە خاوەن وێبەکان رۆژ بەرۆژ لاپەڕەکانیان دەگۆڕن، کەمی دەکەنەوە یان زۆرتری دەکەن یاخود هەندێجار بەتەواوەتی کۆمەڵێك لاپەڕەی زۆر لادەبەن و ئیدی کەس ناتوانێ بیانبینێتەوە.

بەهەرحاڵ ئەمە هەنگاوێکی پێشکەوتووە، بەڵام بەلای زۆربەی رۆژنامەکانەوە پەیڕەوکردنی قورسە بە هۆی زۆری تێچوونەکانییەوە. بڵاوکردنەوە لەسەر لاپەڕەکانی ئینتەرنێت بۆتە بارگرانێکی گەورە بەسەر زۆربەی رۆژنامەکانەوە کە هەوڵدەدەن هەندێ لەو تێچوونانە لەرێی زۆرەملێوە بخەنە سەر ئەو کەسانەی کە ریکلام بڵاو دەکەنەوە لەلایان، لەپاڵ ئەو ریکلامانەی کە لە رۆژنامەکەیاندا بۆیان بڵاو دەکەنەوە. بەهەرحاڵ زۆربەیان وای دەبینن کە بڵاوکراوەی ئەلیکترۆنی جۆرێکە لە بەرگریکردن لە خۆیان کە هەندێ لە رۆژنامەکان پەنایان بۆ بردووە بۆ بەردەوامبوونیان لەسەر گۆڕەپانەکە.

ئینتەرنێت رێگە بەهەموو کەسێکی ئاسایی دەدات کە بچێتە ناو سەرجەم سایتی ئەو رۆژنامانەوە کە خۆی دەیەوێ بیانخوێنێتەوە لە سەرتاسەری جیهاندا، بەتایبەتی ئەو بابەتانەی کە ئارەزووەکان و رێڕەوی بیریان بۆ پڕ دەکاتەوە، ئەم ئەرکەش یەك رۆژنامە ناتوانێ خواستی خوێنەرەکانی بەدیبێنێ، رۆژنامەکان پەیڕەوی سیاسەتی خۆیان دەکەن لە بڵاوکردنەوەی زانیارییەکان. بەهەرحاڵ گەر ئەوانەی کە خوێنەری رۆژنامە ئەلیکترۆنییەکانن کە رانەهاتوون رۆژنامەی کاغەزی بخوێننەوە لەبەر هەر هۆکارێك بێ، ئەمەش دەستکەوتێکی گرنگە بۆ پیشە و کاری رۆژنامەوانی و ئەو پەیامەی کە هەیەتی.

## چاخی رۆژنامەگەری ئەلیکترۆنی:

داهێنان و دروستکردنی کاغەز لای چینییەکان، هەزاران ساڵ لەمەوبەر، بازدان و وەرچەرخانێکی گەورە بوو بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی. لە گرنگترینیان، پاراستنی بەشی هەرە زۆری کوولتوری مرۆڤایەتی بوو لە فەوتان. دواتر داهێنانی چاپخانە و کاغەزی چاپکراوی کردە سەرچاوەی گواستنەوەی زانست و زانیاری و بیرو ئەندێشەی زانایان. یەکەم رۆژنامە لەسەر زەمینی ئیمپراتۆرییەتی چینییەکاندا سەریهەڵدا، لە چەرخی حەوتەمی زایینییەوە هەواڵ و زانیاری لە بارەی بۆنە و رووداوەکانەوە، لە شاری پەکین و دەوروبەریدا بڵا بووەوە، بەڵام یەکەم رۆژنامەی ئەوروپی لە نەوەدەکانی چەرخی شانزەیەمدا بڵاو بووەوە، تاکو شەستەکانی چەرخی نۆزدەیەم رۆژنامە نەیتوانی وەکو هۆکارێکی کارای میدیایی رۆڵی خۆی بەرجەستە بکات.

رۆژنامە بەردەوام لە رووی ژمارە و جۆر و ناوەڕۆك و ئاستی کاریگەرییەوە لە گۆڕانکاریدا بووە، بە مەبەستی کاریگەرییەکی زیاتر لەسەر خوێنەر. بۆیە لەگەڵ پێشکەوتنە تەکنەلۆژی و داهێنانە نوێیەکانی ئەو بوارە، پرۆسەی بەجیهانیکردنی گەیاندن و زانیارییەکان سەریهەڵدا. گەرچی ریشەی ئەو پرۆسەیە دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی چەرخی نۆزدەهەم، بەڵام دیاردەیەکی چەرخی بیستەمە. چونکە لەو زەمەنە و کرداری گەیاندن و گەیاندنی زانیارییەکان لە پێوەرێکی جیهانیدا بوونە تایبەتمەندییەکی هەمیشەیی و دیاریی بواری میدیا و ئابووری و کایە کۆمەڵایەتییەکان.

ئەگەر دۆزینەوەی چاپ لەلایەن (گۆتێنبێرگ)ەوە بە سەرەتای دەرکەوتنی رۆژنامە دابنرێ بەو مانایەی کە ئەمڕۆ بەسەریدا بڕاوە، ئەوا دۆزینەوەی ئینتەرنێت و بڵاوبوونەوەی بە شێوەیەکی خێراو فراوان لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا چەندین گۆڕانکاری بنەڕەتی لە رۆژنامە و پیشەی رۆژنامەگەریدا بەرپاکرد و بووە مایەی دەرکەوتنی جۆرێکی نوێ لە رۆژنامە کە بە رۆژنامەی ئینتەرنێتی (Electronic News Paper) یان رۆژنامەی ناکاغەزی ( Paperless News Paper) ناسراوە و بە وێنەی رۆژنامەی چاپکراو لە شێوە کلاسیکییەکەی ئێستادا کەوتە خۆسەپاندن لە قۆناغی بەکارهێنانیدا یان مامەڵەکردن لەگەڵیدا لەلایەن جەماوەرەوە، پاشان وەك جێگرەوەیەك بۆ ئەو جۆرەی رۆژنامە لە کاتی گەیشتنی بە قۆناغی پشت پێبەستنی لەلایەن خوێنەرانەوە.

ئاسانترین شێوازەکانی پێشکەشکردنی بابەتەکان لە ئینتەرنێتدا بەوە باس دەکرێ کە (چاپکراوێکە لەگەڵ هەندێ زیادەدا) و بریتییە لە دەقێکی نووسراو لە بابەت کە تیایدا



سەرچاوەی دیکە لەخۆدەگرێ وەك وێنەی فۆتۆگرافی و پارچە دەنگییەکان یان وێنە گیراوەکان بە ڤیدیۆ، یان ئاماژەکردن بە ماڵپەری تری ئەلیکترۆنی تا زانیاری زیاتر بەدەست بکەوێ. بە شێوەیەکی خێرا سیستمی پەخشی رادیۆیی و تەلەفزیۆنی بە هۆی چالاکی کۆمپانیا گەورەکانەوە گەشەی کرد، ئەم جیهانگیرێتییە میدیاییەش لە چەرخی بیستەمدا بەرجەستە بوو. بوونی سەرمایە، توانای داهێنانی، هێزی کاری پێشکەوتوو، کۆمپانیا فرە نەژادەکان لە رۆژئاوادا، فاکتەری سەرەکی سەرهەڵدان و پراکتیزەبوونی ئەو پرۆسەی جیهانگیرییە.

رۆژنامەگەری ئەلیکترۆنی کۆکەرەوەی واتای رۆژنامەگەری و سیستمی دۆسیەی زنجیرە یەك لە دوای یەکەکانە، بڵاوکراوەیەکی ئەلیکترۆنی رووداوە هەنووکەییەکانە، ئیتر بابەتە گشتییەکان بێ یان تایبەتییەکان، لە رێگەی دەزگای کۆمپیوتەر و بە هۆی تۆڕی ئینتەرنێتەوە بەرهەم دەهێنرێ، هەندێ کاتیش رۆژنامەی ئەلیکترۆنی پەیوەستە بە رۆژنامەی کاغەزی چاپکراوەکانەوە. زۆرجار ئاماژە بۆ بەکارهێنانی (یاسای زانیارییەکان) دەکرێ، لە هەمانکاتیش ئاماژە بۆ بەکارهێنانی تۆڕی ئینتەرنێت دەکرێ بەمەبەستی گەیشتن بە سەرچاوەی زانیاری و بەڵگەنامە لە بارەی ملیۆنەها بابەتەوە. رۆژنامەگەری ئەلیکترۆنی جۆرێکە لەو پەیوەندییەی کە لە نێوان مرۆڤەکاندا بەدی دێ لە رێگەی فەزای ئەلیکترۆنی، ئینتەرنێت، تۆڕەکانی زانیاری و گەیاندن، هەروەها هونەر و شێوازو ئەو توانایەی کە لە رۆژنامەگەری کاغەزیشدا بەکاردێ، لەگەڵ میکانیزم و هۆکاری گەیاندن و تەکنۆلۆژیای تردا، کە گونجاو بێ لەگەڵ ئەو فەزا ئەلیکترۆنییەدا، وەکو ناوەندێکی گەیاندن لەوانەش بەکارهێنانی دەق و دەنگ و رەنگ و ئاستە جیاوازەکانی تری کارلێك لەگەڵ وەرگردا، بۆ ئاگاداربوون لە دۆخی را لە رابردوو و ئێستاو ئایندەدا، هەروەها شیکردنەوە و گەیاندنی بە جەماوەر لە رێگەی ئەو فەزا ئەلیکترۆنییەوە بە شێوەیەکی خێرا.

رۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان ئەو رۆژنامانەن کە ئینتەرنێت وەکو کەناڵێك بەکاردێنن بۆ بڵاوکردنەوەی وشە و دەنگ و رەنگ بە شێوەیەکی زیندوو، هەروەها هەواڵ و زانیارییەکان. رۆژنامەگەری ئەلیکترۆنی بریتییە لەو رۆژنامانەی کە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاو دەبنەوە، وەکو رۆژنامەیەکی چاپکراو لەسەر شاشەی کۆمپیوتەر، کە ناوەڕۆك و دەنگ و رەنگ و وێنەی جووڵاو لەخۆدەگرێ، کە فۆرمێك یان زیاتری هەیە لە هەمان رۆژنامەی کاغەزی یان کورتەیەك لە تەواوی ناوەڕۆکی ئەو رۆژنامەیە و رووبەرێکی فراوان بۆ ئازادی رادەربڕین و خزمەتگوزاری بەکۆ گەیاندن دابیندەکات. لە رێگەی ئەو خزمەتگوزارییە گەورەیەی کە تۆڕی ئینتەرنێت

پێشکەشی دەکات، رۆژنامەگەری ئەلیکترۆنی توانیویەتی بە شێوەیەکی بەرچاو خۆی لە گۆڕەپانی میدیادا فەرز بکات و وەك رکابەرێکی رۆژنامەگەری کاغەزی دەربکەوێ سەرەڕای بوونی نەوەیەکی نوێ کە پێیوایە کلیك کردن و گەیشتن بە سەرچاوەکانی هەواڵ و زانیاری زۆر لە هەڵدانەوەی پەڕەکان ساناترو چێژی زۆرترە.

فەزای چاپکردن و بڵاوکردنەوەی زانیارییەکان لە ژێر کاریگەری و گۆڕانکارییەکی گەورەی تەکنەلۆژی و پێشکەوتنێکی بەردەوامی ئازادی بیروڕادایە. کە ئەو کاریگەرییە لە هەموو بوارەکاندا دەرکەوتووە و بە جوانی هەستی پێدەکرێ؛ لەوانەش هۆکارەکانی میدیا. ئەو پێشکەوتنە سەرەتا لە داهێنانی وشەی چاپکراو، پاشان دەستکەوتە مەزنەکانی مرۆڤ وەك داهێنانی تەلەگراف و بێتەل و تەلەفۆن و رادیۆ و تەلەفزیۆن و دەرکەوتنی کەناڵی ئاسمانی و کۆمپیوتەر دەستیپێکردووە تاکو تۆڕی جاڵجاڵۆکەی جیهانی و دەرکەوتنی بڵاوکردنەوەی نامەخانی و ئەلیکترۆنی و دواتر رۆژنامەگەری ئەلیکترۆنی کە فۆرم و شێوازێکی نوێی میدیایە لە رێگەی ئینتەرنێتەوە و توانایەکی زۆری هەیە لە گۆڕینەوەی ناوەڕۆکدا. رۆژنامەگەری ئەلیکترۆنی لە ئاکامی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیای گەیاندن و تۆڕی وێبی جیهانی زیاتر پەرەی سەند و بووە هێمایەکی دیاری شۆڕشی زانیارییەکان، کە شۆڕشی زانیارییەکانیش بۆ خۆی دەرەنجامی شۆڕشی تەکنۆلۆژیای دیجیتاڵی و کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت بوو. ئێستا رۆژنامەی ئەلیکترۆنی بە شێوەیەکی زیاتر لە رۆژنامەی کاغەزی دەخوێنرێتەوە، بەرای چاودێران ئایندەی رۆژنامەگەری جیهانی رۆژنامەی ئەلیکترۆنییە، ئەمەش نەك لەبەر ئەوەی ئەم رۆژنامەیە بە بێ بەرابەر یان خوێنەر بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك تۆڕی ئینتەرنێت بەکاردێنێ، بەڵکو لەبەر ئەوەی رۆژنامەی ئەلیکترۆنی لە ناوەڕۆکدا لە رۆژنامەی کاغەزی جیاوازە.

بەردەوامبوون لەسەر خوێندنەوەی رۆژنامە چاپکراوەکان بەرێژەیەکی کەم لەلایەك و لەلایەکیتریشەوە ئارەزووەکانی ئەو رۆژنامانە لە بەردەوامبوون بۆ گەیاندنی پەیامەکەیان وایکرد، هەندێ لە چاپکراوەکان لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت هەندێ ناوەڕۆکی زانیارییەکانیان بڵاو بکەنەوە، بەو هیوایەی بخرێنە بەردەم خوێنەری نوێ کە پێشتر زانیاری پێویستیان سەبارەت بەو رۆژنامەیە و ئەو سیاسەتەی پەیڕەوی دەکات نەبووە. بەو هیوایەش هاوکارییان بکات بۆ دوبارە بڵاوبوونەوەی رۆژنامەکە بە شێوەیەکی بەرفراوان، بەڵام وادەردەکەوێ ئەم ئامانجانە بەوشێوەیەی ئەو رۆژنامەوانە چاوەڕێیان دەکرد نەهاتنە دی. سەرباری بڵاوبوونەوەی خوێندەواری و بەرزبوونەوەی ئاستەکانی لانیکەم لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا، بەڵام نەوەی



نوێ زۆر گرنگی بە خوێندنەوەی رۆژنامە نادات و ئەوەی پێباشە لە رێی ئامرازەکانیترەوە چاودێری هەواڵەکان بکات و زانیارییەکان وەربگرێ، ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەو زانیاریانە ناگاتە ئاستی ئەو زانیاریانەی کە رۆژنامەکان بڵاوی دەکەنەوە لە رووی وردیی لێکدانەوەی بە شێوەیەکی بابەتیانە.

بۆ یەکەمجار لە ئایاری ساڵی ١٩٩٢ دا، رۆژنامەی (شیکاگۆ ئۆنلاین) وەك رۆژنامەیەکی ئەلیکترۆنی بە شێوازە کلاسیکییەکەی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان لەسەر تۆڕی ئەمریکا ئۆنلاین لەلایەن شیکاگۆ تریبوونەوە بڵاوکرایەوە. دەرکەوتنی رۆژنامەکان لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت زۆر هێواش بوو، بەتایبەتی لەسەر وێب، کە لە سەرەتای نەوەدەکانەوە دەرکەوت، (مارك دیوز) لەوبارەیەوە دەڵێ: "لە هەشتاکاندا هەواڵەکان لە سیما دیارەکانی تۆڕی ئینتەرنێت بوو، بەڵام لە (web)دا، دەرکەوتنی هەواڵەکان دواکەوت". لە گرنگترین دەستپێکەکانی، گۆڤاری (wired) بوو کە لە کانونی دووەمی ساڵی ١٩٩٣دا دەرکەوت، هەر لەو ساڵە ئیزگەی ئینتەرنێتی و دواتر رۆژنامە و گۆڤاری تریش دەرکەوتن.

لە قۆناغەکانی پێشووتردا لەسەر تۆڕی بازرگانی بوون، وەك (ئەمەریکا ئۆنلاین، برود جی، کمبیوسیرف) لە ساڵی ١٩٩٤دا، پرۆسەی بڵاوکردنەوەی رۆژنامەکان لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت دەستیان پێکرد. لە بارەی ئەزموونی (دەیلی تیلیگراف) دیوز دەڵێ:: یەکێکە لە سەرەتاییترین ماڵپەرەکانی رۆژنامە ئەوروپییەکان لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت کە لە تشرینی دووەمی ١٩٩٤ەوە بڵا دەکرێتەوە و زیاتر لە یەك ملیۆن بەشداربووی لە کۆپییە ئەلیکترۆنییەکاندا هەیە، ئەوەش بە سەرەتای کرانەوەی ئینتەرنێت دادەنرێ بە رووی جیهاندا. بەڵام لە ساڵی ١٩٩٥ەوە، توانی زۆرترین رۆژنامەی ئەلیکترۆنی لە وڵاتانیتری جیهان لەخۆ بگرێ، کە پێش ئەو مێژووە زۆربەی رۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان ئەمەریکی بوون کە ژمارەیان زیاتر لە ٦٠ رۆژنامە بوو. لە ساڵی ١٩٩٦ەوە بەکارهێنەران لە سەرانسەری جیهاندا ئینتەرنێتیان وەك سەرچاوەیەکی زانیاری رۆژنامەگەری درك پێکرد.

رۆژنامەی (کیبراسیۆن)ی چەپڕە و کە رۆژنامەیەکی رۆژانەی نیشتمانییە لە فەرەنساو خاوەنی ٨ ملیۆن خوێنەرە کە هەموو رۆژێك لەو رۆژنامەیەوە بەدواداچوون لەسەر رووداوەکانی ژیان دەکەن، بەڵام ئێستا ئەو رۆژنامەیە رۆژ لە دوای رۆژ لە قەیرانێکی زۆر ئاڵۆز و توند نزیك دەبێتەوە، کە رەنگە بە هۆی پەیدابوون و سەرهەڵدانی نوێترین و زۆرترین رۆژنامە بەربڵاوە ئەلیکترۆنییەکان هێندەی تر بە دوو قات و سێ قات بەرەو رووی بێ هەرمێنی و زیان بێتەوە.

(جاك ئاتالی) نووسەری رۆژنامەی ناوبراو ئاماژەیدا کە "رۆژنامە رۆژانەییەکان بەدەر لە نیگەرانی خۆیان بۆ ئەو رەوشە ناهەموارەی کە ناتوانن بەرەنگاری ببنەوە، ئێستا لە جموجوڵدا وەك لاشەیەکی سست و مردوون، چونکە ئاسانکارییەکان لە ئینتەرنێتدا ئێستا بوارەکانی خۆی سەپاندۆتەوە سەر نووسراوی ئەو میدیایەی کە لە هەڵسوکەوتی کەناڵ و میدیا جیاجیاکانەوە ئاماژەی پێدەکرێ، لەهەمانکاتدا بەرفراوانبوونی رێژەی دانیشتوان لە ولاتی فەرەنسا بەتایبەتیش لە گشت دونیادا قۆناغێکی سەرەکی و گرنگە بۆ بەستنەوەی هۆکارەکانی میدیا و هەوڵە جیهانییەکان لە ناو تۆڕی ئینتەرنێتدا". (ئاتالی) دەڵێ: "دروستبونی چەرخی رۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان بارودۆخێکی زۆر قورسی دروستکردووە بۆ ئەو رۆژنامە نیشتیمانییە کە لە پانزە ساڵی رابردوودا قەبارەی کارەکانیان بەرێژەی ٧،٥٪ بەرەو سستبوون و چوونە دواوە چووە".

لە ساڵی نەوەدەکانی سەدەی رابردوودا کەشێکی رەشبینی هەبوو سەبارەت بە ئایندەی پیشەسازی رۆژنامەوانی لە ئاکامی بڵاوبوونەوەی بەکارهێنانی ئینتەرنێت کە توانایەکی زۆری هەیە لە بڵاوکردنەوەی هەواڵەکانی بە شێوەیەکی یەك لە دوای یەك و زۆر بە پەلە. دوای ئەوەش کە رێکلامەکان روویان تێکرد، لەوکاتەوە ئەو بۆچوونە هەیە کە لەم سەدەیەدا (رۆژنامەی ئەلیکترۆنی) رۆژنامەی کاغەز دەسڕێتەوە. هیچ رۆژنامەیەکی گرنگ نییە لە ولاتانی جیهاندا کە سایتێکی لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت نەبێ، پێشکەوتنی ئەم بوارەش چاوەڕوان دەکرێ لەسەر حیسابی رۆژنامە چاپکراوەکان بێ، لەمبارەیەوە (جۆن سکویارز)ی گەورە پیاوی بواری رۆژنامەوانی وتی "رۆژنامەی چاپکراو مرد، پێویستە پیشەسازی رۆژنامەوانی گرنگییەکی زۆر بە بڵاوکردنەوەی ئەلیکترۆنی بدات". ئەوەش ئێستا بەراستی روودەدات، ئەوەتا رۆژنامە گەورەکان بەبێ بەرابەر مانشێتی رۆژنامەکانیان لەگەڵ کورتکراوەی هەواڵەکان بەنامەی ئەلیکترۆنی بۆ ئەوانە دەنێرن کە داوای دەکەن، ئەمەش خزمەتێکی گەورەیە بۆ ئەو کەسانە کە کاتیان نییە بۆ خوێندنەوەی ئەو رۆژنامانە، یان ئەو کەسانەی کە ئەو رۆژنامانەیان لە کاتی گونجاودا بەدەست ناگات.

رەنگە ئەم نمونەیە زیاتر لە ئایندەدا بڵاو ببێتەوە بەوپێیەی کە ژیان ئاڵۆز بووە و خەڵکی کاتی نییە سەرجەم رۆژنامەکە بخوێنێتەوە. لەمبارەیەوە رۆژنامەی (نیویۆرك تایمز) لە مانگی ئۆکتۆبەری ٢٠٠٥ رایگەیاند رۆژنامەکەی بە تەواوی لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاودەکاتەوە، ئەم بڵاوکردنەوەیەش وێنەیەکی تەواوی چاپکراوی ئەو رۆژنامەیەیە و سەرجەم وتارەکان و



وێنەی رەنگاورەنگ و ریکلامەکان لەخۆدەگرێ. بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی هەموو بەیانییەك بۆ بەشداربووانی دەنێرێ، دەشتوانن لای خۆیان بیهێڵنەوە و هەر کاتێك بیانەوێ بگەڕێنەوە سەری. لەلایەکیترەوە رۆژنامەی (گاردیان)ی بەریتانی قەبارەی لاپەڕەکانی خۆی گۆڕی تاکو گونجاو بێ بۆ گرنگیدان بە بڵاوکردنەوەی وێنەی رەنگاورەنگ هەروەها گۆڕانکاری لە شێوازی هەواڵەکانیدا ئەنجامدا. نزیکەی نیوەی ئەوانەی رۆژنامەکان لەسەر شاشەی کۆمپیوتەر دەخوێننەوە، خوێنەری ئەو رۆژنامەیە یان رۆژنامەیەکیتر نین. (گاردیان) ئەوەشی راگەیاندووە لەسەرجەم بابەت و لێکدانەوە و وتارەکان کە لە چاپکراوە کاغەزییەکەیدا بڵاوکراوەتەوە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێتیش بڵاوی دەکاتەوە، بێ ئەوەی هیچی لێ کەم بکاتەوە یان گۆڕانکاری بەسەردا بهێنێ، هەروەها بە بێ بەرابەریشە و رێگە بەخوێنەران دەدات بەتایبەتی ئەوانەی دەرەوەی بەریتانیا، ئەو بابەتانەشیان بکەوێتە بەردەست کە ئەرشیف کراون.

## جۆر و تایبەتمەندییەکانی رۆژنامەی ئەلیکترۆنی:

رۆژنامەگەری ئەلیکترۆنی کە هەنووکە بە لوتکەی کاری رۆژنامەگەری دێتە ئەژمار، کۆمەڵێك تایبەتمەندی لەخۆگرتووە کە لەگەڵ شۆڕشی زانیارییەکان و جیهانگیریەتی میدیا یەك دەگرێتەوە وەك:

١- خێرایی لە گواستنەوەی هەواڵەکاندا، لە هەمان ساتی روودانی رووداو و گۆڕانکارییەکانداو بڵاوکردنەوەیان لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت.

٢- توانای زۆری رۆژنامەی ئەلیکترۆنی لە گواستنەوەی هەواڵ و بەدواداچوون و شیکردنەوە و لێکۆڵینەوەی هەواڵ و رووداوەکان بوونی رووبەری فراوان بۆ دابەزاندنی درێژەی هەواڵەکان. رۆژنامەنووس بۆ نووسینی وتارێك لە رۆژنامەی کاغەزیدا زۆرجار رووبەرووی گرفتی کەمی رووبەری پێویست دەبێتەوە کە ئەم گرفتە لە رۆژنامەی ئەلیکترۆنیدا بوونی نییە، واتە رۆژنامەنووس رووبەری پێویستی بۆ فەراهەم دەبێ کە بە ویستی خۆی بەکاری بێنێ، تا بتوانێ هاوسەنگییەك دروستبکات لە نێوان جەماوەر یان وەرگردا لەلایەك و خوڕایی رۆژنامەگەری پێویست لەلایەکیترەوە، تۆڕی ئینتەرنێت چارەسەری ئەو کێشەیەی کردووە، رۆژنامەی ئەلیکترۆنی دەتوانێ رووبەری زۆر فراوان دەستەبەر بکات.

٣- توانای گەیاندنی هەواڵ و زانیاری بۆ بەکاربەر لە هەر کات و شوێنێکدا. هاوکات پابەند نەبوونی بە جەماوەرێکی تایبەتییەوە، بەو واتایەی کە پەیامە رۆژنامەگەرییەکە دەکرێ ئاراستەی تاکە

کەسێك یان کۆمەڵێك بکریٚ، بەڵام نەك بۆ جەماوەرێکی زۆر فراوان هەروەکو لە هۆکارەکانی تری میدیادا بەدی دەکریٚ، ئەوەش بە دیاردەی گۆڕانی هۆکارەکانی میدیا لە جەماوەرییەوە بۆ تاکەکەسی لە قەڵەم دەدریٚ، بە واتایەکیتر گۆڕان لە ناوەندێتی گەیاندن و یەکخستنی جەماوەرەوە بۆ نامەرکەزی گەیاندن و پەرتەوازەکردنی جەماوەر، بە دوو ئاراستەی کارکردنی جیاواز لە نێرەر و وەرگر مەبەست لێی ناردنی خۆراکی رۆژنامەگەری تایبەتە بۆ وەرگر و ئازادی وەرگر بۆ وەرگرتن و وەدەستهێنانی ئەو هەواڵ و زانیاری و بابەتانەی کە خۆی مەبەستێتی.

٤- توانای گەیاندن بە زیاتر لە ماڵپەرێکی ئەلیکترۆنییەوە، بۆ ئاگاداربوون لەسەرجەم رووداو و ئاگادارییەکان و دەستکەوتنی هەواڵ و زانیاری پێویست.

٥- بوونی وێنەی رەنگاورەنگ و دیمەنی ڤیدیۆیی کە لە رۆژنامە کاغەزییەکاندا دەگمەن و کەمەو ئەگەریش هەبیٚ تێچوونێکی ماددی زۆری پێویستە بۆ خاوەنی رۆژنامە کلاسیکییەکان، ئەوەش فاکتەرێکی گرنگی سەرنجڕاکێشانی خوێنەر و بیسەر و بینەرە.

٦- دەستپێڕاگەیشتنی هەرزان و ئاسانی رۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان لە رێگەی ئینتەرنێتەوە و ئاسانکاری زۆر لە ئەنجامدانی کاری رێکلام تیایاندا. ئەم خەسڵەتە بۆ بەکارهێنەری ئینتەرنێت زۆر گونجاوە، چونکە ئەوەی کەمترین زانیاریشی لە بەکارهێنانی ئینتەرنێت و کۆمپیوتەردا هەبیٚ دەتوانیٚ بە سانایی بگات بە سەرچاوەکانی هەواڵ و زانیاری لە تۆڕی ئینتەرنێتدا و سوودی لێوەربگریٚ. تێچوون لە رۆژنامەی ئەلیکترۆنیدا کەمترە لە رۆژنامەی کاغەزی کە پێویستی بە کاغەزو چاپخانە و دابەشکەر و ژمارەیەکی زۆر کارمەند و پەیامنێر هەیە، بۆیە رۆژنامەگەری ئەلیکترۆنی ئەمڕۆ بە شێوەیەکی بەرچاو گەشەی کردووە، بگرە زۆرجاریش وەك پرۆژەیەکی ئابووری سوودی لێوەردەگیریٚ سەرەڕای ئەنجامدانی ئەرکی رۆژنامەگەریش.

٧- بوونی کارلێکێکی بەردەوام لە نێوان رۆژنامە و بەکارهێندا، هەروەها گواستنەوەی بابەت و هەواڵ و زانیارییەکان بە هەر سیٚ شێوەی نووسین و دەنگ و رەنگ لە یەك کاتدا، ئەمەش لە سیما هەرە دیارەکانی رۆژنامەی ئەلیکترۆنییە. لە رۆژنامەی کاغەزیدا تەنها کارلێك بریتییە لە پەیوەندی نێوان خوێنەرو رۆژنامەکە ئەویش لە رێگەی سەیرکردنی بابەتی خوازراوی خوێنەر و پاشان خوێندنەوەیەتی، لەگەڵ هەڵدانەوەی پەڕەکاندا، لە رادیۆدا گوێگرتن و لە تەلەفزیۆندا بینین و بیستن لەگەڵ هەندیٚ کارلێکی سادە لە بەرنامە



راستەوخۆکانیاندا، بەڵام لە رۆژنامەگەری ئەلیکترۆنیدا کارلێکێکی راستەوخۆ و بەردەوام و کارا لە نێوان نێرەر و هۆکاری گواستنەوە و وەرگردا هەیە.

٨- نەبوونی سانسۆر و بوونی ئازادییەکی لەرادەبەدەر لە رۆژنامەگەری ئەلیکترۆنیدا.

**رۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان بە سیٚ شێواز پۆلێن دەکرێن:**

١- ماڵپەری رۆژنامە کاغەزییەکان لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت یان هەندیٚ لە کەناڵە ئاسمانییەکان، کە بە کۆپی ئەلیکترۆنی تەواوکەریان دێتە ئەژمار و زۆربەی بابەت و بڵاوکراوکان و چەندین بەرهەمی رۆژنامەنووسی تریش لەخۆدەگریٚ، بە هۆی بیٚ سنووربوونی رووبەری بڵاوکردنەوە و کاری بەردەوامی رۆژنامەنووسی تیایدا.

٢- ماڵپەڕە هەواڵگری و میدیاییەکانی تایبەت بە لێکۆڵینەوە و شیکردنەوە و بەدواداچوونی هەواڵ و رووداوەکان و ئامادەکردنیان بۆ بڵاوکردنەوە لەسەر تۆڕەکە. ئەو پەیامنێر و هەواڵگر و نووسەرانەی لەم جۆرە ماڵپەرانە کار دەکەن بەگشتی بە (رۆژنامەنووسانی ئینتەرنێت) ناوزەد دەکرێن.

٣- ئەو رۆژنامە ئەلیکترۆنییانەی کە کۆپی کاغەزیان نییە و لە شەقامدا بڵاو ناکرێنەوە و زۆربەی کات بەرهەمی تاکەکەسین و هەموو جۆرە هەواڵێکیش لەخۆدەگرن وەك ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی، زانستی، وەرزشی، هەروەها هەواڵی هونەری وك شانۆ، سینەما و موزیکیش بڵاو دەکەنەوە و سوود لە پێشکەوتووترین تەکنۆلۆژیای میدیا و زانیارییەکان وەردەگرن تاکو بە جوانترین شێوە کاری خزمەتگوزاری ئەنجامبدەن، ئەم رۆژنامانە رۆژانە بڵاو دەبنەوە و بەردەوام گۆڕانکاری بەسەر ناوەڕۆکەکەیاندا دیٚ.

رۆژنامەنووسی ئۆنلاین وەکو سەربازی نێو جەرگەی شەڕ وایە، کە پێویستە هەموو ئامراز و پێویستییەکانی رووبەڕووبوونەوەی پیٚ بیٚ، کە لەو جەنگە پێویستی پێدەبیٚ، بەتایبەتی کلاوی پەیوەندییەکان و کامێرای دیجیتاڵی ڤیدیۆیی و فۆتۆگرافی زۆر پێشکەوتوو، دەزگای رادیۆی ئەلیکترۆنی بچووك...هتد، تا بتوانیٚ بەئاسانی ماددە رۆژنامەوانییەکان بگوازێتەوە بۆ رۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان لەمیانەی تۆڕی ئینتەرنێتەوە.

# بەشی پێنجەم

## جیهانگیریی میدیا

"ئێمە ناتوانین وڵاتانی عەرەبی بگۆڕین، ئەوەی دەتوانیێ بیانگۆڕیێ، ئەو سێلە بچکۆلەیە کە دایدەنێن بۆ وەرگرتنی کەناڵە ئاسمانییەکان".

(شیمۆن پیرێز) سەرۆکی پێشووتری ئیسرائیل

پێناسەیەکی دیاریکراو بۆ چەمکی میدیا نییە، لەبەر فراوانی بوارەکە و تێکەڵاوی لەگەڵ چالاکی و پەیوەندییە مرۆییەکان، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی میدیا، "بریتییە لە چالاکییەکی مرۆیی، ئامانجی پەیوەندی گرتنە لەگەڵ ئەوانیتر و کارتێکردنیان و کاریگەربوون پێیان لەمیانەی ئامرازگەلی دیاریکراوی گەیاندنەوە". زۆر پێناسە و بۆچوون هەیە لە بارەی میدیا کە هەر کەس و لایەنێك بەپێی بۆچوونی خۆیان پێناسەیان بۆ دارشتووە. لەوانە: "میدیا پەیامێکی راست و دروستە بۆ جەماوەر بە هۆی هۆکارەکانی گەیاندنەوە". هەروەها، "بەگەڕخستنی توانا ماددی و مرۆیی میدیاکانە لە پێناو وەدیهێنانی کۆمەڵێك ئەنجامی دیاریکراودا".

میدیا بەمانای گەیاندنی هەموو جۆرەکانی زانیاری دێ لە رێگەی هۆکار (کەناڵ) ێکەوە، لە رۆژگاری ئەمڕۆدا میدیا زۆر فراوان بووە و سەرجەم بوارەکانی ژیانی کۆمەڵی گرتۆتەوە، بۆتە بەشێکی گرنگ لە ژیانمان و بەجۆرێکی وا تێکەڵ بووە لەگەڵ وردەکاری ژیانمان کە ناکرێ بە هیچ جۆرێك لە گرنگی و بایەخی کەم بکرێتەوە. ئەوەی لەم پێناسەیەشەوە دەردەکەوێ، سێ فاکتەری بنەڕەتی میدیایە کە بریتین لە: (توانا ماددی و مرۆییەکان، کەناڵەکانی میدیا و کۆمەڵێك ئەنجامی دیاریکراو. ئەمەش لە رێگەی پلانێکی داڕێژراو و نەخشە بۆ کێشراوی توند و تۆڵەوە دەبێ. هەروەها پێناسەیەکیتر هەیە دەڵێ: "میدیا پەیام و نێرەر و ناوەندی (ئامراز) و شێواز و وەرگر و کاردانەوەیە، تاکو شوێنەواری ئەو گوتارە راست بێ، دەشێ گوتاری ئامانجەکەی سیاسی یان کۆمەڵایەتی یاخود ئابووری یان رۆشنبیری یاخود ئایینی یان هەر شتێکیتر بێ". ئەمەش لە رێگەی ناوەندەکانی میدیاوە کە بریتین لە ئێزگەی بینراو بیستراو و رۆژنامە، گۆڤار، کتێب، کۆنگرە، محازەرە یان چاوپێکەوتنی شەخسی و... هتد.

(حەمید زەهران) دووپاتی دەکاتەوە کە میدیا: "بریتییە لە پرۆسەی بڵاوکردنەوە و پێشکەشکردنی زانیارییە راست و روونەکان و هەواڵە راستەقینەکان و بابەتە ورد و رووداوە دیاریکراوەکان و بیرە مەشقییەکان و بۆچوونە پتەوەکان، ئەمانە بۆ بەرژەوەندی گشتی ئاراستەی جەماوەر دەکرێ، دەبێ بە شێوەیەکی روون سەرچاوەکان دیاریبکرێ، میدیا لەگەڵ عەقڵ و سۆزی پاکی جەماوەری دەدوێ و گفتوگۆ و ئاڵوگۆڕی بیروڕاو قەناعەت پێکردن بە شێوازێکی دیموکراسییانە ئەنجامدەدات، بۆیە دەبێ پرۆسەی میدیا پرۆسەیەکی بابەتی و جێی متمانە بێ". لەوانەیە ئەم پێناسەیە وێنەی نموونەیی میدیا پیشانبدات کە لەبەر کاریگەری



چەندین فاکتەر لە میدیای هاوچەرخدا نایبینین. کە هەندێجار لەچوارچێوەی ئەم وێنە نموونەیەدا نایهێڵێ. هەروەها میدیا مێژوو و جوگرافیا و شوێن و کات گۆڕانی بەسەردا دێنێ و کاریگەری لەسەر هەیە، بۆیە چەندین تیۆر هەن بۆ پێناسەکردنی میدیا و تێگەیشتن لە چەمکەکەی. لە فەرهەنگی ویبستەردا هاتووە "میدیا بریتییە لە زیادکردنی هۆشی جەماوەر بە هەواڵ و زانیاری و را بەمەبەستی کارتێکردن بە شێوەیەکی راستەوخۆ. یان دەوترێ میدیا زانستی پەیوەندیکردنە بە جەماوەرەوە، تەنها رێگەیە بۆ گۆڕینەوەی بیرو هۆش و زانیاری و رابەری چالاکی بیروڕایە لە کۆمەڵدا".

میدیا تەنیا چالاکییەکی مرۆیی نوێ یان نوێکراو نییە، گەرچی لەم ماوەی دواییە بە شێوەیەکی بەرچاو رۆڵەکەی پەرەی سەند. کۆمەڵگە کۆنەکان چالاکی دیاریکراوی میدیایان پەیڕەو کردووە و ئامرازی دیاریکراویان بەکارهێناوە لەوانە: بازرگانی، نێردراوی ئایینی، بانگەواز، تەپڵ لێدان، جەژن و کۆڕەکان، هەڵبەستی شیعری، ئامرازی دەربڕینی وەك نووسین و نەخش و نیگار...هتد. ئەو کۆمەڵگەیانە جۆرەها ئامرازی گەیاندن و میدیای بەخۆوە بینیوە، لەگەڵ پەرەسەندنی ژیانی مرۆڤایەتی ئامرازەکانی میدیا پەرەی سەند و پەرتووك و نامەو دواتر رۆژنامەو...هتد، پەیدا بوون. لە سەردەمی ئێستاشدا ئامرازیتر پەیدابوون، کە هەندێکیان گەیشتوونەتە ئاستێکی بەرز لە ئاڵۆزی و وردبینی و خێرایی وەك مانگە دەستکردەکان و ئامرازەکانی گەیاندنی جیهانی دەرەوە (دەرەوەی چوارچێوەی گۆی زەوی).

**بە شێوەیەکی گشتی دەکرێ ئامرازەکانی میدیا بەمشێوەیە دابەش بکەین:**

١- ئامرازە بنەڕەتییەکان: ئەمانە دەگرێتەوە: رادیۆ، تەلەفزیۆن، کەناڵە ئاسمانییەکان، تۆڕەکانی ئینتەرنێت، ئاژانسەکانی هەواڵ...هتد.

٢- ئامرازە لاوەکییەکان: سینەما، شانۆ، کاسێت، سیدی، لافیتە، وێنە، پەرتووك،...هتد.

میدیا باس لە لایەنە جۆراوجۆرەکان دەکات و چارەسەری زۆر پرس و بابەتی جیاواز دەکات، ئامرازی جۆراوجۆری میدیایش هەن، بۆیە چۆن ئامرازی گونجاو هەڵبژێرین کە وا بکات میدیاکەمان سەرکەوتوو بێ؟ بۆ دیاریکردنی میدیای خوازراو پێویستە چەند هۆکارێك رەچاو بکەین گرنگترینیان:

١- بابەت: ئایا دەمانەوێ چی لەمانە بزانین (بیرۆکە، پرەنسیپ، هەواڵ، پڕوپاگەندە بۆ بەرهەمهێنەر...هتد).

٢- مەودا: دەمانەوێ میدیاکە ئاراستەی کێ بکەین؟ ئایا میدیاکە لەسەر ئاستی تاکی، لۆکاڵی، نیشتیمانی، هەرێمی، نێودەوڵەتییە؟ ئایا ئاراستەکراوە بۆ کەسانی دیاریکراو، کۆمەڵە کەسێکی دیاریکراو یان بۆ هەمووان؟

٣- بارودۆخی دەوروبەر: مەبەست لێی ئەو بارودۆخی مێژوویی و قۆناغییەیە کە پێیدا تێپەڕ دەبین، هەروەها بارودۆخ و باری سروشتی و ئاسمانی، لە چوارچێوەی ئەو مەودایەی کە دەمانەوێ رایبگەیەنین.

٤- ئامانج: چیمان دەوێ لە میدیا؟ ئایا دەمانەوێ بیرۆکە یان پرەنسیپ بڵاو بکەینەوە؟ ئایا دەمانەوێ هاریکاری و پشتگیرییەك وەدەست بێنین؟ ئایا روونکردنەوە یان شرۆڤەکردنی هەڵوێستێکمان مەبەستە؟ ئایا دەمانەوێ ترس و تۆقاندن بڵاو بکەینەوە؟ ...هتد).

٥- توانای دەستەبەربوو: مەبەست لێی توانا ماددی و تەکنیکی و مرۆییە دەستەبەربووەکانە.

٦- بواری زەمەن: مەبەست لێی ماوەی بەردەوامێتی کاری میدیاکە و خێرایی بڵاوبوونەوەیەی.

دیاریکردنی ئامرازی میدیا رۆڵێکی جەوهەری دەبێ لە سەرکەوتنی کاری میدیا و گەیشتن بە ئامانج، لایەنی ئابووریش رۆڵێکی بەرچاو دەبینێ لە دیاریکردنی ئامرازی میدیا، لەبەر جیاوازی زۆر لە تێچوونی ئامرازێك بۆ ئامرازێکیتر.

## ئەرکەکانی میدیا:

ئەمڕۆ میدیا بۆتە یەکێك لە پێداویستییەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و توانیویەتی لەناو گۆڕەپانی پیشەسازی و تەکنۆلۆژیادا رۆڵی خۆی بگێڕێ و ئاراستەو بۆچوونی جیاواز لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکیتر یان لە تاکێکەوە بۆ تاکێکیتر دروستبکات و خۆی بە ژیانی سەردەمیانە بناسێنێ و رۆڵی بونیاتنەر یان رووخێنەر یان هەردووکیان پێکەوە لە کۆمەڵگە بگێڕێ بەپێی مەبەست و پلانی تەواو. میدیا ناوەند و پێناوێکە بۆ گواستنەوەی زانیاری، لەم سەردەمەدا رووداوگەل بە تەواوی کار لە ژیان دەکەن، خەڵك مافی خۆیانە لە راستی ئەو رووداوانەی دەوروپشتیان ئاگاداربن و زانیارییان لەلا هەبێ یان بۆچوونی ماقووڵ و شیکردنەوەی زانستانەیان پێبگات، ئەمەیە ناوەڕۆکی ئەرکی میدیا، لەبەر ئەوەی میدیا جیا لە ئەرکی گەیاندنی راستی ئەرکی پەروەردەکارانەشی هەیە، زۆربەی نووسینەکان لە بارەی میدیاوە کۆکن لەسەر ئەوەی کە میدیا سێ ئەرك یان ئامانجی سەرەکی هەیە، ئەوانیش:



- گواستنەوە و گەیاندنی زانیارییە بە خەڵکی.
- هەوڵدان و کارتێکردنە لە رایەکانیان و پێکهێنانی.
- خۆشگوزەرانی، دڵخۆشکردن، بەسەربردنی کاتی دەستبەتاڵی.

لەو ئەرکە گشتییە سەرەکییانەش کە هۆکارەکانی بەیەك گەیاندنی جەماوەری بەئەنجام دەگەیەنێ، ئەرکی پێکهێنانی راو بۆچوونەکان لەلای تاك و کۆمەڵ و میللەتاندا، چونکە رۆڵ و گرنگی هەیە لە پێکهێنانی رای گشتیدا هەرچەندە ناکرێ ئەمە لە ئەرکەکانی تری وەك هەواڵگەیاندن و ئەرکەکانی گەیاندن و فێرکردن جودا بکرێتەوە، بەڵام بەو تایبەتمەندییە جیادەکرێتەوە، کە بایەخ بە پێکهێنانی راوبۆچوونەکان لەلای جەماوەر دەدات، دەنگۆی پەیوەندییە گشتییەکان و پێکهێنانی رای گشتیش لە چوارچێوەی ئەم ئەرکەدان.

ئەرکی میدیا یارمەتیدانی تاکەکانی کۆمەڵە بۆ تێگەیشتن لە بابەتەکان و ئاگاداربوون ژینگەی دەوروبەر بۆ ئەوەی خۆیانی لەگەڵدا بگونجێنن، ئەمە لە کاتێکدا تاکی ئەم سەردەمە توانای نییە ئاگای لەو هەموو تیۆرە نوێیەکان و دۆزینەوە زانستی و پێشکەوتنە تێکنەلۆژییەکان بێ، لە بەرئەوە میدیا ئەو کارە بە شێوازێکی ئاسان بۆ تێگەیشتن و بە زاراوەیەکی ئاسایی دوور لە وشەی زانستی ئاڵۆز ئەنجامدەدات، بەمەرجێك واتا رەسەنەکان وەکو خۆیان بمێننەوە. هەروەها میدیا رۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە پرۆسەی پەروەردەی کۆمەڵایەتی و گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی تاك بە شێوەیەکی گشتی و دەزگاکانی میدیا رۆشنبیری لە نێوان نەوەکاندا دەگوازنەوە. میدیا ئەرکی زۆرە، چونکە لەگەڵ عەقڵی جەماوەر دەدوێ نەك غەریزەکانی و یارمەتی دەدات بۆ گەشەپێدانی بیرکردنەوەی رەخنەگرانەی تاکەکانی کۆمەڵ و لێرەدا میدیا بۆ پرکردنەوەی بۆشاییەکانی کەمیی زانیارییەکانی جەماوەر هەوڵدەدات. هاوکات میدیا هەوڵدەدات بۆ هێورکردنەوەی خەڵك لەو گرژی و ناخۆشییانەی رۆژانە لە ژیاندا تووشیان دەبێ و بەرەنگاریان دەبێ هەروەها هەوڵدەدات بەردەوام زانیاری نوێ فێری خەڵك بکات.

میدیا بوارێکی زۆر گرنگە لە ژیانی سەردەمدا کە لە رێگەیەوە مرۆڤ ئاگاداری تەنانەت بچووکترین پێشکەوتنو پێشهاتیش دەبێ لە جیهاندا. پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیای میدیا کە خۆی لە پێشکەوتنی کەناڵەکانی میدیادا دەبینێتەوە، لە هەنگاوەکانی فراوانبوون و گەشەکردنی جیهانگیری خێراتر کرد، پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا بە شێوەیەکی گشتی وایکردووە هەموو جۆرە کەلوپەلێك بەنرخێکی گونجاو بۆ هاوولاتی دەستەبەر بکات.

میدیا دەرفەتی نزیکبوونەوەی جەماوەریانە لە نێوانی تاکەکانی کۆمەڵدا دەرەخسێنێ و بوار بەمرۆڤ دەدات هەواڵی خەڵکی چ دووربن یاخود نزیك، بزانێ. ئەمەش بواری یەکتر ناسینی کۆمەڵایەتی و نزیکبوونەوە لەیەکتر زیاد دەکات و دەبێتە مایەی حاڵیبوون لە باروودۆخ و رەوشی خەڵکانیتر و هاوسۆز بوون لەگەڵیاندا. هەروەها میدیا ئەرکی فێرکاری و زانستیاریش رادەپەڕێنێ، بەوەی کە زانیاری تایبەت لە بارەی هەلومەرجی دەورو پشتمان دەخاتە بەردەست و چاومان، ئەم هۆیەش زانیاری و پسپۆڕی و هزر لە نێوان خەڵك دەگوازنەوە، بۆ ئەوەی بیریان رووناك بکەنەوە ئاستی بیرکردنەوە و زانستییان زیاتر بکەن و هەڵوێستیان لە ئاست رووداو و پێشهاتگەلی کۆمەڵایەتی بسازێنن. پەیامی دروستی میدیا ئاشکراکردن و پەردە هەڵماڵینە بەسەر رووی راستییەکاندا، بەگوێرەی بەرنامەیەکی زانستی و دارشتنی نەخشە و پرۆگرامێك بۆ دروستکردنی رای گشتی ناوخۆ، ناوچەیی، نێودەوڵەتی، بۆ ئەوەی خاڵەکانی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤی رووداو و پێشهاتەکان لێکبداتەوەو دیاریبکات و بە شێوەیەکی سەرنجراکێش و کاریگەر پێشکەشیان بکات.

پەیوەندی نێوان میدیا و کۆمەڵگە پەیوەندییەکی مشتومڕانەیە کە پەیوەندی کاریگەری و کاریگەربوونە، میدیای بەهێز پێویستی بە کۆمەڵگەیەکی مەدەنی بەهێز و لێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و دادوەرییەکی سەربەخۆ و ژیانێکی دیموکراتی شەفاف و جیهانبینی روون هەیە. لەلایەکیترەوە پێویستە میدیا لە کۆمەڵگەدا لە پێناو وەدەستهێنانی زیاتری ئازادی و سەربەخۆیی و پیشەگەری خەبات بکات بۆ ئەوەی ببێتە جێی برواو رێزی کۆمەڵگە.

رەوشتی میدیاکاریی لە سێ ئاستەوە سەرچاوە دەگرێ، ئەوانیش بریتین لە: کاریگەری دەسەڵاتی دەوڵەت لەسەر لایەنەکانی رەوشتیی میدیا و ئەو پێوەرە رەفتاریانەی کە دامەزراوە میدیاییەکان دایانڕشتووە و راپەڕاندنی کار لەلایەن میدیاکارانەوە بەپێی رەوشتەکانی پیشە، نەبوونی چوارچێوەیەکی رەوشتیی بۆ میدیا دەبێتە مایەی هەڕەشە بۆ سەر بەهاکان لە کۆمەڵگەدا. لە هەموو جوگرافیای سەر زەمین هەڵمەتەکانی میدیا خەریکە عەقڵییەتی خەڵك بۆ مەدەنییەت دەگۆڕێ و بەرەو شارستانییەت دەیپەڕێنێتەوە، هاوکات لەگەڵ سێ دەسەڵاتەکەی تردا دەم لە دیموکراسی و مافی مرۆڤ دەدات و داکۆکی لە هەموو رەنگ و رەگەزە جیاکان دەکات و لە گشت گۆشە و ئاراستەیەکەوە هۆشیاری بڵاو دەکاتەوە. میدیا، ئامرازێکی پەیوەندییە لە نێوان مرۆڤدا، هەڵگری نێوبەندی نێوان زانیاری و بابەتێکە، کەناڵی پەیوەندیکردنی گرووپێکە، کە ئەرکێکی پێ سپێردراوە بۆ لایەنێکی دیاریکراو جێ بەجێ



دەکەن، بە کورتییەکەی ئامرازێکی گشتییە بۆ گەیاندن و ئامادەکردنی زانیاری وەك (دەنگوباس، پەروەردەکردنی کۆمەڵایەتی و رامیاری و زانستی و ئایینی یان گفتوگۆکردن) لە رێگای زمان، نووسراو (چاپەمەنی)، وێنە، موزیك، پرۆپاگەندە.

**دەتوانرێ سیستمی راگەیاندن بەمشێوەیە پۆلێن بکرێ:**

- میدیایەك کە پابەندی کات بێ، وەك دەنگوباسی رۆژانە، یان پابەند نەبوو بە کاتەوە وەك نووسینی پەرتووکێك یان گۆڤارێك.
- میدیایەکی بینراو یان بیستراو، رادیۆ و تەلەفزیۆن و ئینتەرنێت.
- میدیا لە رێگای ئامادەکردنی چالاکییە کوولتوری و کۆمەڵایەتی و رامیاری و ئایینی و زانستییەکانەوەیە وەك فیستیڤاڵ و کۆبوونەوەی جەماوەری و مێزگرد و گواستنەوەی راستەوخۆ بۆ کەناڵەکان.

**لە رووی تەکنیکییەوە، دەتوانین جۆری میدیا بەمشێوەیە دابەش بکەین:**

- میدیایەکی سەرەتایی، کە هیچکام لە بەشداربووان، ئامرازێکی تەکنیکی بەکارناهێنن، وەك ئاخاوتن لە نێوان چەند کەسێك، یان کۆڕ گرتن و مێزگرد.
- یەك لە بەشداربووان ئامرازی تەکنیك بەکاردێنێ، وەك چاپکردن و رۆژنامەگەری.
- هەردوولا ئامرازی تەکنیك بەکاردێنێ، وەك رادیۆ، تەلەفزیۆن و بینەر، بیسەر.
- میدیا بە هۆی کۆمپیوتەرەوە، کە پێویستی بە ئینتەرنێت هەیە بۆ بەردەوامبوونی پەیوەندییەکی هەمەلایەن و جۆراوجۆر.

## میدیای سەردەم:

بە هۆی رۆڵە کاریگەرییەکەی لەم سەردەمەدا، وڵاتانی جیهان بایەخێکی زۆر بە میدیا دەدەن، چونکە جیهانی پان و بەرینی ئێستا بە هۆی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیاوە لێك نزیك بوونەتەوە. رووداوەکان بەزووترین کات دەگاتە هەموو کونجێکی گۆی زەوی. ئەگەر وەرگر بیەوێ لە هیچ شتێکدا نامێنێ و دەتوانێ هەرچی هەیە لە جیهاندا بەئاسانی و لە ماوەیەکی زۆر کەمدا بزانێ. وەك بڵێی مرۆڤی ئێستا بۆتە مرۆڤێکی جیهانی و پانتایی زەوی سنووری لێناگرێ، رۆشنبیری پێ دەوڵەمەند دەبێ و دەتوانێ لە ژیانی رۆژانە کەڵکیان لێ وەربگرێ، زانیاری جۆراوجۆر بەهۆی دەزگاکانی میدیاوە خەڵکی لێك نزیك دەکاتەوە ئەمەش مەترسی هەیە بەوەی رەنگە هەندێ وڵاتی بەتوانای خاوەن رۆشنبیری تۆکمە کار بکاتە سەر وڵاتانی

لاوازی خاوەن رۆشنبیری بێ هێز و رۆشنبیرییان لەو شەپۆلەدا بتوێتەوە و لـەیاد بـچێ، چـونکە ئەو کاریگەرییە کار لە وڵاتانی هەژار و دواکەوتوو دەکات.

کەواتە میدیا وەکو پردێك ژیانی تاکە کەس بە جیهانی دەرەوە دەبەستێتەوە و زۆر دەزگای میدیا هەیە، کە مەبەستی تایبەتی خۆی هەیە، ئەو بیروباوەڕەی کـە هەیـەتی راسـتەوخۆ یـان ناڕاستەوخۆ بڵاو دەکاتەوە بۆ سوود و مەبەستی خۆیان، ئێستا لایەنی دەزگای میدیا ئاوەڵاترەو کراوەیە بە رووی خەڵکێکی زۆر لە جیهاندا کە دەتوانێ رەخنە بگرن و میدیای ئـەم سـەردەمە وەکو پێشوو نییە کە میـدیا لـە سەرچاوەیەکەوە زانیـاری وەردەگـرت، ئێـستا هـیچ کـۆت و بەندێکی نییە و گۆڕەپانێکی گەورەیە لە رێگەی هەزاران ئامێری کۆمپیوتەرەوە کـە بەسـتراوە بە تۆڕی جیهانییەوە، دەتوانرێ لە ماوەیـەکی کەمـدا هـەموو هـەواڵێك بگەیەنرێتـە هـەموو کەسێك. میدیا بە چەند قۆناغێکدا تێپـەڕیوە تـاکو گەیـشتۆتە ئـەوەی ئـەمڕۆ، تازەگـەری و پێشکەوتنی بەخۆوە بینیوە و لەمبارەیەوە بەردەوامە و ناتوانین سنووری دەستنیـشان بکـەین، بەتایبەتی دوای پەیـدابوونی تـۆڕی ئینتـەرنێت و بـەکارهێنانی لەلایـەن جـەماوەرەوە و ئـەو خێراییەی کە پێی گەیشتووە و بەهۆی ئینتەرنێتەوە شۆڕشێکی گـەورەی میـدیای بـەرپاکرد، چونکە ئینتەرنێت دەتوانێ زانیاری بنێرێ و وەربگرێ.

وێرای ئەم پێشکەوتنە سەرسوڕهێنەرە دەزگاکـانی میـدیا بـێ گیروگرفـت نـین، بـە هـۆی بەربڵاوی ئەو دەزگایانە هەل دەڕەخسێت بۆ هەندێ خەڵك ئەو لایەنە کۆنترۆڵ بکـەن لـە پێنـاو ئارەزووەکانی خۆیان و وەدیهێنانی بەرژەوەندی تایبەت لە رێگـەی هـەبوونی دەزگـای میـدیای تایبەت (ئەوانەی سەرمایەی زۆریان هەیە) یان لە رێگـەی بەرنامـەی رۆشـنبیری و کۆمیـدی، کۆنترۆڵکردنی دەزگاکانی میدیا لەلایـەن رژێمـەکانی جیهـانی سـێیەم کـە تـەنها بیروبـاوەڕی تایبەتی خۆیان پەخشدەکەن و ئازادی پێـشێل دەکـەن لـە هـەمووی ترسـناکترە کـە دەتـوانێ راستییەکان ئاوەژوو بکرێن و بشاردرێنەوە و تەنها لە خزمەتی خۆیاندا بێت، زۆر لە وڵاتان کـە حوکمی تاکەکەسی دەکەن دەزگای میدیا دەکەنە ئـامێر و هاووڵاتیـانی خۆیـانی پـێ چەواشـە دەکەن و بە شان و باڵی رژێمی خۆیـان هەڵـدەدەن و سـەر لـە خـەڵکی سـاویلکە دەشـێوێنن، سانسۆر دەخەنە سەر گشت لایەنێکی میدیا، بەوەی بێ پرسی ئەوان هیچ شتێك بڵاو ناکرێتەوە و هەمیشە دژی ئازادی رۆژنامەگەرین، ئەمەش لە دوارۆژدا کاردانەوەی خراپی دەبێت بۆ سـەر کۆمەڵگە. لە ژیانی تاکەکانی کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا، میدیای مـۆدێرن رۆڵـی هـەرە گـرنگ دەگێڕێ، مرۆڤی مۆدێرن لە جیهانی میدیادا دەژی، لەوکاتەوەی لەخەو هەڵدەستێ تـا دووبـارە دەخەوێتەوە بە بەردەوامی کۆنتاکی لەگەڵ میدیادا هەیە.



کەرەستە و ئامێر و ئامرازەکانی پەیوەندی و میدیا لـە دونیـای ئـەمڕۆدا پێـشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە، هەڵبەت ئەم گەشـەکردنە دەرەنجـامی شۆڕشـی تـەکنۆلۆژیای نوێیـە، هەروەها میدیای ئەمڕۆ ئەڵقەی پێکەوە بەستنەوەی بەرژەوەندییە هاوبەش و پێکەوە گونجـاو و کۆکەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و رۆشنبیرییەکانی نێوان وڵاتانە، بەتایبەتیش ئـەو وڵاتانەی بەرژەوەندی و زەوینەی سیاسی هاوبەش لە نێوانیاندا بەرجەستە بـووە. دیـارە ژیـانی ژیاری و شارستانی سەردەمی ئێستا وا دەخوازێ هیچ وڵاتێـك لـە توانایـدا نـەبێ بـە تـەنیاو گۆشەگیری بژی و خۆی لەبەرابەر رووداو و پێـشهات و گیروگرفتـەکانی دونیـا بێلایـەن بکـات یاخود کێشەکانی ناوخۆی پەردەپۆش بکات، بۆیە کەناڵەکانی میدیا سـەرباری ئـەو گرنگـی و بایەخەی لە ئاڵوگۆڕکردنی دەنگوباس و رووداوەکانی نێودەوڵـەتان و نێـو میللەتانـدا هەیانـە، ئەرکی مکومکردنی ریزەکانی گەلەکانی خۆشیان لە ئەستۆ گرتووە و زۆرجاریش وەکو چـاودێر بەسەر دەسەڵاتەوەن و لە کەموکورتییەکان بەدەنگ دێن.

پێشکەوتنی ئامرازەکانی میدیا چەندین گۆڕانکاری گەورە و بەرچـاوی لـە ژیـانی سیاسـی و ئابووری و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتیدا دروستکردووە، جگە لەمەش کارێکی راسـتەوخۆی کردۆتـە سـەر لێکگەیـشتنی میللـەتان و زەمینەخۆشـکردنی دایـەلۆگ لەگـەڵ یـەکترو دروسـتکردنی سەرەتاکانی زمانێکی یەکگرتووی جیهانی و یـەك هەڵوێـستی، تـا وای لێهـاتووە هەنـدێ کـات هەموو دونیا گوێبیستی یەك دەنگ دەبێ و یەك روانـین دروسـتدەبێ، یـاخود لـە یـەك چـرکەدا تێکرای کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بابەتێك لە سەر یەك پرس دەخوێننەوە. لـەم سـەردەمەی ئێمـەی تێیدا دەژین میدیا و کاری رۆژنامەنووسی زانـستێکی تازەیـەو هاتۆتـە نێـو ژیـانی کۆمەڵگـەی نێودەوڵەتی و جۆرێك هەماهەنگی دروستکردووە و خـۆی بەسـەر دونیـادا سـەپاندووە و بنـەماو تایبەتمەندی خودی و تایبـەتی خـۆی هەیـە. ئـەو شۆڕشـەی ئـەمڕۆ سـەتەلایت و ئینتـەرنێت و کۆمپیوتەر لە رووی چاپ و بڵاوکردنەوەی هەواڵ و میدیاوە بەرپایان کردووە ماوەی سەدان سـاڵی کەم کردۆتەوە و وەك بازدانێکی زانستی گەورەی پـڕ زانیـاری دێتـە بەرچـاو، ئەمـە شۆڕشـێکی زانیاری گەورەیە خراوەتە بەردەم مـرۆڤ بـۆ ئـەوەی بـە تێگەیـشتنەوە سـوودی لێـوەربگرێ ئـەو ئامرازانە بوونەتە دنیایەکی سەربەخۆ و زانستێکی پڕ بـەهایان لەپـشتەوەیە و بـێ لـە دەرگـادان چوونەتە هەموو ماڵێك و هەنگاوی بەردەمی مرۆڤایەتییان کورت کردۆتەوە و هێنـدە کاریگـەرن کەم وڵات و میللەت لە دونیادا هەن هەوڵی ئـەوە نـەدەن سـوودی لێوەرنـەگرن، کـە بۆشـاییەکی گەورە لەبەردەمان تەختدەکات و هەنگاوی چاکمان بەرەو بەشارستانیبوون پێ دەهاوێ.

لە سەردەمی نوێدا کەناڵەکانی میدیا پلە و پایەیەکی زۆر گرنگیان پەیداکردووە، چونکە هەواڵ و زانیاری جۆراوجۆر لە بازنەیەکی بچووکەوە بۆ بازنەیەکی گەورە و فراوانترەوە، لە تاکەکەسەوە بۆ کۆمەڵ و لە دەوروبەری نیشتیمانی و نەتەوەییەوە بۆ وڵاتانی جیهانی دەگوێزرێنەوە و رۆڵێکی کاریگەر لە بواری پەروەردە و رۆشنبیرکردندا دەبینن، بۆیە کەناڵەکانی میدیا چەکێکی دوو سەرەو گرنگن، چونکە رۆشنبیری و زانیاری بڵاو دەکەنەوە و خەڵکی هۆشیار دەکەنەوە بە گژ گەندەڵی و لەرێ لادانندا دەچن و بەرنامەی بەسوود بڵاو دەکەنەوە، هەندێ لایەنی نێگەتیڤیشیان تێدایە کە رەنگە بەشداری لە تێکچوونی نەریت و سەرهەڵدانی هەندێ نەخۆشی کۆمەڵایەتیدا بکەن، جگە لەوەی لە هەندێ لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا دەبێتە هاندەری کاری توندوتیژی.

کەناڵەکانی میدیا هەندێ شتی دژبەیەك و پێچەوانەی یەکدییان تێدایە، چونکە لەلایەکەوە زانیارییەکی زۆر پەخشدەکەن، مرۆڤ ناتوانێ هەموو لە مێشکیدا کۆ بکاتەوە، یان پێ راناگات ئەو هەموو زانیارییە بخوێنێتەوە و لە ئاستیاندا رابوەستێ و سوودیان لێ وەربگرێ، بۆیە تەنیا لە بواری پسپۆری و شارەزایی خۆیدا بایەخ بەو زانیارییانە دەدات، هەروەها کەناڵەکانی میدیا هەندێ هەواڵ و زانیاری پێویست لەمەر رووداوێك لە خەڵك دەشارنەوە، خەڵکیش بەهەر هۆیەك بێ، هەوڵدەدەن ئەو زانیاریانە لە بارەی ئەو رووداوە لە کەناڵی لابەلا بەدەست بێنن، لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی ئەو بابەت و زانیارییانە بەرچاو و گوێمان دەکەون لە پێویستیمان زیاترن و توانای بەرگەگرتنیانمان نییە، کەچی هەندێ زانیاری دیکەش هەن پێویستمان پێیان هەیە، بەڵام ناتوانین دەستبەرداریان بین، لە بەرئەوەی سیستمەکانی میدیا ئاڵۆزن و ریشەیان تێکەڵە، جگە لەوەی ئەو خەڵکەی کە سوودیان لێوەردەگرن ئەوانیش خۆیان ئاڵۆزن، لە بەرئەوەی هەر گرووپێك بایەخ بە بوارێك دەدات و ئاستی هزر و بیرکردنەوە و راوبۆچوونیان جیاوازەو سەرچاوەی رۆشنبیرییان جیایە، ئەمە وادەکات ئەوانەی گوێ لە کەناڵەکانی میدیا دەگرن یان دەیانبینن و دەیانخوێننەوە لە راوبۆچووندا وەکو یەك نەبن.

ئەو رۆڵە کاریگەرەی میدیا لە چاخی ئێستادا لەسەر کۆمەڵگە هەیەتی، تەنیا قۆناغێکی ئاسایی و ئامرازێکی نوێ یان ئامرازێکی پەرەسەندوو نییە، بەڵکو ئاراستەیەکی جیهانییە بۆ میدیا، بەمانایەکیتر میدیا چیتر لە شوێنێك یان سنوورێکی سیاسی یاخود پارچە شوێنێکی جوگرافی قەتیس نەماوە، بەڵکو وای لێهاتووە سنوورەکان ببڕێ و هەموو ئامرازەکانی چاودێری ببەزێنێ و ببێتە مایەی پێکهێنانی گرووپ یان کۆمپانیا جیهانییە جاڵجاڵۆکییەکان کە لە هەموو شوێنێ باڵیان هەیە و لە هەموو جۆرەکانی میدیا بوونیان هەیە.



مرۆڤ کە میدیای خستە ناو ژیانەوە کەڕو لاڵ بوو، لە وێنەیەکی سەر دیواری ئەشکەوتێکەوە دەستیپێکرد بۆ ئەوەی دەوروبەرەکەی تێبگەیەنێ کە خۆشییەکی لە دڵدایە، یان کارەساتێك بەڕێوەیە، زۆر لەم کارەی ورد بووەوە، زۆر راماو تا هاتە گۆ، ئەمە درێژەی کێشاو بووە گەورەترین رێگا بۆ پرۆسەی هۆشیارکردنەوە تا ئەمڕۆی (گلۆباڵ) و (نێت) کار بە میدیا دەکات، یان باشترە بڵێین ژیانی مرۆڤی بە شێوازێکی شیاوتر داڕشتۆتەوە و بە هۆی شۆڕشی گەیاندن لەناو پێکدادانی کوولتوری میللەتاندا نەیهێشتووە لە بەڵای پووکانەوە یان ئاڵوگۆڕ کوولتورەکەی لە دەست بدات، واتە لەو دونیا بچووکبووەدا چاوی هەمیشە کراوەیە و هیچ لە نەریتی سەدان ساڵەی لە کیس نەداوە.

شۆڕشی زانیارییەکان و ئامرازەکانی گەیاندن لە دیارترین سیماکانی ئەم سەردەمەن، ئەم شۆڕشە هەوڵدەدات ئامرازی بونیاتنانی ئایندە بێ لەسەر زەوی، لە سایەی ئەو پەرەسەندنە خێرایانەی لە جیهاندا روودەدەن و ئامرازەکانی گەیاندن سنوورە جوگرافی و سیاسییەکانی بەزاندووە، بەمەش رکابەری مۆرکێکی ئابووری و فەرهەنگی بەخۆوە دەبینێ، ئەمەش گرنگی میدیا و رۆڵەکەی زیاتر دەکات، چونکە هەر کاڵایەك بۆ ئەوەی جیهانیی بێ پێویستە بڕوا بە بەکاربەر بهێنێ و ئارەزووەکانی بەدی بهێنێ جا ئەو کاڵایە ماددی بێ یان فیکری، تا میدیایەکی بەهێز و بڕواپێکەرمان هەبێ هێندە دەتوانین بڕەو بە کاڵاکەمان بدەین بەمەش پێگەمان لە جیهانی دواڕۆژدا پتەو دەبێت. میدیای بەهێز و بڕواپێکراو پێویستی بە ئامرازی پێشکەوتوو هەیە، کە بە شێوەیەکی راستەوخۆ پەیوەستە بە گەشەی پێویستی تەکنیکی، لەم پێودانگەوە گرنگی تەکنیکی میدیا لە ئێستا و داهاتوو دەردەکەوێ، کە گرنگییەکەی لەوەدایە دیارترین ئامرازە لە کرداری گەیاندن بە جەماوەرەوە، ئەمەش لە رادەی ئەو رۆڵە دەردەکەوێ کە لە گۆڕان و پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیدا دەیگێڕێ، لەمیانەی خۆ رۆشنبیرکردن، وەك ئەرکێکی بنەڕەتی هۆیەکانی میدیا، خەڵکی زانیاری نوێ وەردەگرن و گەشە دەدەن بە هەموو ئەوانەی پەیوەندییان هەیە بە کوولتوریانەوە، هەر لە دابونەریت تا بەکارهێنانی زمان و ئامرازە رۆشنبیرییەکانی دیکە و شێوازی رەفتار و شێوازی ژیان و بژێوی. ئەگەر سەرنج بدەینە ئەو گۆڕانکارییانەی کە لەم دواییەدا لە بواری هەوڵدان بۆ گشتاندنی بیروبۆچوون و بەهاو کوولتوری میللەتانی دیکە و لەبەر چەندین هۆی جۆراوجۆر بەسەر میدیادا هات، ئەوا بە روونی رۆڵی میدیا لە بواری گۆڕانکاری و گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی و ئاراستەکردنی بەرەو ئاراستەی دیاریکراو دەبینین.

## جیهانگیریی میدیا:

کاتێك توانای بێ سنووری شەپۆلە کورتەکان دۆزرایەوە، بوونە بواری پێدەری پرۆگرامەکانی ئێزگە تاکو سنووری دەوڵەت و کیشوەرەکان ببڕێ و بگوێزریتەوە بۆ شوێنیتر، (مارشاڵ ماکلۆهان) وتەیەکی بەناوبانگی لەمبارەیەوە هەیەو دەڵێ: "گۆی زەوی بۆتە گوندێکی گەردوونی، لە کاتێکدا تەلەفزیۆن دەرکەوت رووبەری پەیوەندییە مرۆییەکان بەرەو دوا گەڕایەوە و هاووڵاتی لە ناو سنووری ئەو دەوڵەتەی تیایدا دەژیا دابڕا. کاتێکیش ڤیدیۆ دۆزرایەوە پەیوەندییە مرۆییەکان زیاتر رووەو کزی چوون و هاووڵاتی لە ناو ماڵی خۆیدا قەتیس بوو."لەگەڵ بڵاوبوونەوەی کۆمپیوتەری کەسیی و دەرکەوتنی تۆڕی ئینتەرنێتدا، مرۆڤ زیاتر زیندانی ناو ژووری خۆی بوو. ئیتر لێرەوە ئەو وێنەیە هاتە بوون کە گشت پێك نەگونجانەکانی سەردەمی زانیارییەکان و شۆڕشی تێکنەلۆژی بەرجەستە کرد، واتە وێنەی مرۆڤی زیندانی ناو ژوورەکەی کە پەیوەندی بە خزم و هاوڕێ زیندانییەکانی ناو ژوورەکانیان دەکات، لە ریگەی فەزای ئەلیکترۆنی و لەناو گوندێکی گەردوونیدا.

هەندێ وا گومانیان دەبرد کە چارەسەری ئەفسوناوی بۆ ئەم گوندە دەبێتە هۆی گۆڕینی جیهان و هاووڵاتیان وا لێدەکات بە کێشەکانی جیهان هۆشیارتر بن و زیاتر بتوانن هاوبەشی بکەن لە چارەسەر کردنیاندا. بە بۆچوونی ئەوان جیهانی داهاتوو بێ سنوور دەبێ بە شێوەیەك هەر کەسێك هەموو شتێك سەبارەت بەهەر کەسێکیتر دەزانێ، بەوەی هەموومان خەم و گرفتەکانمان بەسەر یەکتردا دابەشدەکەین و یەك دەگرین بۆ ئاسانکردنیان، بەڵام لەسەر ئاستی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان ئەوا جیهان شتێکیتر دەبێ، لە سایەی ئەم جۆرە ژینگەیەدا کە زۆربەی هاووڵاتیان گرنگی دەدەن بە کاروبارە دەرەکییەکان بە هۆی هەرەسی ئازادی جیهانی زانیارییەکان کە گەلان لە یەکتر نزیك دەکاتەوە. دەشێ رەفتاری سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتان کراوەتر بێ و زیاتر هەست بە لێپرسراوێتی بکات و زیاتر وەڵامدەرەوەی لە واقیعدا رووەدات خەون نییە، بەڵکو نزیکە لە کابوسەوە، هەر لێکۆڵینەوەیەکی ورد بۆ ئەم جێگیر نەبوونەی هەواڵە دەرەکییەکان لەسەر جیهان پێك نەگونجاندنێکی ئاشکرا دەردەخات بۆ ئەو زیادبوونە سەرسوڕهێنەرەی کە هەیە لە توانای بەرهەمهێنان و دابەشکردنی هەواڵەکان لە رووبەرێکی دوورەوە، بەرابەر بەمە کەمتەرخەمییەکی ئاشکرا هەیە لەو باربردنەدا، ئەمەش دیاردەیەکە و لە ویلایەتە یەکگرتووەکانداو لە هەردوو جیهانی پێشکەوتوو گەشەکردوودا وەك یەك بوونی هەیە.



زۆر ناوچەی بەرفراوان هەن لەم جیهانەدا کە ناکرێ و ناتوانرێ هەموو کۆ بکرێنەوە، دیارە ئەمەش بە هۆی تێچوونی زۆر یاخود بە هۆی بوونی ژمارەیەك لە رژێمی خۆسەپێنەر کە بوار نادەن بەم لایەنە. جیهان بەو شێوەیە نییە کە پەیوەست بێ بەیەکەوە، بەوپێیەی ئەفسانەی گوندی جیهانی تەپڵی بۆ لێدەدات، باشترین ئەگەرەکان پێمان دەڵێن کە مەعریفەی ئیمە بەم گوندە لە فرە روو جیاوازە، ناکرێ مشتومڕ بکرێ لەسەر کاریگەری سەردەمی زانیارییەکان و شۆڕشی میدیا و تەکنۆلۆژیا لەسەر کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکان.

ئەگەر دۆزینەوەی ئامێر بەرپرسیار بێ لە گواستنەوەی کۆمەڵگەی کشتوکاڵی بۆ کۆمەڵگەی پیشەسازی، ئەوا لەمەدا ئازایەتی دەگەڕێتەوە بۆ شۆڕشی زانستی و تەکنەلۆژی لە گواستنەوەی کۆمەڵگەی پیشەسازی بۆ سەردەمی جهانگیریەتی و بۆ ئاوێتەکردنی پایەکانی ئەم جیهانە بەگشتی لە یەك گوندی جیهانی مەعریفیدا. لەم جیهانە تێهەڵکێش یا بەجیهانگیربووەدا، کات دێتەوە یەك و رووبەرەکان ون دەبن و سەرمایەکان دەگوێزرێنەوە، پیتاك، زانیاری، چەمك، بیرو بۆچوون، هەواڵ و حەزەکان بەخێرایەکی سەرسوڕهێنەرو ئازادییەکی تەواوەوە دەگوێزرێنەوە، دان نانێن بەچاودێری هیچ حکوومەت و سنووری هیچ نیشتیمانێکدا، یاخود بە هێمای ئایدۆلۆژیدا، لە واقیعدا جهانگیریەتی و شۆڕشی زانستی تەکنەلۆژی دوو رووی یەك دراون. گۆڕانکاری وەك ئەوەی یاسایەکی بوونە لەهەمانکاتدا یاسای بەها کۆمەڵایەتییەکانە وەك (ئیبن خەلدون) لە (پێشەکی)یەکەیدا دەڵێ: "کاروباری جیهان و گەلان و دەستکەوت و بەرهەمیان لەسەر یەك شێواز و یەك رێبازی نەگۆڕ نییە، بەڵکو بریتییە لە جیاوازی لەسەر رۆژ و زەمەنەکان و گواستنەوە لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکیتر، ئەمەش لە کەس و کات و شوێنەکاندا بەهەمان شێوەیە. هەمان شێوەیش لەسەر ئاسۆ و ناوچە و زەمەن و دەوڵەتەکان روو دەدات". ئامرازەکانی میدیا رۆڵێکی بنەڕەتی و گەوهەری دەبینن لە داڕشتنەوەی بەها کۆمەڵایەتییەکان و لە گۆڕانکاری تیایاندا.

زۆربەی زانایانی کۆمەڵناسی هاوچەرخ هاودەنگن لەسەر ئەوەی کە شۆڕشی تەکنۆلۆژیای سەردەمی زانیارییەکان و جیهانگیریەتی، نەك تەنها سروشتی دەوڵەتی نەتەوەییان گۆڕی، بەڵکو هەڵسوکەوت و بەها کۆمەڵاتییەکانی مرۆڤایەتیشیان گۆڕی، ئەگەر نەڵێین سەرنخوونیان کردەوە. توانای مرۆڤ کاریگەری نەماوە لە کۆنترۆڵکردنی ئەو رێچکەیەکی تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و رۆشنبیریماندا پێکی دەهێنێ. کەسێکیش ناتوانێ نوقڵانەی رووگەی گۆڕانی کاروباری ئەمڕۆمان بۆ لێبدات، هەر گۆڕانێك لە ناوخۆی

خۆیدا دژەکەی هەڵگرتووە، ئەمەش لە بنچینەدا دەگەڕێتەوە بۆ ژیانی ئێمە لە ئێستاو لەسەدەیەکی نوێدا هێشتا هەر شارەزای پێشەکییەکانی دەبین و دەست لە رووکارەکانی دەدەین و هەوڵدەدەین نیشانە و خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی بدۆزینەوە.

لە رابردوودا حکوومەتە نادیموکراسییەکان زۆر بەسادەیی، نەك تەنها پەرتووك و رۆژنامەکانیان قەدەغە کرد، بەڵکو رێگر بوون لەبەردەم بیر و بۆچوونەکانیش، تەشویشیان دەخستە سەر ئێزگەکان و هاووڵاتیانیان بێبەش دەکرد لە پەیوەندیکردن بە زانیاریگەلێکەوە کە هەمیشە هاو واتای (پیلانگێڕی، مەترسی و رووخێنەری رەوشی لاوەکان) ناوزەد کران، ئێستا جەخت لەسەر ئەوە دەکرێتەوە کە ئەو حکوومەتانە بیانەوێ یا نا سەردەمیان بەسەر چووە، بە پشتبەستن بەوەی کە جیهانگیری رۆڵێکی کاریگەر دەبینێ لە لاوازکردنی حکوومەت و دەوڵەتان، نەك تەنها بە هۆی توانای تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان بۆ ئابڕووبردنی ئەو سیستەمانە، بەڵکو بە هۆی بەردەوامی لیبڕالییەتی ئابووریشەوە لە لاوازکردنی هێزی دەوڵەت لە رێگەی وەرگرتنی بەروبووم لە حکوومەت و خستنە گیرفانی تاکەکانەوە، ئەو تاکانەی نەك تەنها بە شوێن پارێزگارییەکی یاساییدا بۆ ماڵ و سامانیان دەگەڕێن، بەڵکو لەهەمانکاتدا دەیانەوێ رۆڵێکی گەورەیان هەبێ لە بڕیارە کاریگەرەکان لەسەر دەستمایە و سامانیان. هەندێ لە حکوومەتەکان بەتایبەتی تازە گەشەکردووەکان هەوڵدەدەن کرانەوەی ئابووری و سیاسەتی خۆ سەپاندن و دکتاتۆرییان پێکەوە تێکەڵ بکەن، دەشێ لەمەدا سەرکەوتنێکی کاتی بەدەستبێنن، بەڵام شەپۆلی زانیارییەکان چەندە دووریش بێ دەبنە هۆی گۆڕان رووەو دیموکراسییەت.

لەگەڵ ئەمەشدا هەڵەیە وابزانرێ فەزای ئەلیکترۆنی دیموکراسییەت بەهێز دەکات و پشتی دەگرێ، تێڕوانینێکی سەرپێیی بۆ کاری ئامرازەکانی میدیا لە جیهانی ئەمڕۆدا ئەوە دەردەخات کە میدیا بەردەوام یاری پێدەکرێ، چ لە رێگەی دەسەڵاتی سیاسییەوە بێ لە بەرژەوەندی خودی دەیجولێنێ، یاخود لە رێگەی هێزی ئابووری کۆمپانیاکانەوە بێ کە ماددەی راگەیاندنەکان و فرە جۆری و راستگۆییان دیاریدەکات. هێز و گۆڕانکاری بەرەو پێشچوون کە ئەمڕۆ ناوەندە زانیارییەکان بەخۆوە دەیبینێ لەبۆشایدا نین، بەڵکو رەنگدانەوەی حاڵەتی گەشەسەندنی ئابووری و تەکنەلۆژی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری هەموو کۆمەڵگا و هەموو دەوڵەتێکن، بۆیە جێی سەرسوڕمان نییە، کە ئامرازەکانی میدیا لە دەوڵەتە خۆ سەپێنەرو دکتاتۆرەکاندا دەبنە خزمەتکاری دەسەڵاتە سیاسی و لە خزمەتی ئاراستە و ئەولەویەتەکانی



کار دەکات. لەگەڵ ئەمەشدا وەنەبێ بارەکە لە دەوڵەتە پێشکەوتووەکاندا زۆر باش بێ، دەبینین خاوەندارێتی ئامرازەکانی میدیا لە دێرینترین دیموکراسییەتەکانی جیهاندا لە رووی سەنتەرگرتن و قۆرخکردنەوە گەیشتۆتە رادەی مەترسیدار، بۆ نموونە لە بەریتانیا رێژەی بڵاوبوونەوەی راگەیاندنی دەزگاکانی (رۆبرت مردۆخ) گەیشتۆتە ٣٧٪ لە تێکڕای ئەو رۆژنامە نیشتیمانییانەی کە رۆژانە دەردەچن، هەروەها ئەو رۆژنامە نیشتیمانییانەی کە (رۆبەرت هوسانس) خاوەنێتی- بە هۆی هاوکاری بۆ نازییەکان لە کاتی شەڕدا زیندانی کرا- نمایشی زیاتر لە سێ یەکی هەر سێ کەناڵە تەلەفزیۆنە بازرگانییەکان دەکات کە لە لوتکەدان.

ئێمە ئێستا لە جیهانگیرییەکی جەمسەریدا دەژین، تەکنۆلۆژیا نەك تەنها گۆڕان لە جیهاندا بەرپا دەکات، بەڵکو جیهانی مەجازیش دەخولقێنێ و مانگە دەستکردەکانی ناردن و پەخشی تەلەفزیۆنی ئەمڕۆ توانیویانە وا لە خەڵکی بکەن لە هەر دووسەری هەسارەکەمانەوە زۆر بەرێکی کۆمەڵە هاندەرێکی رۆشنبیری فراوان وەربگرن، بینەرانی روسیا پەیوەستن بەو دراما تەلەفزیۆنانەی کە لەلایەن ئەمریکای لاتینییەوە بەرهەم دەهێنرێن، سەرکردەکانی جیهانی گەشەکردووش وای دادەنێین تۆڕی (CNN) سەرچاوەی سەرەکی زانیارییە ناوخۆییەکانی وڵاتی خۆیان بێ. ئێمە لە سەردەمێکدا دەژین ژینگەی جیهانی گۆڕانکارییەکی خێرا بەخۆوە دەبینێ بۆیە پێویستە ئامرازەکانی میدیا رووبەڕووی گۆڕانکارییەکان ببنەوە بە شێوەیەکی خێراو وردتر وەك لە بوارەکانی دیکەی کۆمەڵگە، مرۆڤایەتیش رووبەڕووی ئایندەیەکی گەورەتر لە شڵەژان و ناسەقامگیری بۆتەوە. ئێستا گرنگترین هۆکار بۆ گۆڕانکاری لە جیهاندا ئەرکی گەیاندنە بەخێرایی رووناکی، رۆژانە تەکنۆلۆژیای نوێ لە پەرەسەندندایە کە وا دیارە کات و شوێنی تێپەڕاندووە و سەرانسەری جیهانی لە چرکەیەکدا پێکەوە بەستۆتەوە، میدیا لە سەردەمی جیهانگیری دەبێ (رۆژنامەگەریی تەکنیکی) ببەزێنێ بۆ (بەهای رۆژنامەگەریی). ئامرازەکانی میدیا بە تەواوی ئەرکی سەرشانی بەجێ نەگەیاندووە، پێویستە لە رێگەی رەخنەوە خوێنەران وەرگر لە راستییەکان هۆشیارتر بکاتەوە تاکو بەها رۆحی و ئاکارییەکانی کۆمەڵگە بەرز بکاتەوە.

**جیهانگیریی میدیا سیستمێکی گەیاندنی نێودەوڵەتییە کە هەستکردن بە سنوور دەتوێنێتەوە، لە گرنگترین ئەرکەکانی:**

١- کۆنترۆڵکردنی ئەندێشەی کۆمەڵ، میدیاو تەلەفزیۆن کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر منداڵ و هەرزەکاران هەیە، لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی گۆڕانی شێوەی رەفتاریان. سەرەڕای ئەوەی

لە هەموو چینێك زیاتر شارستانییەتەکانی دیکە کاریان تێدەکا. هەرزەکار و لاوان کە جیهانگیریەتی میدیا زیاتر لە هەوڵی کارتێکردنیانە، ناتوانن خۆڕاگر بن بەرامبەر بە هێرشی میدیا و خۆیان بپارێزن، لە ئەنجامدا هەڵوێستیان لاواز و نەریتیانە دەبێت، کە وایان لێدەکات ناچار بن شێوەی رەفتاری خۆی بگۆڕێ بەو شێوەی کە ئەو میدیایە دەیەوێ.

٢- دارشتنی ژیانی رۆژانە بە شێوەیەك کە روو لە گۆڕان نەبێ، ئەویش بە بەتاڵکردنی مێشکی خەڵك، ئەم جۆرە دارشتنە ئاڵۆزیی و مەترسی خۆی هەیە، چونکە لە هەوڵی بەتاڵکردنی شێوەی بیرکردنەوە کوولتوری میللەتانە لە رێگەی جەختکردنە لەسەر شتی بێ بایەخ و بایەخ نەدان بە هیواو ئاواتە مرۆڤایەتییە سوودبەخشەکان، جێی سەرسوڕمان نییە گەر جیهانگیریەتی میدیای ئەمەریکی و ئەوروپی ببینین کە زیاتر جەخت دەکەنە سەر کێشەی توندوتیژی لە نێوان دراوسێ و کێشەی کوشت و بڕین و تاوانی رێگەوبان و هاوسەرگیری میرو دەوڵەمەندەکان و گواستنەوەی یاریزانان لە نێوان تیپە وەرزشییە ئەوروپییەکان، بەرابەر بەمەش کێشە سەرەکییەکانی مرۆڤایەتی پشتگوێ دەخەن سەرەڕای پشتگوێخستنی بەهاداری شتە پیرۆزەکانی مرۆڤایەتی و دابونەریت و رەفتارە ئایینی و رەوشتە بەرزەکانی میللەتان، هۆیەکانی میدیا رۆڵێکی بنەڕەتی دەگێرن لە دارشتنی ژیانی رۆژانەی میللەتانداو گۆڕانی بایەخیان و گۆڕینی ئاستی مرۆڤایەتییان.

٣- دارشتنی هەستی مرۆڤایەتی و کۆنترۆڵکردنی بەو شێوەیەی کە دەیانەوێ، کەواتە کۆنترۆڵکردنی هەستی مرۆڤایەتی و بەرنامەکردن و گرنگیپێدانی، کۆنترۆڵکردنی ئەندێشەی کۆمەڵەو لە ئەنجامدا کۆنترۆڵکردنی کوولتوری میللەتانە.

٤- پشتگوێخستن و بێ بەها دانانی سەرچاوەی رۆشنبیری و داهێنراوە مرۆڤایەتییەکان کە داهاتێکی ماددی زۆریان لە دواوە نییە، بە گوێرەی ئەم بۆچوونە، هەموو داهێنانێك کە بە شێوەیەکی کەم یان زۆر پەیوەندی بە بازاڕەوە نەبێ، ئەوا بە بێبەهاو بێسوود لە قەڵەم دەدرێ.

٥- بەکارهێنانی بواری هەستیی لە گفتوگۆکردنی میدیادا باڵادەست بووە بەتایبەتی وتووێژکردنی نێوان کۆمەڵگەی پیشەسازیدا، لە جیاتی چەمك و بیروبۆچوونەکان بۆ پەیوەندی و گفتوگۆکردن شتومەکەکان بە کاردێنن، کەرەسەی جوانکاری و خۆڕازاندنەوە و جلوبەرگ لە جیاتی باسکردنی جوانی ئافرەت و مێیەتی بەکاردەهێنرێ، هەروەها ئەو جۆرە دەربڕینە دەتوانێ گەیاندن دروستبکات لە نێوان ژن و پیاوداو پەیوەندی سۆزی و جوانی دەربڕێ.



٦- پرسەکە تەنها بەکارهێنانی شتومەکەکان نییە، بەڵکو گەیشتۆتە رادەیەك کە هەوڵی گۆڕینی بەهاو دابونەریتە کوولتورییەکانی هەموو کۆمەڵگەیەك دەدرێ، سینەماو تەلەفزیۆن و یاریگاکانی تۆپی پێ بەرە بەرە خەریکی گۆڕانی بیروبۆچون و بەهاو دابونەریتەکانن کە کۆمەڵگەکان لەسەری دەڕۆن.

کەواتە شۆڕشی تێکنەلۆژی هەموو قۆناغەکانی گەیاندن و میدیای گرتۆتەوە، بە هۆی ئەویشەوە جیهانگیری گەیشتۆتە ئەم پلە و پایە و کاریگەرییە، چونکە رۆڵی ئەم شۆڕشە روون و ئاشکرایە لەسەر کۆکردنەوەی ماددەی میدیا و چارەسەرکردن و بەرهەمهێنانی و دواتر پەخشکردن و بڵاوکردنەوەی، بەڵکو شێوە و جۆری گوێگرتن و تەماشاکردن و مامەڵەکردنیش لەگەڵ هۆکانی میدیا گرتۆتەوە، ئەم هۆیانەی کە بارودۆخ و شێوەی ئیشکردنی گۆڕیوە، هەروەها شێوە و قۆناغەکانی بەرهەمهێنانیش کە پیایدا تێپەڕ دەبێ ئەو پرسیارەی کە دێتە ئاراوە ئەوەیە، ئایا هاووڵاتی لە جیهانی سێیەمدا چ باجێك دەدات لە ئەنجامی کاریگەری ئەو هەموو ئاراستەکردنەی کە هۆکانی میدیا ئەنجامی دەدەن لە هەموو کات و ساتێکداو لە ژێر چەندەها ناونیشاندا.

بەمشێوەیە دەگەینە ئەو بڕوایەی کە زانیاری و ئامێرەکانی بیستن و بینین و گەیاندن کە کۆنترۆڵی هەموو گۆڕانکارییەکی سەدەی بیست و یەك دەکەن، لێرەشدا هێزی دەوڵەت و کۆمەڵگەکان دەردەکەوێ بەگوێرەی توانایان لە پەخشکردن و مامەڵەکردن لەگەڵ زانیارییەکاندا، چونکە زانیاری دەبێتە وزەیەکی ستراتیژی کە پێشی نەوت و هێزی پیشەسازی دەکەوێ.

لەم سەردەمەدا مرۆڤ بەبێ پەیوەندی بە خەڵکانی دیکە ناتوانێ بژیت، هەروەها واقیعی ئاڵۆزی کۆمەڵگەکان گرنگی رۆڵی گەیاندن زیاتر دەکات، نەخاسمە دوای ئەوەی تەکنۆلۆژیاکانی سەردەم و شۆڕشی زانیارییەکان و هۆکارەکانی میدیا خۆیان بە سەری سەپاند و لە هەموو کات و شوێنێکداو لە هەموو لایەك و بە هەموو زمانێکەوە چوار دەوریاندا، بەجۆرێك شێوەی ژیانی و شێوازی کارکردنی و چۆنێتی پەیوەندییەکانی دیاریدەکەن.

لەگەڵ پەرەسەندنی تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان و ئامێرە نوێیەکانی گەیاندندا مرۆڤ لە هەموو کات و شوێنێکی ئەم جیهانەدا بەئاسانی ئەو زانیارییانەی پێدەگات کە کاریگەرن لە ژیانیدا. لەم دەساڵانەی دواییدا رادەی زۆری کاریگەری هۆکارە تازەکانی میدیا لەسەر خەڵك شاراوە نییە و بوونەتە ئامرازێك کە هەرگیز لە مرۆڤ جودا نابێتەوە وەك سەرچاوەی زانیاری

پشتی پێ دەبەسترێ، کە شێوازی جۆراوجۆر لەخۆ دەگرێ لە وشە و دەربڕین و وێنە و واتای جۆراوجۆر دەنوێنرێن. بەرابەر بەوەی کە مرۆڤ دەتوانێ بە شێوەیەکی هەمیشەیی لە هەر شوێنێکی ئەم جیهانەدا تەماشا بکات و بە دوای زانیارییەکاندا بگەڕێ، ئەوا هۆکارەکانی میدیا دەتوانن لە یەك کاتدا ناوەڕۆکی خۆیان بگەیەننە ملیۆنەها کەس، بۆیە جیهانی کردووە بە (گوندێکی ئەلیکترۆنی) کە هەموو دونیا لەبەردەم چاو دەستی مرۆڤدایە.

بمانەوێ یان نا تەکنۆلۆژیای سەردەم لە بواری گەیاندن و زانیاری بەخشیندا رۆڵێکی مەزن دەگێڕێ لە دروستکردنی گۆڕانکاری کرۆکی لەسەر ئەمڕۆ و داهاتوومان، ئەم گۆڕانکارییانەش کاریگەری بەرچاو بەجێ دەهێڵن لەسەر ژینگەی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی هەموو کۆمەڵگەکان. میدیا تەنها تایبەت نییە بە کۆمەڵە خەڵکێك یان جۆری زانیاری بەخشینی سنووردار نەکراوە، بەڵکو لە توانایدا هەیە روو بکاتە هەموو مرۆڤێك، جا ئەو مرۆڤە کێ بێ و لەکوێ بێ، لە ئەنجامدا کاریگەری مەزنی خۆی بەجێدێڵێ لەسەر تاکە کەس و کۆمەڵگە پێکەوە، ئایا جۆری ئەو کاریگەرییە ئەرێنی بێ یان نەرێنی، بەرەو باش بێ یان خراپ.

چوار ئاژانسی هەواڵی جیهانی قۆرخی ٨٠٪ی زانیارییەکانی جیهانیان کردووە، سەد ماڵپەڕ هەن لەسەر ئینتەرنێت کە قۆرخی ٨٠٪ی بەکارهێنەرانی ئینتەرنێتیان کردووە لە بەکارهینانی سایتەکاندا، بۆیە پێنج یەکی ماوەتەوە بۆ سایتە جیهانییەکانی دیکە. بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت لە ساڵی ٢٠٠٣دا بە ٨٠٠ ملیۆن کەس دەخەملێنرێ، بەڵام لە پیشەسازی زانیارییەکاندا بەگوێرەی ئامارێکی یونسکۆ لە ساڵی ١٩٩٤دا، ئەمەریکا بە تەنها ٥٦٦ ملیار دۆلار و ئەوروپا ٥٤٤ ملیار لەم بوارەدا خەرج دەکات، ئەمەش بواری قۆرخکردن بۆ وڵاتە دەوڵەمەندەکان خۆش دەکات، کە وایکردووە لە شمەکە رۆشنبیری و زانیارییەکان بەگوێرەی یاسای شمەکە بازرگانییەکان بەڕێوەبچن لەلایەن ئەوانەی کە دروستیدەکەن هەروەها ئەوانەش کە پارەی زیاتر دەدەن بۆ کڕینیان. میدیا لەسایەی جیهانگیرێتیدا رۆڵی گەورەی خۆی دەبینێ لە جێبەجێکردنی پلان و بەرنامەکانی جیهانگیری لە هەموو بوارەکاندا. بۆ نموونە، تۆڕی (C.N.N)ی ئەمەریکی رۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە داڕشتنەوەی رووداوەکانی جیهاندا، هیچ دەزگایەکی میدیا لەهەر وڵاتێکدا بێ یان هەر کەسێك کە بە بەردەوامی تەماشای دۆزە جیهانییەکان بکات ناتوانێ بجووڵێتەوە لە چوارچێوەی داڕشتنەوەی ئەو تۆڕەدا نەبێ بۆ رووداوەکان، ئەمەش لەو رۆڵەیدا دەردەکەوێ کە لە جەنگی کەنداوی یەکەم و دووەمدا بینی.



لێرەدا رادەی هەژمووونی میدیای بەرفراوانی رۆژئاوامان بۆ دەردەکەوێ بەتایبەتی ئەمەریکا، ئەمەش لە ئەنجامدا رۆڵی مەزنی خۆی دەبینێ لە بڵاوکردنەوەی بەرنامەکانی جیهانگیری لە بوارە کوولتوری و کۆمەڵایەتی و بەهایەکاندا بۆ دروستکردنی کوولتورێکی جەماوەری (جیهانی) یەك شێوە کە بە شێوازێکی تایبەتی ئامادە کراوە و بە هۆی وێستگە ئاسمانییەکانەوە پەخش دەکرێ، ئەمەش کاریگەری خۆی دەبێ لەسەر سیستمی بەها تایبەتییەکان و دەبێتە شێوازێکی نوێی داگیرکردنی فیکری کوولتوری، بەتایبەتی ئەو لایەنەی کە پەیوەندی هەیە بە شێوازی بەکاربردنەوە. لە بەرابەر جیهانگیری و رۆڵی بەرچاوی میدیا تیایدا میللەتان چەند شێوە هەڵوێستێکیان هەیە، لەوانە: خۆبەدەستەوەدان وەك چارەنووسێکی نووسراو یان رەتکردنەوەی تەواو بۆ هەموو شتێکی، یاخود هەڵوێستی مامناوەندی کە بانگەشەی دەستگرتن دەکات بە ناسنامەی خۆوە لەگەڵ خۆ پەرەپێدان و خۆ گۆڕان کە گونجاو بێ لەگەڵ تایبەتمەندییە شارستانی و کەلەپووری و بەها ئایینییەکان بەبێ تێکەڵبوونێکی رەهاو شوێنکەوتەیی بۆ وڵاتانی خاوەن هەژموون، واتە تێڕوانینی بابەتیانە و سوودبینین لە دەرهاوێشتە چاکەکانی. کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان هەموو ئەو بڕگە جۆراوجۆرانەی کە لە ساڵی ١٩٨٠ لەلایەن کۆنفرانسی یونسکۆوە دەرچوون لە بارەی بابەتەکانی میدیا و گەیاندنەوە پەسەند کرد، کە جەختیان کردبووەوە لەسەر بابەتەکانی میدیای ئازاد و هاوسەنگ و پەیوەندی میدیا بە گەشەسەندن و ناسنامەی کوولتورییەوە و میدیای زانستی و فێرکردن و راهێنان و پێکهێنان.

**سیستمی نوێی جیهانی بۆ میدیا و گەیاندن دەتوانێ لەسەر چەند بنەمایەك دابمەزرێ گرنگترینیان ئەمانەن:**

١- فرەیی لە سەرچاوە زانیارییەکان و کەناڵە میدیاییەکاندا.
٢- ئازادی رۆژنامەگەری و میدیا.
٣- هەموو رۆژنامەنووسان و ئەو پیشەدارانەی کار دەکەن لە بواری گەیاندندا ئازادییان پێ دەبەخشرێ بە مەرجێك بەرپرسیارێتی لەگەڵدا بێت.
٤- پاڵپشتیکردنی توانای وڵاتانی تازە گەشەسەندوو بۆ چاککردنی رەوشی تایبەتی خۆیان، بەتایبەت لە رێگەی پێدانی کەرەستە و ئامێری پێویست و چاککردنی ژێرخانە پێویستییەکان و برەودان بە هۆیەکانی میدیا و گەیاندنی تایبەت بە خۆیان کە توانای بەدەستهێنانی ئومێد و پێداویستییەکانی هەبێ.

٥- بوونی ئارەزووی راستەقینە لەلایەن ولاتە پێشکەوتووەکانەوە لە یارمەتیدانی ولاتانی تازە گەشەسەندوو بۆ گەیشتن بەم ئامانجانە.

٦- رێزگرتن لە کوولتوری تایبەتی هەموو نەتەوەیەك و گشت نەتەوەیەك مافی هەبێ لە میدیای جیهانیدا، بەرژەوەندی و هیواو ئاوات و بەها کۆمەلایەتی و کوولتورییەکانی خۆی رابگەیەنێ.

٧- رێزگرتن لە مافی هەموو میللەتان لە بەشداریکردن لە ئالوگۆڕکردنی نێودەولەتی زانیارییەکاندا، لەسەر بنەمای یەکسانی و دادپەروەری و بەرژەوەندی هاوبەش.

لەم سەردەمی جیهانگیرتیدا هیچ شتێك هێندەی نییە کاریگەر بێ هێندەی هۆکارەکانی میدیا، ئێستا بە ئاسانی دەتوانی ئەوەی دەتەوێ بیگەیەنی بە ملیۆنەها کەس لە رێگەی پۆستی ئەلیکترۆنی یان چاوی کامێرایەکی بچووکەوە دەتوانی بە دەنگ و رەنگ هەرچیت دەوێ بیگەیەنی بە ملیۆنەها کەس لە سەرتاسەری جیهاندا. جاران دەیانگوت (خەلکی لەسەر ئایینی پاشاکانیانن)، بەلام ئەمڕۆ دنیا گۆڕاوە و خەلکی لەسەر ئایینی میدیادان، بۆیە دەسەلاتداران سوورن لەسەر دەستگرتن بەسەر هۆکارەکانی میدیادا. سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیلی پێشوو (شیمۆن پێرێز) باسی دەسەلاتی میدیا دەکات و دەلێ: " ئێمە ناتوانین ولاتانی عەرەبی بگۆڕین، ئەوەی دەتوانێ بیانگۆڕێ، ئەو سەحنە بچکۆلەیە کە دایدەنێن بۆ وەرگرتنی کەنالە ئاسمانییەکان". هەروەها دەلێ: " تواناکانی میدیا زۆر لە تواناکانی سوپا زیاترە بۆیە ناتوانرێ پشتگوێ بخرێ". بلاوکردنەوەی تاکە رووداوێك لە رێگەی تەلەفزیۆنەوە رەنگە هەللایەکی گەورە بنێتەوە و کاریگەرییەکی دەبێ لەسەر دوژمن، کە بە جەنگێکی گەورە رەنگە نەتوانی ئەوەندە ئازاری بدەی.

دۆزراوە تازەکانی بواری ئامرازی میدیا و لاپتۆپ و ئینتەرنێت و ئامێری کۆپی و چاپخانە و فاکس و ڤیدیۆ کاسێت و مۆبایل و گەیاندنی ئاسمانی، لە ئاکامدا (بە کەسایەتیکردنی ئامرازەکانی میدیا)ی لێکەوتەوە، بە قوولێش کاریگەر دەبێ بەسەر پێشوازیکەردا (خوێنەر و گوێگر و بینەر) کە پێشوازی لە هەوالی نێودەولەتی دەکات. لە کۆمەلگەی ئەمڕۆی میدیای نێودەولەتیدا تاکەکەس هەر ئەوە نییە تەنیا پێشوازی لە هەوال و بابەتی کات بەسەربردن بکات، بەلکو رۆلی گۆڕاوە و ئێستا دەگەڕێ بەدوای ئەو شتەی هەلیدەبژێرێ، یان وێلە بە دوای (خوێندنەوە یان گوێگرتن یان بینین) لە ژێدەری جیاجیاوە، بۆیە زۆر لە حکوومەتەکان لە توانایاندا نییە هاوولاتیان کۆنترۆل بکەن، تاك روو دەکاتە لاپتۆپی خۆی کە بە ئینتەرنێتەوە



گرێدراوە و دەبێتە ژێدەری زانیاری. هەروەها ئامێری ڤیدیۆ کاسێت و تۆمارکەری دەنگ، بە شێوەیەکی فراوان توانای تاکەکەسی لە زۆربەی شوێنی جیهان زیاد کرد، بۆ ئەوەی دوور لە سانسۆر سەرپشك بن لە بینین یان گوێگرتن لەو شتانەی ئارەزووی دەکەن.

لە چەمکی جیهانگیریەتی میدیا تێناگەی، بەبێ تێگەیشتن لە جیهانگیریەتی ئابووری، چونکە تێکەلاوبوونێکی گەورە هەیە لە نێوان ئابووری بازاڕو هەژموونی میدیاییدا، گۆڕانکاری گەورە بە ئاراستەی جیهانگیریەتی میدیا لە سالانی هەشتاکانی سەدەی رابردووەوە دەستییپێکرد و ئەم پرسە بەخێرایی بەرەو جیهانگیری پەرەی سەند، هاوڕێ لەگەل جیهانگیریەتی ئابووری و گەشەی دانیشتوان و کرانەوەی سیاسی و ئابووری نێوان ولاتان. گرووپێك لە دەزگا میدیاییەکان توانییان لە پێداویستی کۆمەلگە جیاوازەکان بۆ ماددە میدیاییەکان تێبگەن، ئەمەش یارمەتیانیدا بۆ گەشەپێدانی ئامرازەکانی گەیشتن بە ماددە سوود لێوەرگیراوەکان لە پەرەسەندنی تەکنیکی فراوان لە گۆڕەپانەکانی گەیاندندا، کە دەکرێ میدیا ببێتە بەشێك لە چالاکییە ئابوورییەکان. دەزگا میدیا ئەمەریکییە بەهێزەکان دەستیان کرد بە پێکهێنانی کۆمپانیاگەلی فرە رەگەز و کڕینی چالاکی و دەزگا میدیاییەکان لە ولاتانیتر. لەگەل ئەمەشدا هاوپەیمانێتی ستراتیژی لەگەل لایەنە لۆکالییە بەهێزەکان بەسترا، کە بە پلەیەکی زۆر سوود لە دەستڕۆیشتوویی سیاسییانەی ئەمەریکا لە جیهان دەبینی.

میدیا تا پێش شۆڕشی دیجیتالی کە ئێستا لە نێو کارلێکەکانیدا دەژین، هەمیشە ئەلقەیەکی سەرەکی بووە بۆ بەستنەوەی نێوان سێ ئەلقە ئەکتیڤەکە (بڕیاری سیاسی و بەرهەمی کوولتوری -بەمانا فراوانەکەی- و رای گشتیی). بۆیە هەرچەندە رۆلی میدیا بەهێز بێ، بە یەکگەیشتنی نێوان ئەو سێ ئەلقانە بەهێزتر دەبێ و ئەگەر میدیا پەراوێز بخرێ، ئەلقەکانیتر لە بۆشاییدا پەرت و بلاو دەبن و هەماهەنگی و بەیەکگەیشتن لە نێوانیاندا نامێنێ و واتەوات و گومان بلاو دەبێتەوە و فەوزا دێتە ئاراوە. هاوکات رۆلی میدیا شێوەی سیستمی سیاسی پەیڕەوکراو دەردەخات، ئەگەر میدیا ئازاد و بەهێز بێ ئەوا مانای وایە سیستمە سیاسییەکە دیموکراتی و دروستە و ئەگەر میدیا جیاوازییەکان نەخاتەڕوو یان رێگەی پێنەدات، مانای وایە سیستمە سیاسییەکە دکتاتۆرییە، هەروەها ئەگەر میدیا پەراوێز خرابوو ئەوا سیستمە سیاسییەکە ئیستیبدادییە. میدیا و لەوەو پێش کوولتور هەمیشە هێز یان دەسەلاتێکی نەرمونیان بووە و پێش دەسەلاتی مادی دەکەوت و رێگەی بۆ خۆش دەکرد، دەسەلاتی داهاتوو دەسەلاتی ئەو دەبێ کە خاوەنی زانیاری بێو قۆرخی بکات.

ئەمەریکا یەکەم وڵاتە لە جیهاندا لە بواری میدیا و گەیاندندا، لایەنێکی کێبرکێکەری راستەقینەی دیکەی نییە لەم بوارەدا. تێکەڵبوونی میدیا لەگەڵ ئامێرەکانی گەیاندندا وایکردووە لە ئەمەریکا بە بەردەوامی هەژموونی میدیای خۆی بالادەست بکات، بەتایبەتی ئەگەر تەماشای ئەو شێوازە بکەین کە لە میدیادا بەکاردەهێنرێ کە پشت دەبەستێ بە پیشاندانی هێماو وێنە و جوڵە و خەیاڵ بۆ گەیاندنی پەیامە میدیاییەکە. ئەوەی تێبینی دەکرێ فراوانبوونی میدیایە (بەتایبەتی ئەمەریکی) بە شێوەی ئاسۆیی و شاوولی، ئەمەریکا لە بواری میدیادا سوودی لە هاوپەیمانێتییە ناوخۆییەکان (لە ناوچە بەهێزەکان) و کۆنترۆڵ و قۆرخکردن (لە وڵاتە لاوازەکان) بینیوە، هەروەها کۆمپانیا میدیایە رۆژئاوایی و ئەمەریکییەکان رۆژ لە دوای رۆژ زیاتر بایەخ بە جیهانگیری دەدەن. هەردوو دیاردەی جیهانگیریەتی و میدیا پێکەوە بەستراون و ناکرێ لێك جیا بکرێنەوە بەتایبەتی لەم سەردەمەدا کە هەنگاوێکی گەورە نراوە و بازنەی جیهانگیری لەلایەك و ئامرازەکانی میدیاش لەلایەکیترەوە فراوان بووە.

**جگە لە گرنگی و کاریگەری لە سیستمەکانی میدیا نیشتیمانییەکان لە وڵاتانی جیهاندا، تێبینی گرنگیش هەیە لەم بوارەدا و پێویستە رەچاو بکرێن، لەوانە:**

١- جیهانگیریەتی چالاکی میدیایی هێشتا وەك ئەو دارشتنە بەدی نەهاتووە کە لەوانەیە لای زۆرکەس جێگیر بووبێ، ئەوەی وەدی هاتووە جیهانگیری پەیامی میدیاییە بە هۆی رووخانی بەربەستەکان، ئەمەش دیاردەیەکی تەکنیکییە وەك لەوەی سیاسی یان کوولتوری بێ، وێرای کاریگەرییە سیاسی و کوولتورییەکەی.

٢- ئاستەکانی وەدەنگهاتنی سیستمە میدیاییە نیشتیمانییەکان بۆ ئەو گۆڕانکاریانەی کە جیهانگیریەتی پیشەسازی میدیا دەیسەپێنێ زۆر لێك دوورە، ئەمەش بە تەواوی رەتی دەکاتەوە کە لە کاتی ئێستادا جیهانگیری خەسڵەتێکی سەرەکی چالاکییەکانی ئامرازەکانی میدیا بێ لە ناوچە جیاوازەکانی جیهان.

٣- جیهانگیریەتی چالاکی میدیا کە ئێستا هەیە، دیاردەیەکی نوێ نییە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ دوو دەیەی دوایی لە سەدەی پێشوو، بەڵام دەربڕی پەرەسەندنێکی مێژووییە کە ریشەکەی بۆ سەدەی نۆزدە دەگەڕێتەوە، هەرچەندە هەنگاوەکانی لە چارەکی دوایی سەدەی بیستەمدا خێراتر هاوێشت.



چالاکییە جۆراوجۆرەکان لە ساڵانی هەشتاو نەوەدەکانی سەدەی رابردوو دوو رۆڵی گرنگی ئاشکرا کرد، کە ئامرازەکانی میدیا لە بواری ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتیدا دەیانگێڕا، ئەوانیش:

أ- رۆڵی ئابووری: جیهانگیریەتی میدیا بووە هەڵگری بەهایەکی ئابووری گەورە و گەشەکردوو، بەتایبەتی لەسایەی ئابووری زانیارییەکاندا، کە بووە خەسڵەتێکی سەرەکی ئابووری جیهانی و وەبەرهێنانەکانی پیشەسازی زانیارییەکان لە ساڵی ١٩٩٥ گەیشتە دوو تریلیۆن دۆلار. لە ساڵی ٢٠٠٠ ساڵانە گەیشتە سێ تریلیۆن دۆلار. لە کاتێکدا ئەو وەبەرهێنانە لە ساڵی ١٩٨٠ لە ٣٥٠ ملیار دۆلار تێپەڕی نەدەکرد.

ب- رۆڵی ئایدۆلۆژی: ژینگەیەکی زانیاری و ئایدۆلۆژی دەستەبەر دەکات بۆ پشتگیریکردنی بنەما سیاسیو ئابووری و مەعنەوییەکان بۆ بازاڕگەرمی کالاکان و خزمەتگوزارییەکان و گەشەپێدانی سیستمی کۆمەڵایەتی لەسەر بنەمای وەدەستهێنانی قازانج لە میانەی کوولتورە نیشتیمانییە جیاوازەکان.

لێکۆڵینەوەی جیهانگیری لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا خۆی لە جەختکردنەوە لەسەر دوو دیاردەی سەرەکی دەبینێتەوە، کە ئامرازەکانی میدیا بەتایبەتی تەلەفزیۆن شوێنێکی دیاری دەبێ تیایاندا:

١- ئەو ئامرازانەی کە کۆمپانیا فرەرەگەزەکان، جیهانگیریەتی سەرمایە و بەرهەمهێنانیان فەراهەم کردووە.

٢- ئەو کوولتورە جیهانییەی کە لە ئاکامی شێوازێکی کۆمپانیا فرە رەگەزەکان بەرهەم هاتووە و خاوەن و دەسەڵاتداری لەسەر ئامرازە میدیا جەماوەرییەکان دەکات، ئەمەش بۆتە مایەی سەرهەڵدانی شێوازێك لەو کوولتور و ئایدۆلۆژیانەی کە ئاراستەی بەکاربردنانەی هەیە.

پەیوەندییەکی توندوتۆڵ هەیە، کە جیهانگیریەتی چالاکییە میدیاییەکانی بەستۆتەوە بە دەرکردەی سەرمایەی بازرگانی لەمیانەی گەشەسەندنە مێژووییەکەیان، ئەم پەیوەندییەش کۆنترۆڵی پەرەسەندنەکانی ئێستاو داهاتووی کردووە لە پیشەسازی میدیا، بێ ئەوەی دەستێوەردانی هۆکارگەلیتر رەت بکاتەوە. چەند هۆکارێکیش هەن پاڵپشتی ئەم گریمانەیە دەکەن لەوانە:

١- هاوكاتیی له نێوان سەرهەڵدانی چالاكییه میـدیاییی لـە دەرەوەی بـازاڕە نیـشتیمانییە سەرمایەدارەكان و دەركردەی سەرمایەداری پیـشەسازی و پەلهاوێـشتنی بازرگـانی لـە بـازاڕە دەرەكییەكاندا.

٢- ئەو جیاوازییەی كە هەیە لـە جیهانگیریـەتی چـالاكییە میدیاییـەكان لەسـەر ئاسـتی جیهانی و ئەوەی لە سیستمە میدیاییە نیشتیمانییە رۆژئاواییەكان رەنگدەداتەوە.

٣- زۆرترین رێژەی چالاكییە میدیاییە نێودەوڵەتییەكان ملكەچی ژمارەیەك لـە كۆمپانیـا مەزنـە جیهانییـەكانن و گەشـەی كۆمپانیـا میدیاییـە جیهانییـەكان بـەپێی گەشـەی ئـەو كۆمپانیانەیە.

٤- یـەكبوونی دابەشـكردنی جـوگرافی لـەو ئاسـتەی كـە لـە جیهانگیریـەتی چـالاكییە میدیاییـەكان وەدیهـاتووە لەگـەڵ دابەشـكردنی وەبەرهێنانـە بازرگـانی و پیـشەسازییەكانی كۆمپانیا جیهانییە فرە رەگەزەكان، ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی هەردووكیان یەك راستی بن.

٥- جیاوازی لە كاریگەری چالاكی میدیایی لەمیانەی ئامرازە جۆراوجۆرەكانی میـدیا بـۆ نموونە پیشەسازی تەلەفزیۆن زیاترین كاریگەرە بە سیاسەتەكانی جیهانگیری.

مۆركی مێژوویی دیاردەی جیهانگیری خەسڵەتی بەردەوامێتییەكەی لێ دادەمـالێ، بـەوەی قۆناغێكی مێژوویییە پەیوەستە بە هێـزە پاڵپـشتییەكانی، ئەمـەش بـوار لـە بـەردەم هۆكـارە نیشتیمانییە سیاسی یان ئابووری یاخود كوولتوورییەكان والا دەكات، تاكو مامەڵە لەگـەڵ ئـەم دیاردەیەدا بكەن، ئەمەش واتا لەلایەكیترەوە، جیهانگیریەتی چـالاكی میـدیایی نـامێنێ یـان گـۆڕانی بەسـەردا دێ ئەگـەر جیهـانبینی بازرگـانی جیهـان بگـۆڕێ و تـەواوكاری ئـابووری نیشتیمانی رۆڵی خۆی دەبینێ لە هەمواركردنی چالاكییە میدیاییەكان بۆ بەرژەوەنـدی گـەلان، بەپێچەوانەی ئەوەی كە كۆمپانیا جیهانییە فرەرەگەزەكان دەیانەوێ.

هێزی بازاڕ بۆتە ئـامرازی جیهـانی بنـەڕەتی بـۆ رێكخـستنی چـالاكییە گەیاندنییـەكان، پرەنسیپ و بەها پێكەوە نەبەستراوەكان بە هێزەكانی بـازاڕەوە رۆڵـی پێـچەوانە دەبێتـەوە لـە رێكخستنی پیشەسازی گەیاندندا. سەرەڕای گرنگی ئەم راستییە لە رێكخستنی پەیوەنـدی لـە نێوان بازاڕی جیهانی و جیهانگیریەتی میدیا، ئەوا ئیعتیبارە جیۆپۆلیتكییەكان كاریگەرییەكی راستەقینە دەكەنە سەر رێكخستنی ئەم پەیوەندییە. ئەم پەیوەندییە بە یەك ئاسـت لـە ناوچـە جیاجیاكانی جیهاندا كار ناكات، كە كاریگەرە بە ئیعتیبارە جیۆپۆلیتیكەكان و پاشماوەیان لـە قۆناغە جیاوازەكاندا. لەبەر گرنگی ئەم راستییە، ستراتیژییەتی نوێی كۆمپانیـا جیهانییـەكان



بریتییە لەوەی كەرتە دیاریكراوەكان لە دانیشتوان بچنە نێو بـازاڕە نیـشتیمانییەكان، گەیـشتن بەو كەرتانە وەك دیارە بەرپرسیارێتی راستەقینەی ئامرازەكانی میدیای جیهانی بێ.

توێژینەوەكانی میدیای پەیوەست بـە پرسـەكانی جهانگیریـەتی پـۆلێن دەكـرێن بـۆ دوو باهۆزی بنەڕەتی، باهۆزێك هەوڵدەدات چـاودێری ئـەو گۆڕانكاریانـە بكـات كـە چـالاكییە ئامانجدارەكان بۆ جیهانگیریەتی پیشەسازی میدیا و كاریگەرییەكانی. هەروەها بـاهۆزێكیتر هەوڵدەدات چاودێری كاریگەرییەكانی تەكنیكی نوێ بێ لەسەر پیشەسازی میدیا. سەرەڕای بایەخی توێژینەوەكانی میدیا لە چـاودێریكردنی ئـەو هەنگاوانـەی كـە پیـشەسازی میـدیا ناویەتی لە پێناو وەدیهێنانی بازاڕێكی جیهانی بۆ چـالاكییە میـدیا جۆراوجۆرەكـان، بـەلام دەكـرێ چـاودێری زۆر لـە لێكۆڵینـەوەكانی سـالانی نـەوەدەكان بكـەین، كـە بـاهۆزێكی بەرهەڵستكاری دەنواند دژ بە دیاردەی جیهانگیریەتی چـالاكییەكانی میـدیا و دەكـرێ ئـەم لێكۆڵینەوانە بۆ دوو ئاراستە دابەش بكرێ:

- ئاراستەیەكە كـە زۆر لـە خۆپـارێزی لەسـەر جیهانگیریـەتی چـالاكییە میدیاییـەكان دەنوێنێ كە لە رێگەیەوە بەرژەوەندییە نیشتیمانییەكان فەرامۆش دەكرێن و ئـابووری چـینە مامناوەندەكانی كۆمەڵگە هیلاك دەكرێ و توانای كۆمەڵگە لۆكاڵییەكان لە رووی داهێنان و خولقاندن لاواز دەكرێ، لەسایەی بەرهەمهاتووە كوولتوورییـە ئامادەكراوەكـان كـە ئـامرازی میـدیا پێـشكەشی جـەماوەری دەكـات، بـەلام كاریگـەری ئـەم ئاراسـتەیە لاوازە لـە رووبەڕووبوونەوەی هێزە جیهانگیرییەكان و ئەوەی رۆژ لە دوای رۆژ بە شێوەیەكی بەرجەسـتە وەدەستی دێنێ.

- ئاراستەیەكە دان بە بوونی جیهانگیریەتی چالاكییە میدیایەكاندا دەنێ، كە بە پاڵنەری قازانجی مادی پاڵ دەنرێن، ئەمەش بەهێزترین ئاراستە بەرهەڵستكارەكانە بۆ جیهانگیریـەتی چالاكییە میدیاییەكان، جـا چ لـە بـواری توێژینـەوەكان بـێ یـان جموجوڵـە كۆمەڵایەتییـە كردەییەكاندا بێ.

## دەزگا و ئامرازەکانی جیهانگیریی میدیا:

جیهانگیریەتی دەزگا و ئامرازی خۆی هەیە کە لە پرۆسەی پەیڕەوکردندا پشتی پێ دەبەستێ، ئەو دەزگا و ئامرازانە بریتین لەمانەی خوارەوە:

**١- کۆمپانیا فرەرەگەزەکان:**

چالاکی ئەم کۆمپانیانە و شێوەی ئیشکردنیان بە یەکێك لە روالّەتەکانی جهانگیریەتی دادەنرێ، ئەم کۆمپانیایانە وەك دەزگایەك بەگرنگترین هێزی بەجیهانیکردن و ئامرازە کاریگەرییەکانی لە قەلّەمدەدرێ، کە خاوەن قەبارەیەکی زل و هەمەجۆری چالاکی و بەربلاّوی جوگرافییە لەسەرتاسەری جیهاندا، سەرەڕای توانای دابینکردنی پێویستییە جیهانییەکان و پێدانی قەرز و کۆکردنەوەی پسپۆری و شارەزاییە ئاستبەرزەکانی مرۆڤایەتی، ئەم کۆمپانیانە لە هەولّی بەجیهانیکردنی ئابووریدان، کە دەیانەوێ بازاڕی جیهان هەمووی بکەن بە یەك بازاڕ کە لەژێر رکێف و چالاکی ئەواندا بێ، ئێستا لە جیهاندا نزیکەی ٤٠ هەزار کۆمپانیای فرەرەگەز هەیە، کە دەرامەتیان لە نیوەی بەرهەمی گشتی جیهانی زیاترە، بەلاّم کۆمپانیا گەورە بالاّدەستەکان تەنها ٥٠٠ کۆمپانیا دەبن کە ٤٧٢ کۆمپانیایان دەکەونە بەشی باکووری گۆی زەوی و ٢٨ کۆمپانیاش لە بەشی باشووریدا، کە دەرامەتیان لە سالّی ١٩٩٦ دا گەیشتە ١١٤٣٥ تریلیۆن دۆلار، واتە دەرامەتی ئەم ٥٠٠ کۆمپانیایە یەکسانە بە ٤١٪ ی بەرهەمی ناوخۆی جیهانی و ٦٤٪ ی بەرهەمی گشتی ئەمەریکی.

ئەم هێزەی بەجیهانیکردنە رۆلّی دەولّەتی لە چالاکی ئابووریدا لاواز کردووە، کۆمپانیا فرە رەگەزەکان بەرە بەرە خەریکی جێگرتنەوەی دەولّەتن، وایان لێهاتووە پێویستیان بە هەندێ خزمەتگوزاری دەولّەت نییە، خاوەنی سیستمی ئاسایش و کۆمپانیای پۆستەی خۆیانن، سەرەڕای ئەوەی پارەی تایبەتی خۆیان لە چاپ دەدەن لەسەر شێوەی کارتی دلّنیایی کە لە ژێر چاودێری حکوومەتدا نییە، زیاد لەمەش دەستیان گرتووە بەسەر دەزگا و خزمەتگوزارییە گشتییەکاندا، تا ئەو رادەی کە گۆڕستانیشیان بەجیهانیی کردووە، بۆ نموونە لە کۆمپانیای خزمەتگوزاری ئەمەریکی (sci) بازاڕەکانی ئەمەریکا و ئەورووپا و ئەمەریکای لاتینی زۆر بەخێرایی گرتۆتەوە و کۆنترۆلّی زۆربەی کۆمپانیاکانی مردووناشتنی لە ٢٠ ولاّتی جیهاندا کردووە.

جیهانگیری بارودۆخێکی وەها دێنێتە ئاراوە کە رامیاری تیایدا بێ دەسەلاّت دەبێ و دەولّەتی دیموکراتیش شەرعییەتی خۆی لەدەستدەدا بە هۆی کەوتنە ژێر رکێفی ئابوورییەوە، بۆ



نموونە، گوێڕایەلّ بوون بۆ بۆڕسەکان دەبێتە هۆی زەوتکردنی دیموکراتییەت لە ئەنجامدا جیهانگیری دەبێتە تەلّە بۆ دیموکراتییەت، چونکە تێڕوانینی خەلّك بۆ شتەکان بەگوێرەی پرۆژەی جیهانگیری دەبێ و دەسەلاّتی ئابووری سەرتاپای سیاسەت بەڕێوە دەبات لەگەلّ لەبەرچاونەگرتنی ئەو رەهەندە کۆمەلاّیەتی و سیاسییانەی کە بەدوای خۆیدا دەیهێنێ، لە سالاّنی نەوەدەکانی سەدەی رابردوودا ١٧ کۆمپانیای میدیایی گەورە نیوەی داهاتی هەموو هۆیەکانی میدیای دەستدەکەوت لە کاسێت و کێبلّ و ڤیدیۆ کاسێتیشی لەگەلّدابێ، ئەمەش وایکرد ژمارەی کۆمپانیاکان لە ٤٦ کۆمپانیاوە لە سالّی ١٩٨١ دوای دە سالّ ببێتە ٢٣ کۆمپانیا، ئامانجی ئەم کۆمپانیایانە کۆنترۆلّکردنی هەموو هەنگاوێکی دروستکردنی وێنەیە هەر لە سەرچاوەوە تا دەگاتە دەستی کڕیار، ئەم یەکگرتنە شاولّییەی هۆیەکانی میدیا تاڕادەیەك دیاردەیەکی نوێیە، زۆربەی رۆژنامە و گۆڤارەکان لە کۆتایی جەنگی جیهانی دووەمەوە تا سالاّنی حەفتا سەربەخۆ بوون، لەوکاتەوە بەرەبەرە کەرتەکان دەستیان کرد بە یەکگرتن و ئیمپراتۆرییەتی رۆژنامەکان و پەرتووکە کۆکراوەکان و ستۆدیۆی سینەما یەکگرتووەکانی هێنایە ئاراوە، بەلاّم لە سەرەتای هەشتاکاندا گەورەترین پرۆسەی یەکگرتن دەستیپێکرد ئەویش بە یەکگرتن و فرۆشتنی سەدەها هۆی میدیا، لەگەلّ نزیکبوونەوەی سالاّنی نەوەدەکاندا کۆمپانیا گەورەکانی ئەمەریکا توانییان دەها کۆمپانیایتر قووت بدەنو نابووت بکەن، بەمشێوەیە رێگەیان بۆ خۆیان خۆشکرد ببنە کۆمپانیای هەزار سالّەی ئاییندە، رۆلّی بالاّدەستی خۆیان ببینن لە بواری فرۆشتن و رابواردندا.

لە جیهاندا ٢٤ کۆمپانیا هەن کە کۆنترۆڵی کەرتی گەیاندن و زانیاری و رابواردنیان کردووە، لە ناو ئەمانەدا پێنج کۆمپانیای گەورە کۆنترۆڵی ٨٠٪ هەوالّەکانیان لە جیهاندا کردووە کە بریتین لە (روێتەرز، ئەسۆشێتد پرێس، یونایتد پرێس، ئاژانسی هەوالّی فەرەنسی و ئاتارتاسی رووسی)، کە هەموو رۆژێك نزیکەی ٣٢ ملیۆن وشە پەخش دەکەن، سەرەڕای وێنەو مادەی تەلەفزیۆنی وێنەگیراو. بەمشێوەیە دەبینین سەرچاوەکانی پەخشکردنی هەوالّ و میدیا لە نێوان ولاّتانی جیهاندا بە شێوەیەکی ستوونی نەك ئاسۆیی گەشە دەکەن، ئەمەش پەخشکردنێکی یەك ئاراستەیە کە بیرو بۆچوونی بەهێز و بالاّدەست دەنوێنێ، کۆمپانیا ئەمەریکییە فرەرەگەزەکان لە بواری میدیادا کۆنترۆڵی دەزگا تەلەفزیۆنییە تایبەتییەکان دەکەن لە بیست ولاّت لە ئەمریکا و باکووری لاتینیدا، هەروەها لەگەلّ کۆمپانیا ناوخۆییەکان لە کۆی ٧٠٧ ئێزگەدا، لە خاوەنداریەتی ٥٦٥ ئێزگەی رادیۆییدا بەشداری دەکەن کە لەلایەن ١٣

دەزگاوە لە مەکسیك بەڕێوە دەبرێن، تەنها کۆمپانیایەکیش کۆنترۆڵی چوار کەناڵی کردووە لە کۆی شەش کەناڵی تەلەفزیۆنی لە شاری (مەکسیکۆسیتی). لە کۆلۆمبیا چوار دەزگای ئەمەریکی خاوەنی ٢٣١ ئێزگەی رادیۆیین لە کۆی ٣٨٦ ئێزگەدا، بەڵام تەلەفزیۆنەکانیان لە ژێر کۆنترۆڵی سێ دەزگای ئەمەریکیدان.

مەترسی قۆرخکردنی میدیا لەلایەن کۆمپانیا فرەرەگەزەکانەوە لە هەوڵی بەزاندنی دەسەڵاتی زانیاری- دارایی بۆ سنوورە نەتەوەییەکاندا دەردەکەوێ، کە دیاردەی کوولتووری نەتەوە- تێپەڕی لێدەکەوێتەوە، ئەمەش کردارێکی بنەڕەتییە کە تاڕادەیەك و لە زۆر بواردا گۆڕانکاری لە میللەتاندا دروستدەکات بە شێوازێکی ئەلیکترۆنی نەك بەگفتوگۆی جوگرافی یان کوولتووری نیشتیمانی و نەتەوەیی، زۆر لە توێژەران ئەم دیاردەیە لە ناوەڕۆکدا بە (ئەمەریکیکردن) لەقەڵەم دەدەن، بەهۆی باڵادەستی راشکاوانەی ئەمەریکا لەم بوارەدا، ئەم کۆنترۆڵکردنە بەرفراوانەی کۆمپانیا فرەرەگەزەکان لە بواری گەیاندندا و بەگوێرەی نموونەی (جۆهان گالتونج) کە لەم دیاردەیەی کۆڵیوەتەوە بۆتە هۆی دابەشکردنی جیهان بۆ دوو بەشی نایەکسان، کە ئەوانیش: (ناوەند)ی باڵادەست کە بریتییە لە وڵاتە پیشەسازییە پێشکەوتووەکان و (پەراوێز)ی دواکەوتوو کە رۆڵی شوێنکەوتوو دەبینێ لەم نموونەیەدا کە میدیای نێودەوڵەتی بە شێوەیەکی شاوڵی کاری تێدەکات، لەسەرەوە وڵاتە پیشەسازییە پێشکەوتووەکان و لەژێرەوە وڵاتە تازە گەشەسەندوو دواکەتووەکان.

ئەمەش لە ئاکامی کۆنترۆڵکردنی وڵاتە پیشەسازییە پێشکەوتووەکان بۆ ئامرازە نوێیەکانی گەیاندنەوە هاتۆتە ئاراوە، سەرەڕای کۆنترۆڵکردنی سەرچاوەکانی هەواڵ کە لە بەرژەوەندی خۆیاندا بەکاری دێنن بەبێ رەچاوکردنی بەرژەوەندی نیشتیمانی وڵاتە تازە گەشەسەندووەکان کە لە رووی ئابووری و تەکنیکی و زانستیدا دواکەوتوون و ناتوانن کێشەکانیان چارەسەر بکەن، لێرەدا تێبینییەکی گرنگ لە بارەی وڵاتانی ناوەندەوە هەیە، چینێکە ١٪ی کۆنترۆڵی دارایی و میدیا و یاسادانان و بەکارهێنانی سیاسەتمەدارانیان کردووە و دەسەڵاتیان بەسەر جیهاندا هەیە، بە هۆی کۆنترۆڵکردنی هەر سێ فاکتەری دارایی، میدیا و بەکارهێنان، ئەم چینە بە هۆی چەند کۆمپانیایەکی فرەرەگەز توانیویەتی کۆنترۆڵی جیهان بکات، کە بڕی فرۆشتنی لە ساڵی ١٩٩١ دا گەیشتە ٥،٢ تریلیۆن دۆلار، لە کاتێکدا ئاڵوگۆڕکردنی بۆ دراوە بیانییەکان لە سەرەتای نەوەدەکاندا گەیشتە زیاتر لە ١،٣ تریلیۆن دۆلار رۆژانە، ئەمەش دوو هێندەی ئاڵوگۆڕکردنی رۆژانەی ساڵی ١٩٨٩ یە، سەرەڕای زۆریی ئەم بڕە ئەوا ئاڵوگۆڕکردنی دارایی لە جیهاندا بە



زۆریی لەلایەن کۆمەڵێکی کەمەوەئەنجام دەدرێ کە بریتین لە نزیکەی (٣٠-٥٠) بانکی جیهانی، لە کاتێکدا چینی ١٪ی کۆنترۆڵی میدیا و زانیاری جیهانیان کردووە.

کاتێك (بین باگیدیکیان) راگری فەخری کۆلیژی رۆژنامەگەری لە زانکۆی کالیفۆرنیا چاپی یەکەمی لە پەرتووکی (دەستبەسەراگرتنی میدیا)ی لە ساڵی ١٩٨٣ دا نووسی، پەنجا کۆمپانیا خاوەنداریێتی کۆمپانیاکانی میدیایان دەکرد و خاوەن دەسەڵات بوون. کاتێك ناوبراو لە ساڵی ١٩٩٧ دا چاپی پێنجەمی لە هەمان پەرتووك بڵاوکردەوە، ژمارەی ئەو کۆمپانیا ئەمەریکییانە گەیشتە دە کۆمپانیا. بە هۆی هەبوونی سەرمایە و سامان و میدیا و باڵادەستی تیایدا ئەوا (٣٠-٥٠) بانك و (١٠-٥٠) کۆمپانیای میدیا کۆنترۆڵی جیهان دەکەن و سیاسەتمەدار و حکوومەتەکان لاواز دەکەن و لە ناو دەبەن. ئەوەی لە ساڵانی نەوەدەکاندا لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا روویدا بەڵگەن لەسەر مەترسی یەکگرتنی سەرمایە و میدیا، کە جۆرە سەرمایەدارییەکی زانیاری- دارایی هێناوەتە ئاراوە و پشتی بەستووە بە یەکگرتنی دارایی لەگەڵ زانیاری و میدیادا، ئەمەش لە هەمان سەرمایەداری ئەنگلۆئەمەریکییە کە بانگەشەی سیستمی نوێی جیهانی بۆ دەکەن وەك ئایینێکی نوێ لە رامیاری نێودەوڵەتیدا، بەمەش سیستمی زانیاری — دارایی رۆڵی مێژوویی سەرمایە دەگۆڕێ لە خزمەتکاری ئابووری بۆ بوون بەبار بەسەر ئابوورییەوە. ئەم سیستەمە سەرتاپای کۆمەڵگە و میللەتان بەکاردێنێ لە پێناو گەشەسەندنی ئابووریدا لە جیاتی ئەوەی گەشەسەندنی ئابووری وەك خزمەتکار بەکاربێنێ بۆ میللەتان، وەسفەکەی (برێجنسکی) راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی ئەمەریکی پێشوو لە بارەی ئەو کۆمەڵگەیانەی کە ناوزەدیان دەکات بە (کۆمەڵگەی تەکنۆترۆنی) لەوانەیە راست بێ، واتە ئەو کۆمەڵگەیەی کە لە رووی کوولتووری و دەروونی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە لەلایەن تەکنۆلۆژیا و زانیاری و داهێنراوە ئەلکترۆنییەکانەوە دادەڕێژرێ و دروستدەکرێ، بە تایبەتی لەلایەن بوارەکانی کۆمپیوتەرو میدیاوە، بۆیە جێی سەرسوڕمان نییە کە ریکلامێکی کۆمپانیای (سنگەر) ی فرەرەگەز خۆی بەمشێوەیە وەسفبکات (بەهێمنانە ئیش دەکەن بۆ ئەوەی دەست بەسەر جیهاندا بگرن)، بە هۆی ئەو رۆڵە گرنگ و کاریگەرەی ئەم کۆمپانیانە لە پڕۆسەی جیهانگیرێتیدا دەیگێڕن لە رێگەی بڵاوبوونەوەی راستەوخۆیانەوە لەسەرتاسەری جیهاندا و داڕشتنەوەی پرۆسەی نوێی بەرهەمهێنان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا، لەوەش گرنگتر هەوڵدان بۆ بڵاوکردنەوەی شێوازی بەکاربردن و خەرجکردنێکی نوێ و داڕشتنی

کوولتورێکی خەرجکردنی یەکگرتوو لەسەر ئاستی جیهان، بە هۆی بالادەستی لە بوارەکانی ڕێکلام و گەیاندن و میدیادا.

٢- ڕێکخراو و دەزگا نێودەوڵەتییەکان:

ئەم ریکخراو و دەزگایانە لەسیستمی جیهانگیرێتیدا بە بنەمایەکی سەرەکی دادەنرێن، بە هۆی شێوازی ئیشکردنیان و ئەو یاسایانەی کە لەسەری دامەزراون، (سندوقی دراوی نێودەوڵەتی) و (بانکی نێودەوڵەتی بۆ بنیاتنان و ئاوەدانکردنەوە) و (ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی) و ( ڕێکخراوی هاریکاری و گەشەپێدانی ئابووری) و کۆبوونەوەکانی حەوت وڵاتە گەورەکەی جیهان و زۆر دەزگای ناحکوومی دیکەی وەك دیداری داڤۆس و یانەی ڕۆما و... هیتر، ڕۆڵی خۆیان دەبینن لە دروستکردنی جیهانگیریەتی ئابووریدا، ئەمانە هەموویان یارمەتی کۆمپانیا فرەرەگەزەکان دەدەن بۆ جێبەجێکردنی جیهانگیریەتی بە شێوەیەکی پراکتیکی، بە هۆی بەرنامەکانی سندوقی دراوی نێودەوڵەتی و مەرجەکانی بانکی نێودەوڵەتی و بەندەکانی ڕێککەوتننامەی گات، کە سەرقاڵی ڕێکخستنی بازرگانی جیهانین لە بەرژەوەندی ئەم بانك و کۆمپانیایانەدا.

سەرەڕای سەرپەرشتیکردنی جێبەجێکردنی سیاسەتە بازرگانییە نیشتیمانییەکان، بەمشێوەیە پێشێلی مافە بنەڕەتییەکانی میللەتانی جیهان دەکەن، بەتایبەتی لە بوارەکانی وەبەرهێنانی بیانی و هەمەچەشنی بایۆلۆژی و خاوەندارێتی فیکری تاکەکەسدا، بەواتایەکی دی دابەشکردنێکی سێ گۆشەیی نوێیە بۆ دەسەلات، کە لەسەر هاریکارییەکی پتەو لە نێوان سندوقی دراوی نێودەوڵەتی و بانکی نێودەوڵەتی و ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی بەندە لە سەرپەرشتیکردنیان لەسەر سیاسەتە ئابوورییەکانی وڵاتە تازە گەشەسەندووەکان و لە سایەی سیستمی بازرگانی تازەوە و دامەزراندنی ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی لە ساڵی ١٩٩٤ شێوەی پەیوەندی لە نێوان ئەو دەزگایانەی کە لە ئەمەریکادان و حکوومەتە نیشتیمانییەکان گۆڕدران. جێبەجێکردنی ڕێنماییە سیاسییەکانی سندوقی دراوی نێودەوڵەتی و بانکی نێودەوڵەتی تەنها بریتی نییە لە ڕێککەوتنی نێوان دوو وڵات، بەڵکو زۆر لە بەندەکانی داوای گۆڕانکاری لە سیستمی وڵاتان دەکات وەك ئازادکردنی بازرگانی و گۆڕینی سیستمی وەبەرهێنانی بیانی، ئەمانەش بە شێوەیەکی هەمیشەیەی لە بەندەکانی ڕێککەوتنامەی ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی چەسپاون و بوونەتە بەشێکی یاسایی.



**مەترسی ئەم ڕێکخراو و دەزگایانە لە چەسپاندنی سیستمی جیهانگیرێتیدا:**

١- هەوڵدەدات چەمکێکی ئایدۆلۆژی لیبراڵی (سەرمایەداری لیبراڵی) بلاو بکاتەوە، بە گرتنەبەری ئەو شێوازە سیستمی دراوی نێودەوڵەتی و سیاسەتە دارایی و ئابووری و بازرگانییانەی کە لە بەرژەوەندیدان.

٢- دەسەلاتێکی نێودەوڵەتییە بۆ ڕاوێژکردن و هەماهەنگی لە نێوان حەوت وڵاتە گەورەکەی جیهان.

٣- بریتییە لە دەسەلاتێکی مەعنەوی کە باکوور بەسەر باشوور و دەوڵەمەندان بەسەر هەژاراندا زاڵ دەکات.

٤- بە هۆی ئامرازەکانی کارکردنییەوە تەنها ڕۆڵی مەعنەوی و سەرپەرشتیاری نابینێ، بەڵکو دەتوانێ یاساو داواکارییەکانی خۆی بەسەر وڵاتاندا بسەپێنێ لە بواری سیاسەتە دارایی و ئابوورییەکاندا.

٥- ئەم دەزگایانە سەرەڕای بانگەشەی بۆ ئایدۆلۆژیەتی بازرگانی ئازاد، پەیڕەوکردنی سیاسەتەکانی بریتییە لە پەیڕەوکردنی پاراستنی بازاڕەکانیان کە مۆنۆپۆڵە نێودەوڵەتییەکان بەتایبەتی کۆمپانیا فرە رەگەزەکان تیایاندا بالادەستن.

هەرچەندە سەردەمێکە میللەتانی جیهان بەدەست سیاسەتەکانی سندوقی دراوی نێودەوڵەتی و بانکی نێودەوڵەتییەوە دەناڵێنن، بەلام ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی مەترسیدارترە، بە هۆی ئەو یاسایانەی هەیەتی لە بواری مامەڵە نێودەوڵەتییەکان بە شتومەك و خزمەتگوزاری و سەرمایەوە، بەدەگمەن دەبینی دەوڵەتێك هەرچەند گەورەبێ و خاوەن ئابوورییەکی بەهێز بێ بەبێ زیان لە دەستی ئەم ڕێکخراوە دەربچێ. ئەرکی سەرەکی ئەم ڕێکخراوە بریتییە لە سەرپەرشتی و چاودێریکردنی پرۆسەی ئازادکردنی بازاڕ و سیستمە دارایی و بازرگانییەکان، ئەم سێ دەزگایە وەك ئامێرێك لەلایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە بەکاردێ دوای ئەوەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان کەوتە ژێر هەژموونی ئەم وڵاتەوە، لەوانەیە هەرەسهێنانی ئابووری لە باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا نموونەی بەرچاوی ئەو هەژموونە بێ. قسەکەی (جیسی جاکسۆن) سەرکردەی ڕەشپێستی ئەمریکی لەمبارەوە بەکورتی ئەم سیناریۆیە دەخاتەڕوو کە دەڵێ "ئێستا گوللە ناتەقێنن و سێدارە دانامەزرێنن، بەڵکو سەندوقی دراوی نێودەوڵەتی بەکاردێنن".

جیهانی ئەمڕۆ گۆڕانکاری زۆر خێرای بەخۆوە بینی بە هۆی شۆڕشی گەیاندن و بلاوبوونەوەی زانیارییەکان، لە ئاکامی پەیدابوونی کۆمپیوتەر و تۆڕە ئەلیکترۆنییەکان و سیستمە ژمارەییەکان و شتی دیکەی تەکنیك بەرزەوە کە بوار بۆ گواستنەوەی زانیارییەکان و

بەڕێوەبردنی کارو سەرمایە و سامان ئاسان دەکەن لەسەرتاسەری جیهاندا و بەخێراییەکی لەرادەبەدەر. بۆیە مرۆڤ خۆی لە بەرابەر دیاردەیەکی جیهانی نوێدا دەبینێتەوە لە سەرئاستی جیهاندا، کە بریتییە لە پەیدابوونی جیهانێکی نوێ کە بەرە بەرە دروستدەبێ و لە بوارو سیستم و پێکهاتەیدا جیاوازە لە سیستمە پێشووەکان، هەروەها جیاوازە لە میکانیزمی ئیشکردنی و سیستمی گەیاندنییەوە. لە کاتێکدا جیهانی پێشوو بە هۆی ئابووری پیشەسازی و ئامێرە قورسەکان و هۆی میکانیکییەکانی گواستنەوەوە وەك کەشتی و فڕۆکە و ئۆتۆمبیل دروستدەبوو. هەروەها یەکگرتن و لێك جیابوونەوەی بە هۆی ئەو بیروبۆچوون و باوەڕانەوە دەبوون کە لە پەرتووکەکاندا نووسرابوون، ئەوا ئەمڕۆ جیهان بە هۆی مانگە دەستکردەکان و هۆکارەکانی میدیا و سامانە هێماییەکان و دەقە هەمەجۆرەکانەوە دروستدەبێ و یەکدەگرێ کە زۆر بەخێرایی ئەم سەرو ئەوسەری زەوی دەکات.

ئەگەر وتەکەی (تۆماس گۆن) بەکاربێنین لە باری شۆڕشە زانستییەکان، ئەوا شۆڕشی گەیاندن و زانیارییەکان بریتییە لەو شۆڕشەی کە سیستمی چەمکە کۆنەکان پشتگوێ دەخات و هەنگاو دەنێ بەرەو سیستمێکی چەمکیی نوێ، هەرچەندە تائێستا ڕواڵەتی ئەم سیستمە نوێیە بە ڕوونی دەرنەکەوتووە بە هۆی گۆڕان و پێشکەوتنی هۆیەکانی گەیاندن و زانیارییەوە ئەوا شێوەی بەرهەمهێنانیش گوڕانی بەسەردا دێ لە ئەنجامدا کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دەگۆڕێ. کوولتوری ئەمڕۆ کوولتوری پەرتووك و ڕۆژنامە و ڕۆژژمێر نییە، بەڵکو زیاتر کوولتوری وێنە و زانیاری و کۆمپیوتەر و بانکەکانی زانیارییە، کەواتە بنەمای زانیاری گۆڕانی بە سەردا دێ سەرەڕای گۆڕان لە میکانیزم و هۆیەکانی بەرهەمهێنانییەوە.

**ئەو ئامرازە تێکنەلۆژییە نوێیانەی بوونەتە هۆی گەشەسەندنی جیهانگیری لە جیهاندا بێ گوێدانە جۆری نەژاد و کوولتوریان زانیاری بڵاو دەکەنەوە، بریتین لە:**

**١- پەخشی ئاسمانیی تەلەفزیۆن و رادیۆ:**

هاتنە پێشەوەی تەکنۆلۆژیای نوێ لە زۆر ڕووەوە کاری کردە سەر تەلەفزیۆن و بەرەو پێشی برد، ناردنی مانگە دەستکردەکان بۆ بۆشایی ئاسمان تەلەفیزیۆنی لە کەناڵێکی لۆکاڵەوە گۆڕی بۆ ناوەندێکی نێودەوڵەتی، ئەمڕۆ تەلەفزیۆن بەشێکە لە ژیانی زۆربەی تاکەکانی کۆمەڵگە و بە زۆر شێوەش کاری کردۆتە سەر ستایلی ژیانی مرۆڤەکان. لێکۆڵینەوەکان دەریان خستووە بە شێوەیەکی گشتی ٧٪ ی خەڵك کاتی خۆیان بە سەیرکردنی تەلەفزیۆن بەسەر دەبەن. ئەمڕۆ لە زۆربەی وڵاتانی جیهان کەناڵی تەلەفزیۆنی تایبەت بە بوارە جیاوازەکانی ژیان پەیدا بووە،



کەناڵە تەلەفزیۆنییە لۆکاڵ و سەتەلایتەکانیش خەرجییەکی زۆریان پێویستە لەهەمانکاتدا قازانجی زۆریش دەکەن، قازانجەکانیش بەزۆری لە ڕێکلام و ئاگاداری و بڵاوکردنەوەی هەواڵەکاندایە. زۆر لە توێژەران وەسفی هەردوو کەناڵی رادیۆ و تەلەفزیۆن دەکەن بەوەی شێوازێکن توانای گوێگرتن و بیستن بەهێز دەکەن، تەلەفزیۆن بۆ گێڕانەوەی توانای قسە و متمانەکردنی شێوازی میدیا دەرکەوت، تەلەفزیۆن دیسان بۆ لاوازکردنی توانای قسە دەرکەوتەوە، پێشکەوتنی هێواشی تێگەیشتنی شیکاری ژیرانە، بەرژەوەندی پچڕ پچڕی خێرا لە زانیاری جگە لە زمانی پەیبردن دەستەبەری ئامادەکاری دروستبوونی ئەندێشە وێنەیە.

گرنگترین داهێنانەکانی سەدەی رابردوو بریتییە لە پەیدابوونی تەلەفزیۆن کە دروستکردنی زۆر بەخێرایی گەشەی سەند تا گەیشتە رادەی پەخشی ئاسمانیی، دواتر پەخشی ئاسمانی دیجیتاڵی هاتە ئاراوە کە هەنگاوێکی مەزنی لە بواری پەخشکردندا هاوێشت، تەکنیکی دیجیتاڵی توانی پەخشی چاکتر و جۆراوجۆرتر بە نرخی کەمتریش پێشکەشبکات، هەروەها بواری زیاتر والآ کرد لەبەردەم زیادبوونی کەناڵە ئیزگەیی و تەلەفزیۆنییەکانداو پەیدابوونی خزمەتگوزاری جۆراوجۆر کە هەر سێ سیستمی میدیا و کۆمپیوتەر و گەیاندنی لەخۆگرتووە. بەمشێوەیە تەلەفزیۆن ئەم جیهانە گەورەیەی کردە شاشەیەکی بچووك کە بە هۆی ئامێری ڕیمۆت کۆنترۆڵەوە (کۆنترۆڵکردن لە دوورەوە) دەتوانی بەناویدا بسووڕێیتەوە، پەڵەیەك زەوی لەسەرتاسەری جیهاندا نەماوە کە مانگە دەستکردەکان پەخشی تەلەفزیۆنی بۆ نەنێرێ، بۆیە تەلەفزیۆن بە هۆی ئەو پەخشە بەرفراوانەیەوە (هێزی گەورەی سێیەمە) کە ژمارەی بینەرانی بە چەندان جار زیادیکردووە گەر بەراورد بکرێ لەگەڵ سێ ساڵ لەمەو پێش.

**گرنگترین تۆڕی تەلەفزیۆنی ئاسمانیی لە جیهاندا کە بە ئامرازێك لە ئامرازەکانی جیهانگیریەتی میدیا لەقەڵەم دەدرێ بریتین لە:**

أ- تۆڕی (CNN) ی ئەمەریکی کە لە ساڵی ١٩٨٠ لەلایەن (تیدتێرنەر) لە شاری ئەتڵەنتای ئەمەریکی دامەزراوە، لە پەخشکردنی هەواڵە ڕاستەوخۆکان بەدرێژایی شەو و ڕۆژ، بە هۆی مانگە دەستکردەکانەوە بەردەوامە، بە گەورەترین تۆڕی تەلەفزیۆنی جیهانی دادەنرێ کە تایبەتمەندە بە پەخشکردنی هەواڵەکان، ژمارەی بەشداربووانی ئەم کەناڵە گەیشتۆتە ٥٣ ملیۆن کەس لە ئەمەریکادا، لەشکرێکی بچووکی پەیامنێرانی هەیە کە ژمارەیان دەگاتە ٢٠٠٠ کەس و لە ١٢٠ وڵاتدا بڵاوبوونەتەوە، پەخشکردنی ئەم کەناڵە دەگاتە سەرتاسەری

جیهان جگە لە جەمسەری باکوور و باشوور، بە هۆی بەکارهێنانی نۆ مانگی دەستکرد کە بە دەوری خولگەی زەویدا بڵاوکراونەتەوە.

ب- تۆڕی (BBC) بەریتانی، لە ساڵی ١٩٨٦ بە هۆی مانگە دەستکردەکانەوە دەستی بە پەخشکردنی خۆی کرد، پەخشی ئەم کەناڵە زیاتر لە ٥٠ وڵات لە جیهاندا دەگرێتەوە، ئەم تۆڕە هەواڵ و زانیاری پەخش دەکات و چوار کەناڵی جۆراوجۆری هەیە، لە ساڵی ١٩٩٤ پەخشکردنی بەزمانی عەرەبی بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك رۆژانە بەردەوام بوو و لە ساڵی ١٩٩٥ بووە ٢٤ کاتژمێر، بەڵام ئەمە تەنیا ساڵێکی خایاند و بەهۆی تەنگژەی دارایی لەکار راوەستا.

ج- تۆڕی (Euro News)، بە یەکەم تۆڕی هەواڵی تەلەفزیۆنیی ئەورووپی هاوبەش دادەنرێ، لە ساڵی ١٩٩٣ دەستی بە پەخشکرد، دوای بەشداریکردنی (١٥) دەزگای تەلەفزیۆنی دەریای سپی ناوەڕاست تیایدا، ئەم کەناڵە لە شاری (لیۆن)ی فەرەنسییە و بۆ رووبەڕووبوونەوەی دەسەڵاتی میدیای ئەمەریکی دامەزراوە. سەرەڕای ئەمانەش دەیان کەناڵی ئاسمانی نێودەوڵەتی و هەرێمی دیکە هەن.

**٢- تۆڕی ئینتەرنیت:** لە بەشی ئینتەرنێتدا بە وردی باسی لێکراوە.

**٣- ئینترانێت و ئیکسترانێت:**

لەم ساڵانەی دواییدا تۆڕێکی نوێ بەکاردێ بەناوی ئینترانێت و بۆتە بڕبڕەی پشتی زۆربەی کۆمپانیاکان بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانیان لە ناوخۆیدا، مەبەست لە (ئینترانێت) ئەو تۆڕە ناوخۆییەیە کە سنووری کۆمپانیایەکی دیاریکراو نابەزێنێ و دەرناچێ بۆ دەرەوەی کۆمپانیاکە هاوکات هەموو تایبەتمەندییەکانی ئینتەرنێتی تێدایە، بەڵام هیچ پەیوەندییەکی بە کەسانی دەرەوەی کۆمپانیاکە نییە و پەیوەندییەکە تەنها لە نێوان کارمەندانی کۆمپانیاکەیە.

ئینترانێت لەسەر هەمان سیستمی ئیمەیلی ئەلیکترۆنی دامەزراوە، هەرچەندە تەنها ئیشی گەیاندنە لە نێوان کارمەندانی ئەو کۆمپانیایە، جا چ لە ناو ئەو باڵەخانەدا بن یان لە وڵاتێکی تردا. لەو ئامارانەی کە دەزگای (دێلگی) ئەمەریکی لەسەر ٦٠٠ کۆمپانیای جۆراوجۆر ئەنجامیداوە، دەرکەوتووە کە ٦٥٪ی ئەم کۆمپانیایانە بە کردەوە تۆڕی ئینترانێتیان هەیە، هەرچەندە ئەمە تۆڕێکی نوێ و خێراو رێکوپێکە لە بواری ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری لە ناو دەزگایەکدا، هەندێ خەڵك گلەییان لە سەربەخۆیی سیستمەکەی ئینترانێت هەیە کە خەڵکانی دەرەوە زانیارییان لە بارەی ناوخۆی کۆمپانیاکان نییە، لەکاتێکدا هەندێ کەسی دی



سەرکەوتنی هەر پرۆژەیەك لە پەیوەندی و گەیاندنی بەردەوامی ئەو پرۆژەیەدا دەبینن لەگەڵ کڕیارەکانیدا.

بەگوێرەی ئەو بۆچوونە، ئینترانێت پێویستە پەیوەندی لەگەڵ کەسانی دەرەوەدا هەبێ، کەسانێك کە پەیوەندیدارن بەو دەزگایە و پێویستە هەردوولا ئاگایان لە بەڕێوەچوونی ناو ئەو دەزگایە هەبێ، بەم شێوەیەش تۆڕێکی نوێ هاتە ئاراوە کە تۆڕی (ئیکسترانێت)ە، بە واتای هەبوونی پەیوەندی لە نێوان دەزگایەك لەلایەك و کڕیار و هاوبەشەکانی لەلایەکیتر، کەوابوو ئیکسترانێت ئەڵقەی پەیوەندییە لە نێوان (ئینتەرنێتی گشتی و ئینترانێتی تایبەت)دا، کە بوار دەدات بە خەڵکانی بەشدار لە دەزگایەکدا ئاگاداری کاروبارەکانی بن، بەڵام بوار بە خەڵکانیتر نادات بگەنە ئەو زانیارییانە. کەواتە ئیکسترانێت تۆڕێکی تایبەتە کە ئینتەرنێت و ئامرازەکانی گەیاندنی گشتی بەکاردێنێ بۆ ئەوەی هەندێ لە زانیاری دەزگایەك بە شێوەیەکی دڵنیایانە و نهێنی بداتە خەڵکێکی دەرەوەی ئەو دەزگایە. بەمشێوەیە دەتوانرێ فرمانی کڕینی دراوەکان و نمایشکردنی بەرهەمە تایبەتییەکان و ئامادەسازی بۆ کۆبوونەوەکان و دواترین هەواڵ پێشانبدرێ بە شێوازێك کە لەوەوپێش بواری پێ نەدرابێ، کەواتە (تۆڕی ئیکسترانێت) بۆتە ئامرازێکی خێراو ئاسان و کەمخەرج بۆ زانینی زانیارییەکان لە هەر کات و شوێنێکدا بێ، کە هۆیەکانی گەیاندن لە نێوان کۆمپانیا و خەڵکانی دەرەوەیدا هەبێ.

**٤- تەکنۆلۆژیای کێبڵ:**

بەکارهێنانی تەلەفزیۆنی کێبڵی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بووە پێویست، بۆ داپۆشینی ئەو ناوچە جوگرافیانەی کە ئاماژە تەلەفزیۆنییەکانیان پێناگات بە هۆی ئەو ئاستەنگانەی کە دێنە رێگەی هێڵی رێڕەوە راستەکەی کە ناوی لێنرا ناوچەکانی تاریکی تەلەفزیۆنی. لە ساڵی ١٩٤٨ یەکێك لە هونەرەکارانی ویلایەتی بنسلڤانیا بیری لەوە کردەوە ئەنتێنێك لەسەر لوتکەی یەکێك لە چیا نزیکەکان دابنێ بۆ وەرگرتنی پەخشی تەلەفزیۆنی لە رێگەی شەپۆلەکانی شەپەنگی لەرەلەری و راکێشانی کێبڵ لەو ئەنتێنەوە بۆ ناوچە نشینگەییەکە کە پەخشەکەی پێناگات. بەکارهێنانی سیستمی کێبڵی بووە پێویستییەك دوای ئەوەی جێبەجێکردنی تەکنیکە پێشکەوتووەکان و هانابردن بۆ شەپۆلە هێرتزییەکان زەحمەت بوو، ئەم سیستەمە خزمەتگوزاری هاوشێوەی چاودێری گشتی (Two Ways) پێشکەش بە بەشداربووانی کرد، کە پەیوەندی بە سیستمی کێبڵ دەکات لە حاڵەتی لە ناکاو و بەشداربوویەك لەسەر ئامێری تەلەفزیۆنە تایبەتییەکەی. بەمدواییە هەنگاوی گەورە نرا لەم سیستەمە بەوەی تایبەتمەندی

جیاواز لە تۆڕە کێبڵەکانی ئەمەریکا پەیدابوو بۆ ئافرەت و منداڵ و وەرزش لەسەرووییانەوە تۆڕی (Cable News Network CNN)ی هەواڵی.

ئەمڕۆش تەلەفزیۆنی کێبڵی بۆتە کارێکی بازرگانی گەورە لەمیانەی قەوارەی ڕێکلامە نیشاندراوەکان لە شاشەکانییەوە و لەوانەیە ئەمە بگەڕێتەوە بۆ ئەو بەکارهێنانە جۆراوجۆرانەی کە گەیاندنی کێبڵ وەدی دێنێ. بازدانی ڕاستەقینە لە مێژووی تەلەفزیۆنی کێبڵی لە دوای جووتبوونی لەگەڵ مانگە دەستکردەکان بە هەردوو جۆری هاوتایی ئەنەلۆگ و دیجیتاڵ بوو لە ساڵانی هەفتاکان. کۆمپانیاکانی کێبڵ بایەخی زیاتر دەدەن بەو ناوچانەی کە زۆرینەی دەوڵەمەندی لێ نیشتەجێیە، بۆ دەسکەوتنی قازانجی خێرا. لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنەلۆژی لە پیشەسازی کێبڵدا، دەکرێ پشت بە تەکنیکەکانی کێبڵەکانی ریشاڵە ڕووناکییەکان ببەستێ و بیگەیەنێتە ماڵان لەگەڵ بەستنەوەی بە خزمەتگوزاری مانگە دەستکردەکان، هەرچەندە هەندێ گومانیان لە مەودای بەردەوامی مانگە دەستکردەکان هەیە بە بەراورد لەگەڵ خزمەتگوزاری کێبڵی، بەڵام مانگە دەستکردەکان لە بواری پەخشی تەلەفزیۆنی و ئێزگەیی هەر بە دەستباڵایی دەمێنێتەوە، خزمەتگوزاریی کێبڵیش کۆنترۆڵی بواری گەیاندنەکان دەکات بە هەموو جۆرە جیاوازەکانی. (CNN) بە نموونەیەکی ڕوون دادەنرێ لە جووتبوونی تەکنەلۆژی لە نێوان کێبڵ و تەکنیکی مانگە دەستکردەکان، کە کەناڵەکە بە مانگە دەستکردەکان وەردەگیرێ پاشان جارێکیتر لەڕێی کێبڵ یان شەپۆلەکانی (VHF-UHF) بۆ بەشداربووان پەخشدەکرێتەوە.

هاوکات تەلەفزیۆنی کارلێککار بەرهەمێکی سەردەمی تەکنۆلۆژیای زانیارییە، لەم سیستمەدا هێڵی کێبڵی تەلەفزیۆنی بە ناوەندی پەخش دەبەستێتەوە، بینەرانیش دەتوانن ئەو بەرنامانە هەڵبژێرن کە دەیانەوێ ببینن، ئەم سیستمە بواری ئەوەش دەداتە بینەر تا ڕای خۆی لە بارەی بەرنامەکان بدات و ئەو گۆرانی و فیلم و زنجیرانەش هەڵبژێرن کە دەیانەوێ ببینن، هەروەها ڕاستەوخۆ ئەو کاڵایانەش بکڕن کە لە ڕێکلامدا پیشاندەدرێ، لە ویلایەتە یەکگرتووەکان و ژاپۆن و هەندێ وڵاتانی ڕۆژئاوا ئێستا کار بەم سیستمە دەکرێ.

**٥- ڕادیۆی کورتە شەپۆل و دیپلۆماسییەتی گشتی:**

لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا لە زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا و لە ئەمەریکادا پەخشی ڕادیۆیی هەبوو وەك (جەی بلاك) دەڵێ: "میدیای ئەلیکترۆنی بە شێوەیەکی گشتی بەرهەمی سەدەی بیستەمە". ڕادیۆ کە بە یەکەمین ناوەندی ئەلیکترۆنی جەماوەری دادەنرێ، یەکەمجار بۆ



گۆڕینەوەی پەیام تەنیا لە نێوان دوو کەسدا بەکارهاتووە پاشان بووە بە ئامێرێکی گرنگی پەیوەندیکردنی جەماوەری. پاش دۆزینەوەی شەپۆلی FM لە ساڵی ١٩٣٥ ڕادیۆ بازدانێکی گەورەی تری بەخۆوە بینی، چونکە ئەم لەرە لەرە توانی ئەم ژاوە ژاوە کەم بکاتەوە و لە زۆر ڕووش لە AM باشتر بوو. لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمەوە توانرا ڕادیۆ لە کەناڵێکی لۆکالەوە بکرێتە کەناڵێکی ئینتەرناشاڵ. لەگەڵ هاتنی تەلەفزیۆن، ئەگەرچی جەماوەری ڕادیۆ کەم بووەوە، بەڵام ڕادیۆ پێگەی خۆی هەر لە دەست نەدا و توانی شانبەشانی تەلفیزیۆن بەردەوامی بە پەخشەکەی خۆی بدات.

ئێزگە (کە بەرنامە بە شەپۆلی کورت بڵاو دەکاتەوە و خەسڵەتی ئەوەی هەیە، کە دەنگ دەگەیەنێتە مەودای دوور) ڕۆڵی بەرچاوی هەیە لە گەیاندنی نێودەوڵەتیدا، لە شەڕی ساردا پتر لە ١٠٠ ئێزگە (سەرباری ئێزگەی تایبەت) بەرنامەیان ئاراستەی نەتەوەکانی دی دەکرد، بە ملیۆنان مرۆڤ بە زمانی جیاجیا گوێیان لە هەواڵ دەبوو سەرباری مۆسیقاو زانیاری و بەرنامەی جۆراوجۆر. جیاوازییەکی زۆر لە نێوان زمانەکاندا هەیە، بەڵام گوێگر هەواڵی بەگوێرەی دڵی خۆی هەڵدەبژارد کە گوێی لێ بگرێ سەرباری ئەو مۆسیقایەی چێژی پێ دەبەخشێ. ئەو ئێزگانەی پەخشیان بە شەپۆلی کورتە، ئەو هەواڵانەی بڵاوی دەکەنەوە وەك ڕێکلام وایە بۆ ئەوانی دی، پێچەوانەی ئەوەش دروستە، هەروەها ئەو مۆسیقایەی لایەنێك پەخشی دەکرد بۆ ماوەی پتر لە پەنجا ساڵ مایەی بێزاری بوو بۆ ئەوانی دی. لە ڕێگەی ئێزگەوە، دیپلۆماسییەتی گشتی (لە میانەی هەواڵەکانی حکوومەتێك بۆ کارکردن لە حکوومەتێکی دی یان گەلەکەی) وردەکاری شەڕی ساردی کۆنترۆڵ کرد.

گوێگرانی ئێزگە (ئەوانەی بە شەپۆلی کورت بەرنامە پەخشدەکەن) تا ئێستا و بەردەوام ڕوو لە زیادبوونن، ئێزگەی (BBC) پتر لە دوو سەد ملیۆن گوێگری هەیە، پتر لە ٦٠٠ ملیۆن ئامێری ڕادیۆ لە جیهاندا هەن، نیوەی ئەو ژمارەیە لە ئاسیاو ئەفریقیایە، ئەو هەواڵانەی بە شەپۆلی کورت و درێژ دەگوازرێنەوە سەلماندیان کە سەرکەوتوون لە هەڵسووڕاندنی قەیرانی سیاسی و هەوڵەکانی کودەتا لە وڵاتانی ئەفریقا. لە هەندێ حاڵەتدا ناکرێ ڕێگە لە پەخشی ڕادیۆی لۆکاڵ بگیرێ کەچی بە ئاسانی ڕێگە لە هاتنی ڕۆژنامە دەگیرێ، کاتێ کەسێك گوێ لە ئێزگەی (BBC) یان دەنگی ئەمەریکا دەگرێ دەزانێ چی لە وڵاتەکەیدا ڕوودەدات جا ئەو کەسە لە هەر شوێن و دەوڵەتێك بێت.

پاش کۆتایی هاتنی شەڕی ساردیش پەخشکردنی پڕۆپاگەندە بەسەر هەندێ دەڤەری نائارامدا درێژەی کێشا، بەڵام لەگەڵ فراوانبوونی بازنەی ئابووری لەسەر ئاستی جیهاندا، ئیزگەکان پتر بایەخیان بە کاروباری ئابووری و زانیاری و داراییدا. هەرەسهێنانی ئابووری وڵاتانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیاو کاریگەری بەسەر ئابووری رۆژئاوا، باڵی کێشا بەسەر هەواڵی ئابوورییانەی جیهان. سیخوڕی سیاسی بە سیخوڕی ئابووری گۆڕا، هەروەها لە بواری فیلمی سینەمایی و ڤیدیۆ کاسێت و دیسك و کۆمپیوتەر زیاتر بایەخ بە چەتەیی نێودەوڵەتی درا. لە بواری ئامێرەکانی میدیای نێودەوڵەتیدا، رێکلام و بازاڕگەری وەك ئەرك و فەرمانێکی یەکسان بە پڕۆپاگەندە و دیپلۆماسییەتی گشتی تەماشا دەکرێ، ئەمەش پەیوەستە بە رادەی ئەوەی وەك خەرجیی رێکلام دەدرێ، بۆ بەرێکردنی کاڵاو فرۆشتنی بە ئاسانی.

لە بواری ئیزگەی نێودەوڵەتیدا ویلایەتە یەکگرتووەکان تا ئەم کاتە بە خێرایی گەشە دەکات. چەندین ساڵ بەر لە دامەزراندنی ئیزگەی دەنگی ئەمەریکا، کۆشکی سپی و کۆنگرێسی ئەمەریکا رازیبوون بە دامەزراندنی خزمەتگوزاری هەمەجۆری ئازادی رادیۆ، بە زمانی ئەو نەتەوانەی کە دەیەوێ گۆڕانکارییان تێدا دروستبکات. سەبارەت بە پەخشی تەلەفزیۆنی ئەمەریکی، چەندین کەناڵی تەلەفزیۆنی هەن کە هەفتانە دوو هەزار کاتژمێر هەواڵ و بەرنامە بە (٦١) زمان پەخشدەکەن، کەسیش ناتوانێ ژمارەی بینەران بخەملێنێ، وێڕای ئەوە ئامارێك هەیە؛ کە ئاماژەی بە (٨٦) ملیۆن کەس دەکات لە سەرانسەری جیهاندا کە بەرنامەی ئەو کەناڵانە دەبینن.

ئیزگە نێودەوڵەتییەکانی ئەمەریکا (ئیزگە ئاراستەکراوەکان) پتر لە ٣٥٠٠ کەسیان وەگەڕخستووە بۆ بەجێگەیاندنی کاری میدیاییان کە کاری ئیزگەیی دەکەن، کە جگە لە (BBC) هاوتاو هاوشانێکیان نییە. لە هەندێ وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵات و یەکێتی سۆڤیەتی جاران، ژمارەی گوێگرانی ئیزگەی دەنگی ئەمەریکا بەردەوام روو لە کەمی دەکات، چونکە لەو شوێنانەدا شێوازی رۆژنامەگەریی ئەورووپا برەوی پەیدا کردووە دوای ئەوەی نووسینگەکانی لە ئەورووپا داخست، ئیزگەی دەنگی ئەمەریکا بایەخی میدیایی خۆی لە ئەفریقا و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاسیادا چڕ کردەوە.

ئینتەرنێت و ئامێری پەخشی دیجیتاڵ لە رێگەی مانگی دەستکردەوە، کۆتایان بە سیستمی پەخشی ئاسایی هێنا کە پێویستی بە وێستگەی ناردن و بەهێزکردنەوە بوو لە سەرانسەری جیهاندا. ئیزگەی دەنگی ئەمەریکاو ئازادیی ئەورووپا و ئەورووپای ئازاد کەوتنە وەشاندنی



هەواڵ و بەرنامەکانیان لە ماڵپەری ئەلیکترۆنی خۆیان، ئیدی گوێگر هەر هێندە کۆمپیوتەرێکی وابەستە بە تۆڕی ئینتەرنێتی هەبێ، لەتوانایدایە هەر کاتێك ئارەزوو بکات گوێ لە بەرنامەی ئەو ئیزگانە بگرێ. ئێستا ئیزگە نێودەوڵەتییەکانی ئەمەریکاو رۆژئاوا، وەك (BBC) و دیوتچ ویلی دەتوانن بژاردەیەکی گوێگرانی خۆیان لە ئەکادیمیست و قوتابیانی زانکۆ و ئەندامانی حکوومەت هەڵبژێرن، لە رێگەی زیادکردنی ماڵپەری ئەلیکترۆنی بۆ ئەو ئیزگانە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێتدا یان بە وەرگرتنی پەخشەکەی بە ئامێری رادیۆی دیجیتاڵ، گەیاندنی نێودەوڵەتی لە رێگەی ئەم کەناڵانەوە ئێستا خێراتر و کەمخەرجیترە و زۆر بە ئەستەم حکوومەتەکان دەتوانن تەشویشیان بخەنە سەر.

**٦- رادیۆی دیجیتاڵ:**

پەخشی ئیزگەیی دیجیتاڵی کە بەهەردوو پیتی (HD) ئاماژەی بۆ دەکرێ لە کۆتایی ساڵانی نەوەدەکاندا پەیدا بوو، جیاوازییەکەی لەگەڵ پەخشی ئیزگەی کلاسیکی لە سروشتی ئاماژە نێردراوەکانە، بە پێچەوانەی ئاماژە رادیۆییەکانی ئێستا، وێستگەکانی ئیزگەی دیجیتاڵی ئاماژەی تێکەڵ لە پەخشی ئاسایی و دیجیتاڵی پێکەوە دەنێرن. ئەم جۆرە رادیۆیە لە ساڵی ٢٠٠٢وە لە ئەمەریکا بەکاردێ و ساڵێك دواتر بە هەموو وڵاتاندا بڵاوبووەوە، پەیدابوونی ئەم جۆرە رادیۆیە دەنگی باشترە بە پێچەوانەی رادیۆی (AM) کە باکگراوەندێکی ژاوەژاوی هەیە بە هۆی بارگاوی کارەبایی سەقامگیرەوە. ئاماژە رادیۆییەکان ئەو تەنانە نابڕن کە دەکەونە رێگەیان، بەڵکو دەگەڕێتەوە، ئەمەش ژاوەژاوو تێکەڵبوون لە دەنگ دروستدەکات، کەچی رادیۆی دیجیتاڵی دەنگێکی بێگەرد دابیندەکات لە بەرئەوەی بەجۆرێك دروستکراوە بۆ چارەسەرکردنی ئاماژە پێچەوانەییەکان و کەمکردنەوەی ژاوەژاوو ئەو دەنگانەی کە لە پڕێکدا زیاد و کەم دەبن. بە هۆی رادیۆی دیجیتاڵییەوە دەتوانی گوێ لە چەندین ئیزگەی جیاواز بگریت کە ئەو ئیزگەیە فەراهەمی دەکات، هەمووشیان لەسەر یەك شەپۆل بەبێ ئەوەی پێویست بە گۆڕینی بکات. چاوەڕوان دەکرێ تا دوو ساڵێتر رادیۆی ئاسایی بەتەواوی پەراوێز بخرێ بەتایبەتی لە رۆژئاوادا.

**٧- میدیای کەسیی:**

لە رۆژگاری ئەمڕۆدا، تارادەیەك جەماوەری تەلەفزیۆن و رادیۆ بەرەو کەمبوونەوە دەچن بە بەراورد لەگەڵ دەیەکانی پێشوودا، ئەمەش بەزۆری بۆ بڵاوبوونەوەی میدیای کەسی دەگەڕێتەوە، ئەمڕۆ خەڵك زیاتر کۆمپیوتەر و دی ڤی دی بەکاردێنێ وەك رادیۆ و تەلەفزیۆن.

ئەم شێوە میدیا تاکەکەسییە ئەلیکترۆنییە نوێیانە هەموو هۆکارەکانی کات بەسەربردن و سوود وەرگرتن بۆ بەکارهێنەرەکانیان دەستەبەر دەکەن و بەکارهێنەرانیش کۆنترۆڵی تەواویان بەسەریاندا هەیە و هەر کاتێك بیانەوێ و چییان بوێ دەتوانن بیبیستن و ببینن.

**٨- میدیای تیلێکۆمونیکەیشن:**

جۆرێکە لە پەیوەندیکردن لە دوورەوە بە بەکارهێنانی هۆکارە ئەلیکترۆنییەکان کە بۆ ئەم مەبەستە دیزاین کراون، هەروەکو لە فەرهەنگی وێبستەردا هاتووە ئەمجۆرە پێوەندیکردنە ناچێتە ژێر خانەی پەیوەندیکردنی جەماوەرییەوە، بەڵکو بەشێکە لە پرۆسەی پەیوەندیکردن بە هۆی ئامێرەکانی وەکو تیلیگراف و تەلەفۆن و...تاد، ئەنجامدەدرێ. لە ڕێگەی ئەم میدیایەوە دوو کەسی زۆر لە یەك دوور دەتوانن پەیوەندی بەیەکەوە بکەین، هەروەها لەلایەکیتر تاك دەتوانێ دەستی بگاتە زانیارییە دوور دەستەکان، چونکە ئەم میدیایە هەموو ئامێرە ئەلیکترۆنییەکانی وەکو تەلەگراف و تیلیتایپ و ڕادیۆ و ڕادار و سەتەلایەتیش دەگرێتەوە، ئەم چەمکە هەندێجار ئەوەندە فراوان دەبێ هەموو میدیا ئەلیکترۆنییەکان دەگرێتەخۆ و زۆرجاریش تێکەڵبوون و ئاڵۆزی دروستدەکات بەتایبەتی لەگەڵ میدیای جەماوەری، بەڵام خاڵی جیاوازی نێوانیان ئەوەیە کە تیلیکۆمیونیکەیشن تەنیا میدیا دوورەکان دەگرێتەوە، بەمانایەکیتر جیاوازییەکە لە دوورییە نەك لە کەناڵەکان.

ئەمڕۆ لە کۆمەڵگە زانیارییەکانی وەکو ئەوروپا و ئەمەریکا خەڵك پەیوەندی بەردەوامیان لەگەڵ ئەم جۆرە میدیایەدا هەیە و لە پەروەردە و فێرکردن و کات بەسەربردن و بازرگانیش بەکاری دێنن. لە میدیای کەسی یان تاکەکەسیدا، ئەم میدیایە ڤیدیۆ و سیدی و دیڤیدی و VCR و کۆمپیوتەر و کامکۆرد و کامێراو...تاد دەگرێتەوە. تاکەکان کۆنترۆڵی تەواویان بە سەر هۆکارەکانی پێوەندیکردندا هەیە. (جەی بلاك) پێیوایە "ئەم جۆرە میدیایە بۆ ژیانی مۆدێرن زۆر پێویستە، چونکە مرۆڤی مۆدێرن زۆر حەزی لە ژیانی تایبەتمەند هەیە و حەزی لێیە خۆی کۆنترۆڵی شتەکانی بەدەستەوە بکات". مرۆڤی هاوچەرخ زۆر کۆمەڵایەتی نییە و حەز بە تێکەڵبوون لەگەڵ کەسانی دەوروبەری ناکات، لە کاتەکانی پشوو و بەتاڵیشدا بەکارهێنانی میدیای کەسی چاکترین هاوڕێیە.

**٩- میدیای گشتی:**

میدیای گشتیی ئەو میدیایەیە کە لە خزمەتی هاوولاتیدایە نەك دەسەڵات و ئەو چالاکییانەی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و ئینتەرنێت... هتد، دەگرێتەوە کە لەخزمەتی گشتیدان و



هێڵە گشتییەکانی لەلایەن دەسەڵاتەوە دیاریدەکرێ، سەرچاوەی دارایی لە ڕێگەی ئابوونەی هاوولاتیانەوە دەبێ. نموونەیەکی میدیای گشتی، ئیزگەی (BBC) یە، بە ڕادیۆ تەلەفزیۆن ئینتەرنێتەوە. ئەو میدیایە ئەگەرچی لە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆدایە لە ڕووی ئیداری و داراییەوە لەگەڵ حکوومەتی بەریتانی، بەڵام کاربەدەستانی ئەو ئیزگەیە هەموو کات بێلایەن و بابەتیانە سەیری ڕووداوەکانی کۆمەڵگە دەکەن و لە ڕووی پیشەییەوە لە چوارچێوەی بابەت دەمێننەوە و بەرژەوەندی هاوولاتی مەبەستە نەك حکوومەت، ڕۆژنامەنووسی ئەو ئێزگە پرۆفیشنالانە کاری خۆی ئەنجامدەدات. یەکێك لە ئەرکە سەرەکییەکانی ولاتانی دیموکراتی دابینکردنی میدیایە کە بەرگری لە مافی هاوولاتی بکات، لە پەرلەمانیشدا لیژنەی تایبەت بە کاروباری میدیا هەیە بۆ چاودێریکردنی حکوومەت لە ڕووی جێبەجێکردنی ئەرکەکان، کە گرنگترینیان میدیای گشتییە.

## پیشەسازی ڕازیبوون:

شارەزایانی میدیای نوێ وای دەبینن کە سیستمی (ڤیدیۆ بەپێی داواکاری) تەلەفزیۆن دەکوژێ و بە تەواوی کۆنترۆڵی گۆڕەپانەکە دەکات، تەنانەت بەڕێوەبەرانی گەورە تۆڕە تەلەفزیۆنییە ئەوروپییەکان داوای گۆڕینی ناوی تۆڕە تەلەفزیۆنەکان بۆ تۆڕە ڤیدیۆییەکان دەکەن، چونکە تەلەفزیۆن لە ڕێگەی مردندایە. ئەم گۆڕانکارییە گەورەیە خۆی لەو گرنگییە دەبینێتەوە کە هەڵبژاردنێك دەداتە بەکارهێنەر یان بینەر بەوەی دەیەوێ بیبینێ، لە کاتێکدا پێشتر دیلی هەڵبژاردنەکانی کەناڵە تەلەفزیۆنییەکان بوو، هەروەها هەل دەرەخسێنێ بۆ بەرنامە تایبەتمەندەکان تا ڕێگە بۆ دڵی بینەران بدۆزێتەوە. بەڵام گۆڕانکاری تری گەورە ئەوەیە کە بە (دیموکراتییەتی میدیا) ناودەبرێ، لەبەر ئەوەی لە ڕۆژنامەگەری ڤیدیۆ و ڕۆژنامەگەری نووسینە تایبەتییەکاندا هەر کەسێك کامێرایەکی بچووك و لاپتۆپێکی هەبێ دەکرێ کەناڵی تایبەت بە خۆی دروستبکات، چی بوێ وێنەی بگرێ و بەپێی هەڵبژاردنەکانی بیخاتە سەر ئینتەرنێت و ملیۆنەها خوێنەر بیخوێنێتەوە، مانای وایە میدیا لە کۆنترۆڵی دەزگا میدیاییە کلاسیکییەکان ئازاد دەبێ و هەل بەخشینێکە بە هەموو کەسێك کە چی بوێ بیڵێ.

بەڵام چەندین پرس هەن، کە پێویستە سیستمی نوێی جیهانی یەکلای بکاتەوە پێش ئەوەی بەسەر گۆڕەپانی میدیایی زاڵ بێ لەوانە (راستگۆیی)ە، کەسی ئاسایی پێویستی بە ماندوبوونێکی زۆرە تاکو راستگۆیی خۆی بسەلمێنێ بۆ خوێنەران و میوانانی ماڵپەڕەکەی یان بینەرانی ڤیدیۆیەکە، هەروەها توانا دیاریکراوەکانی تاکەکان وا دەکات ئاستەم بێ رکابەری ئەو دەزگا میدیایانە بکەن، کە خاوەنی داهاتی دارایی مەزنن، واتە جۆر و باشێتیش پرسی گرنگن کە بوونەتە مایەی دڵەڕاوکێی تیۆریستەکانی میدیای نوێ و وابکات هەندێکیان دووپاتی بکەنەوە کە کۆنترۆڵی میدیای کلاسیکی لەسایەی تەکنۆلۆژیا نوێیەکان، تەنها بە گۆڕینی خۆیان و قۆستنەوەی ئەو گۆڕانکارییانە بەردەوام دەبێ.

مەسەلەیەکیتر پەیوەستە بە چۆنێتی گۆڕینی میدیای نوێ بۆ کەرتی بازرگانی قازانجهێنەر، ئەگەر ئەم پرسیارە هێشتا خراوەڕوو بێ سەبارەت بە میدیای نوێی پشتبەستوو بە ئینتەرنێت، ئەوا میدیای نوێی پشتبەستوو بە مۆبایل خێراتر پێشکەوت و خزمەتگوزاری هەواڵەکان لەمیانەی نامەکانی مۆبایل و پەخشی راستەوخۆی تەلەفزیۆنی و بڕگەی ڤیدیۆ بەپێی خواست...هتد بڵاو بووەوە، لە بەرئەوەی شێوازی قازانج دیارە کە ئەویش پارەی تەلەفۆن کردنە، یەکێك لە گرنگترین پرسەکان جۆری ئەو ناوەڕۆکەیە کە دەگونجێ لەگەڵ مۆبایل و تەکنۆلۆژیا نوێیەکان. پرسێکیتر پەیوەستە بە رەفتاری جەماوەر کە پێویستیان بە کاتێکی زۆرە تاکو رەفتاریان دەگۆڕن و بۆ ئەم تەکنۆلۆژیا نوێیانە دەگوازنەوە. جیهان بە گۆڕانکاری گەورە تێپەڕ دەبێ بە هۆی تەکنۆلۆژیاو ئەمەش کەرتی میدیا و سینەماو رادیۆ و پەیوەندییەکان دەگرێتەوە، کە جیهان دەگۆڕێ بۆ ئەوەی جیهانگیرترو کراوەتر بێ و زیاتر پشت بە تەکنیك ببەستێ و تاکانە و ئازادتر و لەوانەیە سەرنجڕاکێشتر بێ.

ئامرازەکانی میدیای نوێ و ئەو سیستەمانەی لە گەیاندندا بەکاردێن، بوونە مایەی پەرت و بڵاوکردنەوەی جەماوەر، ئیدی جەماوەر تێکڕا تەماشای یەك کەناڵی تەلەفزیۆن ناکەن، یان گوێ لە تەنیا ئیزگەیەك ناگرن، جەماوەر پەرتوبڵاو دەبنەوە بۆ دەستەی جیا، دەستەیەك تەماشای نمایشی جلوبەرگ دەکەن، دەستەیەکی دی تەماشای فیلم و یەکی دی تەماشای گۆرانی دەکەن، ئیدی بەمجۆرە، ئەم پەرتوبڵاوییە وای لە کەناڵەکانی تەلەفزیۆن و ئیزگەی رادیۆ و رۆژنامە و گۆڤارەکان کرد پسپۆرایەتی لە جۆرە هونەرێکدا پەیدا بکەن. میدیا پێویستییەکی حەتمییە بۆ بەئەنجامگەیاندن و تەواوکردنی پرۆسەی جیهانگیری، میدیای سەردەم نە سنووری هەیە و نە یاسا، دەتوانین لە هەموو شوێنێك و لە ژووری نووستنەکانیشماندا چاومان بە ئامرازەکانی بکەوێ. دەزگا و ئامرازەکانی میدیا بەتوندوتۆڵی بە دەسەڵاتی سیاسییەوە بەستراونەتەوە، بەدیوێکی تردا میدیا و خاوەن دەزگاکانی فەرمانبەری دەسەڵاتی سیاسین لە وڵاتەکانیان و ئەوانەشی لە دەسەڵاتدان جگە لە سەرمایەدارەکان کەسی دیکە نین. خاوەن دەزگا میدیاییەکان سەر بەهەمان ئەو چینە دەستەبژێرە سنووردارەی خاوەندارو بەڕێوەبەرەکانن کە دەستیان بەسەر ئابووری تایبەتدا گرتووە و بەو هۆیەوە دەستیان بەسەر دەسەڵاتدا گرتووە. لە رۆژئاوا دەسەڵات لەسەر ئاستی ناوخۆیی و دەرەکیش بێ میدیا ناتوانێ کار بکات، یان پاساو بۆ کارەکانی بهێنێتەوە، ناتوانێ کەلوپەلەکانی ساغبکاتەوە، ناتوانێ قەناعەت بە خەڵکی بهێنێ ناتوانێ پرۆسەکانی (لەوانە جیهانگیری) بەئەنجام بگەیەنێ و ئامانجەکانی بەدەستبێنێ.

میدیا ناتوانێ رەخنەگرێکی جدی دەسەڵات بێ و بیپشکنێ و ببێتە هێزێکی فشار بەسەرییەوە، نەك تەنها ئەمە، بەڵکو کاریش دەکات بۆ بەهانە داتاشین و چاوبەستکردن و سەرقاڵکردنی خەڵك بە کۆمەڵێك بابەتی ناگرنگ و تەنانەت زیانبەخشەوە، چونکە ئەوانەی لە دەسەڵاتدان و ئەوانەی خاوەن سەرمایەن و ئەوانەی بەڕێوەبەری دەزگاکانی میدیان هەموویان هەر یەکن، بۆیە میدیا هیچ نییە جگە لە گوێگرێکی چاك و بەتوانای دەسەڵات، (چۆمسکی) ناهەقی نەبووە کە وتوویەتی "میدیا دەسەڵات دەپەرستێ". میدیای سەردەم بەگشتی وەك بەشێك لە تەکنۆلۆژیاو تەکنۆلۆژیاشی لەگەڵدابێ، کاریگەری لە لایەنەکانی سیاسیو ئابووری و رۆشنبیری و کوولتوری و ئاکاری و کۆمەڵایەتی، لەلای تاك و کۆمەڵ جێدەهێڵێ.

یەکێك لە ئەرکە سەرەکییەکانی میدیای رۆژئاواو دەوڵەتانی خاوەن سەرچاوەی تەکنۆلۆژیا، کۆنترۆڵکردنی بیروبۆچوون و بیرکردنەوەی خەڵکییە، بەمانایەکیتر کورتکردنەوەی عەقڵ و سنووردارکردنی بیرکردنەوە و کوشتنی پرسیارەکانی تاکەکەس و کۆمەڵە، ئەمەش لە رێگەی کارکردنە سەر هەست و هۆشیان و ورووژاندنی سۆزیانە. (والتر لیبهان) ناوی لێدەنێ پیشەسازی رازیبوون و (چۆمسکی)ش دووبارە بەکاری دێنێتەوە و دەڵێ: "پێویستە کۆمەڵێکی بچووکی بەهێز هەبێ خەڵکی تریش جەماوەرێکی بینەر بن، دەبێ زۆریان لێبکرێ لەسەر رازیبوون، لە رێگەی کارکردنە سەر و رێکخستنەوەی بیرو هۆشیان" و وایان لێبکرێ تەنها رووکەشی شت و رووداوەکان ببینن و بخوێننەوە و لە بیرکردنەوەی قووڵ و پرسیاری جدی دابماڵرێن، ئەمەیە پیشەسازی رازیبوون، وەنەبێ ئەم پیشەسازییە و هۆیەکانی میدیا تەنها کار لە خەڵکی سادە بکاتو قەناعەتیان پێ بهێنێ، بەڵکو لەمەش زیاتر دەڕوات و کاریگەری لەسەر دەستەیەکیترو تاڕادەیەکی باش فریوی کەسانێکی تریش دەدات، کە خەڵکی سادە نین و تەنها بە کاری

رۆژانەوە خەریك نین، بەڵكو ئەمانە رۆشنبیرەكانن. بە دەربڕینێكیتر، میدیا و هۆكارەكانی و پرۆپاگەندە لە زۆربەی كاتدا كاریگەری زیاتریان لەسەر توێژە خوێندەوار و رۆشنبیرەكانە، چونكە بەپێی پیشە و كارەكەیان زیاتر پەیوەستن بە میدیاوە و زیاتر هۆیەكانی پرۆپاگەندە كاریان لێدەكات و وەڵامەكانیان لەو رێگەیەوە دەستدەخەن.

میدیا هەنگاوی لەمەش زیاتر تێدەپەڕێنێ و دەڕوات و درێژ دەبێتەوە بۆ كۆنترۆڵكردن و گۆڕینی باری سیاسی، ئابووری، كۆمەڵایەتی، رۆشنبیری و فەرهەنگی نەتەوە و گەلانی دیكە. دەستبەسەراگرتنی بیرو هۆش و رۆشنبیری گەلان شێوازێكی نوێی داگیركارییە، لە كاتێكدا ئامرازە نوێیەكانی پەیوەندیگرتن لە كەناڵ و كەرەستەكانی ملدان بۆ دەستبەسەرداگرتن و دەسەڵات و گۆڕانكاری و بە پاشكۆكردنی میدیا و رۆشنبیری و كوولتوری و سیاسی لە دەستی دەوڵەتە داگیركەرەكاندایە، كە بێگومان داگیركردنی لایەنی فیكری و رۆشنبیری و كوولتووری داگیركردنی سیاسیشی بەدوادا دێ، بۆیە ئەگەر داگیركردن لە رابردوودا بەهێزو چەك رواڵەتی باوی داگیركاری بووبێ، ئەوا دەستبەسەراگرتنی فیكری و رۆشنبیری لە رێگەی میدیاوە بە شێوەیەكی گشتی، هۆكارە بۆ وێرانبوونی ئیرادەی نەتەوەیی و داگیركاری فیكری. پێشكەوتنی تەكنۆلۆژیا و ئامرازەكانی میدیا لە وڵاتە پیشەسازییەكانداو بەكارهێنانی ئەم ئامرازو كەرەستە تەكنۆلۆژیانە، بۆ خزمەتی بەرژەوەندی دیاریكراوی دەسەڵاتدارانی سەرمایەدار شێوازێكی نوێی داگیركاری هێناوەتە ئارا، كە پەڕینەوە بوو لە شێوازی داگیركاری كلاسیكییەوە بۆ مۆدێلێكی نوێی دەست بەسەرداگرتنی عەقڵ و فەرهەنگ و توانای داهێنان و بەرەو پێشچوون. لێكۆڵینەوەكانی تایبەت بە تەكنۆلۆژیاو رەنگدانەوەی لەسەر كۆمەڵگە دواكەوتووەكان دەریانخستووە كە هەرچی زیاتری چوونە ناوەوەی تەكنۆلۆژیا بۆ ناو بوارەكانی ئەم كۆمەڵانە، دەبێتە هۆی زیاتر دەست بەسەرداگرتنی بوارەكانی میدیا و رۆشنبیری.

دەوڵەتە دواكەوتووەكان لە بوارێكی ئابووری و پیشەسازییەوە لە بارێكی خراپدان، بە هۆی كەمتوانایی و لاوازییان لە وەبەرهێناندا، هەمیشە پشت بەو پێداویستیانە دەبەستن كە لە دەوڵەتە پیشەسازییەكانی سەرچاوەی تەكنۆلۆژیاوە دەیانهێنن، بەمەش ملكەچی ئەو دەوڵەتانە دەبن و بەناچاری كار بۆ وەرگرتن و بلاوكردنەوەی مۆدێلە سیاسی و ئابووری و كوولتورییەكانی ئەوان دەكەن. لێكۆڵینەوەكان دەریانخستووە كە زیاتر لە ٩٠٪ی تەكنۆلۆژیاكانی جیهان لەلایەن چەند دەوڵەتێكی سەرمایەداری رۆژئاواو كۆمپانیای فرە رەگەزەوە دەستی بەسەردا گیراوە. لە هەمانكاتدا ٦٠٪ی كۆی گشتی كەرەستە و بەرهەمەكانی میدیا و رۆشنبیری و خۆشگوزەرانی



لەژێردەستی ئەمەریكادایە. وەكو وتمان، میدیا ئەو كارە دەكات كە دەسەڵات لە دەوڵەتەكانیاندا پێی دەسپێرن، هەر لە بلاوكردنەوەی بیروباوەڕو ئایدۆلۆژیاو سیاسەت و شێوازی سیستمی ئابووری و كۆمەڵایەتییەوە تا دەگاتە پیشاندان و پەخشكردنی كۆمەڵێك وێنەو فیلمی رووت (پۆرنۆگرافی) كە لە رێگەی كەناڵە ئاسمانییەكانەوە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن و تۆڕەكانی ئینتەرنێتدا پیشان دەدرێن، كە ئەمەی دواییشیان بۆ سەرقاڵكردنی گەنجانە و بێئاگاكردنیانە لە بارودۆخە سیاسییەكان و پرۆسەی كردنی مرۆڤە لە بوونەوەرێكی رۆحی و عەقڵانییەوە بۆ بوونەوەرێكی غەریزی چێژ پەرست، بۆیە تەكنۆلۆژیا بە تەنها رەگەزێك نییە لە رەگەزەكانی دەسەڵاتداریێتی ئابووری و سیاسی، بەڵكو لە هەمانكاتدا بووە بە رەگەزێكی سەرەكی دەسەڵاتداریێتی فیكری و كوولتوری.

## كاریگەری كولتووریی میدیای جیهانی:

ئەگەر بە وردی بڕوانینە بناغەكانی تەكنەلۆژی نوێ، بۆمان دەردەكەوێ چۆن ئەم تێكنەلۆژییە نوێیە یارمەتی پەرەپێدانی كۆمەڵ و گەشەكردنی داوە، بە بەراوردكردن لە نێوان رۆڵی شۆڕشی پیشەسازی كە چ كاریگەرییەكی لەسەر هاتنە كایەی دیموكراتی و پێشكەوتن هەبووە. هەروەها رۆڵی شۆڕشی تەكنەلۆژی، دەردەكەوێ كە كاریگەریێتی شۆڕشی تەكنەلۆژی زۆر مەزنترە بۆ پێشخستنی كۆمەڵ و پێشكەوتنی تەكنەلۆژی نوێ بە تایبەت لە بواری میدیادا بە زەقی دەردەكەوێ. گۆڕانكارییەكان لە بەشە جۆراوجۆرەكانی میدیاكان زۆر بە خێرایی روو دەدەن، (دیریك دی گیرچۆڤ) دەڵێ: "تەكنۆلۆژیای نوێ مرۆڤەكان لە بینەرێكی پاسیڤەوە بۆ بینەرێكی ژیر دەگۆڕێ كە زانیاری وەردەگرێ و بەرابەر ئەو زانیارییانە هەڵوێست وەردەگرێ". بەمەش دەوترێ (بەرزبوونەوەی ئاستی ئاڵوگۆڕی زانیاری لە نێوان بینەرو سەرچاوەی زانیاریدەر). لەگەڵ هاتنی ئەم تەكنۆلۆژیا نوێیە بیركردنەوە لە بەجیهانیكردنی كۆمەڵ و دونیا ئاسانتر بووە. ئەگەر كەمێك گەشبین بین، دەبێ باوەڕ بكەین كە تەكنۆلۆژیای نوێ لەگەڵ بیری ئابووری و سیاسی نوێدا دەبنە هۆی هەنگاونان بەرەو گەشەپێكردنی مرۆڤ و جیهانگیریش بێتە هۆیەك بۆ هاوكارییەكی باشتر بۆ ئەوەی گرفتە جیهانییەكان چارەسەر بكرێن.

كوولتوری رۆژئاوا رۆژ بە رۆژ زیاتر بەرەو بەشەكانیتری جیهان شەپۆل دەدات، جا ئەگەر جیهان بەرەو پێكهێنانی كۆمەڵگەیەكی نێودەوڵەتی هەنگاو دەنێ، ئیدی گفتوگۆ لە بارەی دەستپێكی بەشداریكردن لە كوولتورێكی میللی دێتە ئاراوە، ئەمەش بە شێوەیەكی سەرەكی

پشت بە رۆژئاوا دەبەستێ بەتایبەتی ئەمەریکا و بەریتانیا، رەخنەگرانیش بەو شتە رازی نین کە لەکاتی بەیەکگەیشتنی کوولتوری جیاجیا روودەدات، بەلای ئەوانەوە ئەم شتە بریتییە لە شەڕ و پێکهاتەیەکی نەگونجاو. لە ساڵی **١٩٩٩** دا (فریدریك تیپسۆن) دەڵێ: "ئەو کوولتورەی دوورە لە دەمارگرژی کە ئامرازەکانی گەیاندن و دەزگاکانی میدیا پەخشی دەکەن، لەوە دەچێ قسەی لووس بن نەك راستەقینە، وێڕای ئەوە چاکترە لە دەرخستنی ئەو جیاوازییەی لە نێوان کوولتورەکاندا هەیە". کاتێك پێشوازی لە کوولتور دەکرێ، کاریگەریش دەخاتەوە، دەکرێ بڵێین کەسەکان بەشێکی بەهاکان فەرامۆش دەکەن و بەشێکی دیکەیان قبووڵ دەکەن.

هەندێ لە ئەکادیمکارانی رۆژئاوا، کە برێکیان سیاسەتمەدارن پێیانوایە هەناردەی کوولتورییانەی ئەمەریکا وەك ئامرازەکانی میدیای ئیمپریالی و شەپۆلی بێ پسانەوەی کوولتورەکەی، هەڕەشە لە کوولتوری نەتەوەییانەی وڵاتانی دی دەکات، ئەوان ئەم شتە وەك سیاسەتێکی بە مەبەست دەبینن کە هەنگاوی یەکەم بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی کوولتورییانە و هەنگاوی دیکەشی بەدوادا دێ لە پێناو کۆنترۆڵکردنی بواری ئابوری و سیاسی کە کوولتوری ئەوانی دی رەش بکاتەوەو بیانکاتە پاشکۆی خۆی. ئەم جۆرە بۆچوونە لە رۆژئاوا یان رەت دەکرێتەوە یاخود فەرامۆش دەکرێ، کەچی لە وڵاتانی دی هەمیشە لە ئاست ئەم مەسەلەیەدا دەنگ بەرز دەکرێتەوە. دەکرێ لەم روانگەیەوە لە مەسەلەکە بڕوانین کە بەڵگەی دەرکەوتەکانی زاڵبوون لە فرۆشتنی فیلمی سینەمایی ئەمەریکا بە ئەوروپا دەردەکەوێ، کە لە ماوەی بیست ساڵی رابردوودا پێنج هێندە زیادی کردووە و لە کۆی سەد هۆڵی سینەمای جیهانی ٨٨ یان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانە.

**أ- شۆڕشی ڤیدیۆ کاسێت:** ئەو پەرش و بڵاوییەی کەوتە نێو خەڵکی لە سۆنگەی ئامێری ڤیدیۆ کاسێت (VCRS)ەوە بوو، کە خەڵکی بۆ بینینی خۆیان لە نێو شاشەی تەلەفزیۆندا بەکاریان هێنا، لە ماوەی کەمتر لە دە ساڵ ئامێری ڤیدیۆ کاسێت و کاسێت دریان بە هەموو شوێنێکی جیهاندا، بە فراوانتر لەوەی بەر لە سەدەیەك چاپەمەنی پێی گەیشت. ئەم پەرش و بڵاوییە وڵاتانی هەژاریشی گرتەوە وەکچۆن رۆژئاواو کۆمەڵگە دەوڵەمەندەکانی ئەوێشی تەنییەوە. ئامێری ڤیدیۆ کاسێت بەر سنگی حکوومەتەکان و ئیزگەکانی رادیۆ و کەناڵەکانی تەلەفزیۆنیشی گرت، ئیدی هەر کەس ئازادی ئەوەشیان بۆ فەراهەم بوو کە بە ئارەزووی خۆیان ئەوەی دەیانەوێ ببینن نەك ئەوەی حکوومەت (یان باوکان) دەیسەپێنن.



**ب- رۆڵی زمانی ئینگلیزی:** زمانی ئینگلیزی لە ئاستی جیاجیادا زمانی گەیاندنی جیهانییە، کە یەکێکە لە دە زمانی گەورەی جیهانی و بە پلەی دووەم دێ و (٤١٥) ملیۆن کەس لە دوانزە وڵاتدا قسەی پێدەکەن. زمانی چینیش لە پلەی یەکەمدایە، دوای ئەوانیش زمانی دیکە دێن وەك زمانی ئیسپانی و عەرەبی و ئەڵمانی. زمانی ئینگلیزی فراوانترین زمانە کە لە جوگرافیای جۆربەجۆردا بەکاردێ، لە جیهاندا (٤٠٠) ملیۆن کەس بەو زمانە دەخوێنن، یان زمانی دووەمیانە پاش زمانی دایك. سەرکردەکان لە نێو سەدان کەس و زۆربەی دیدارەکانیشیان بۆ دەزگاکانی میدیا بە زمانی ئینگلیزییە. هەروەها زمانی ئینگلیزی بۆتە زمانێکی جیهانی، زمانی زانست و تەکنۆلۆژیا و زمانی سەرەکی کۆمپیوتەر. ئەو شتەی پاڵ بە خەڵکییەوە دەنێ فێری زمانی ئینگلیزی ببن ئاسانی ئەو زمانەیە، پێنج یەکی جیهان دەتوانن بە ئینگلیزی بدوێن، بەڵام بە پلە و رادەی جیاجیا.

**ج- خامۆشبوونی کوولتوری پۆپ:** رۆژئاوا خۆی بڕیار دەدات کە نەك هەر شەڕی ساردی بردۆتەوە، بەڵکو شەڕی پڕکردنەوەی کاتی دەستبەتاڵی جیهانیشی بردۆتەوە، رۆشنبیری جەماوەری یەکێکە لە هەناردەی پڕ لە قازانجی ویلایەتە یەکگرتووەکان، لە کاتی شەڕی سارددا، ئەمەریکا کۆششی دەکرد بۆ هەناردنی چاکترین بەرهەمی رۆشنبیری، بەڵام ئێستا گفتوگۆیەك لەئارادایە کە خڵت و خاشی رۆشنبیری ئەمەریکا بەرەو جیهان شەپۆل دەدات.

## لە نێوان کولتووری کاغەزیی و ژمارەییدا:

زیادەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێین رۆژنامەی ئەلیکترۆنی پاشەڕۆژی رۆژنامەی کاغەزەو شێوازێکی نوێی رۆژنامەیە، گەرچی هۆکارەکەشی سادەیە، بەڵام گەوهەرییە، ماڵپەرە ئەلیکترۆنییەکان ئەو خزمەتگوزارییە پێشکەشدەکات کە جیاوازە لە وەدەستهێنانی رۆژنامەیەکی کاغەزی بۆیە رۆژنامە کاغەزییەکان ماڵپەری تایبەت لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت دەکەنەوە، بۆ ئەوەی رۆژنامەکە بە هەر دوو شێوەکەی ئامادە بێ بۆ وەرگرانی، شێوازە ئەلیکترۆنییەکە ئاسانتر دەستدەکەوێ و لە زۆربەی کاتەکاندا کارلێك لەگەڵیدا دروستدەبێ لە رێگەی تۆمارکردنی تێبینی و بەدواداچوونەکان بە شێوەیەکی راستەوخۆ، بەپێچەوانەی شێوە کاغەزییەکەی، ئەوە بەدەر لە سوودبینین لە خزمەتگوزارییەکانی ئەرشیف و گەڕان بەدوای بابەت و زانیاری تردا.

ئەم پێشکەوتنە رووبەرووبوونەوەی ئەو لایەنە باوەی رۆژنامەیە کە دامەزراوەکان زیاتر هەست بەو گەشەکردنە دەکەن، هەر ئەوانیش زیاتر گرنگی بە شێوە ئەلیکترۆنییەکە دەدەن بە

شێوەیەکی هاوسەنگ کە لە داهاتوودا پێی دەگوترێ شێوازی کلاسیکی، بە هۆی راکێشان و بڵاوکردنەوەی رێکلام لە رێگەی کۆمەڵێك ئاسانکاری و داهێنان لە رۆژنامەکەیاندا. ئەمە جگە لە دەرکردنی رۆژنامەیەکی یەدەگی ئەلیکترۆنی بە شێوەیەکی تەواو کە لەگەڵ ئەو پێشکەوتنە تێکنەلۆژییەدا بگونجێ کە هەیە، لەگەڵ پاراستنی کەلەپووری هەمیشەیی رۆژنامەی کاغەزی.

تا ئێستا رۆژنامەی کاغەزی ماوە و پێداویستییەکانی خوێنەرانی خۆی تێر دەکات، کەشوهەوایەکی تایبەت لە کاتی خوێندنەوەدا دروستدەکات، بەجۆرێك هەست بە جۆری لاپەڕەکە و پیت و مەرەکەبەکەی و بۆنو بەرامی رۆژنامەکە دەکرێ کە ئەمە لە رۆژنامەگەری ئەلیکترۆنیدا بەدی ناکرێ، تەنها ئەوە نەبێ کە لە رێگەی ئامێرێکەوە خوێنەر بە دوای ئەو بابەتانەی کە مەبەستێتی دەگەڕێ و هەست بە هیچکام لەو هەستانە ناکات کە لەگەڵ رۆژنامەیەکی کاغەزدا هەیەتی، بەڵام دەبێ گوێ بۆ ریتم و پێداویستییەکانی سەردەم رابگرین و هاوشان لەگەڵیدا بڕۆین و سەرجەم نوێ و کۆنەکان تێکەڵاو بکەین و ئامادەبین بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو رێگرییانەی دێنە بەردەممان، لەگەڵ ئەوەشدا نەوەی نوێ جگە لە ئامرازە تازەکانی پەیوەندیکردن بڕوا بە هیچ ئامراز و رێگەیەکیتر ناکات کە بەو شێوەیە هونەر و خزمەتگوزاری پێشکەش بکات. دوای ئەوەی تەلەفزیۆن بە بەرنامە هەواڵییەکانەوە کە بە وێنەوە بە شێوەیەکی بەردەوام بارودۆخی جیهان یەك لە دوای یەك و بەتوانایەکی زۆر باش دەگواستەوە بۆ بینەران، لە هەر کوێیەك بن، بەرادەیەك بەشێکی زۆر لە خوێنەرانی رۆژنامەکان بوونە بینەری تەلەفزیۆنەکان، بەمەش رۆژنامەکان تووشی زیانێکی گەورە هاتن و رێژەی بڵاوبوونەوەی رۆژنامەکان زۆر کەم بووەوە و زیانێکی ماددی زۆریان بەرکەوت. خەمڵاندنەکانی بڵاوکردنەوەی رۆژنامە رۆژانەییەکان لە ئەمەریکا، دەریدەخەن کە لە ساڵی ١٩٨٥ دا تیراژەکەی دەگەیشتە نزیکەی ٦٢ ملیۆن و ٨٠٠ هەزار، بەڵام لە ساڵی ٢٠٠٢ دا بۆ ٥٥ ملیۆن و ٢٠٠ هەزاری کەمکردەوە، ئەمەش نیگەرانییەکی زۆری دروست کردووە سەبارەت بە بارودۆخی رۆژنامە لە ئایندەدا.

لەم ساڵانەی دواییەشدا تۆڕی ئینتەرنێت بۆتە ئامرازێکی فەراهەمبووی ئاسان بۆ ئاڵوگۆڕی بۆچوون و زانیاری و هەستەکان و میکانیزمێکی گەیاندن و کارلێك لە نێوان خەڵکدا، بەڵام هەندێجار ئەوانەی لە رووپەری ئەم تۆڕە بڵاو دەکرێنەوە مایەی هەڵوەستەن، بە هۆی ئەوەی



دەزگاگەلی چاودێری و دەستەی هەڵسەنگاندن بۆ شیاوی و نەشیاوی بابەتەکان نین، ئەم تۆڕە بۆتە سەکۆیەکی ئازاد بۆ رادەربڕینی نووسەران بەبێ ترسی بڕین یان بڵاونەبوونەوەی بابەتەکانیان.

**چەندین هۆکار هەن وایانکردووە نووسەران پەنا بۆ ئینتەرنێت ببەن بۆ بڵاوکردنەوەی بابەتەکانیان لەوانە:**

١- ئاستەمیی بڵاوکردنەوە لە سەکۆ کاغەزییەکان لەو وڵاتانەی کە نووسەران لێی دەژین، جا لەبەر کەمیی ژمارەی رۆژنامەکان بێ یان لەبەر ئاستەنگە ئایدۆلۆژییەکان.

٢- سەختیی لە بڵاوکردنەوە و چاپکردندا لەبەر هۆکاری ماددی، نەخاسمە کە رۆشنبیران داهاتیان دیاریکراوە.

٣- رزگاربوون لە توندوتۆڵی چاودێری و ئاراستەکردن و بیرۆکراتییەتی هەڵسەنگاندن کە زۆر لە رۆشنبیران لە تامۆچێژی چاپ و بڵاوکردنەوە بێبەش دەکات.

٤- ئارەزوومەندی لە ناوبانگی لە نێو خوێنەران لە جیهاندا، کە چاپکراوە کاغەزییە دیاریکراوەکان لە رووی دابەشکردنەوە ناتوانن وەدەستی بێنن، کە ماڵپەڕەکانی ئینتەرنێت بەخێرایی ناوبانگ دەبەخشێ بەو نووسەرانەی کە کەڵەکەبوونێکی چۆنێتی و چەندێتی پێکهێناوە و بەهۆیەوە خۆی دەگەیەنێتە خوێنەران لە هەموو شوێنێکی جیهان.

٥- خێرایی لەرادەبەدەر لە بڵاوکردنەوەی ئەوەی رۆشنبیر دەینووسێ، کە دەکرێ لەچەند ماڵپەڕێکدا یان یەك ماڵپەردا لە هەفتەیەکدا دەیان وتاری بڵاو ببێتەوە، بێ ئەوەی ماڵپەڕەکان قۆرخ بکرێن بۆ چەند نووسەرێکی دیاریکراو، لە کاتێکدا چاپکراوە کاغەزییەکان مەرجی توندوتۆڵییان داناوە کە زەحمەتە بۆ نووسەر پابەندی هەموویان بێ، هەروەها لەکاتی بڵاوبوونەوەی نووسینێك لە رۆژنامە نابێ لە سەکۆیەکیتر بڵاوی بکاتەوە، بۆیە خەڵکێکی دیاریکراو ئاگاداری نووسینەکەی دەبن.

٦- بڵاوبوونەوەی دەق و هەواڵ و بابەتەکان لە کاتی دیاریکراو و گونجاوی خۆیدا، بەڵام لە رۆژنامە و گۆڤارەکان و کتێبەکاندا ئەمە بەخێرایی وەدی نایەت و هەموو پێداویستی و ئارەزووە خواستراوەکانی خاوەنەکانیان ناهێنێتە دی.

٧- بڵاوکراوە کاغەزییەکان زۆرجار کارلێکی راستەقینەی خواستراو لە نێوان نووسەر و خوێنەر ناهێنێتەدی، کەچی لە ماڵپەڕەکاندا ئەم پەیوەندییە ئەکتیڤترە، لەمیانەی خستنەڕووی هەڵوێستی خوێنەران لە بارەی هەر بابەتێکی بڵاوکراوە یان، زانینی ژمارەی خوێنەرانی بابەتێك.

دەکرێ بڵێین دوارۆژ بۆ کوولتوری دیجیتاڵی و ماڵپەڕە ئەلیکترۆنییەکانە، بمانەوێ یان نا ڕۆژنامە و کتێبی دیجیتاڵی جێگەی چاپکراوە کاغەزیی و پەرتووکەکان دەگرنەوە کە مێژوو و زەمەنی خێرا بەهەنگاوی گەورە بەرێی دەکات، بەڵام پەرتووك و گۆڤاری کاغەزی هەر پێگەی کوولتووری خۆیان دەبێ، گەرچی بەو چۆنێتی و شێواز و بەهایە نابێ کە هەیانبووە، کوولتورەکەمان لەداهاتوودا کوولتورێکی تێکەڵ دەبێ لە نێوان دیجیتاڵی و کاغەزیی، بەڵام کوولتوری دیجیتاڵی زاڵدەبێ لەبەر ئاسانی و خێراییەکەی و گەشە میدیایی و تەکنیکییەکەی و تێچوونە کەمەکەی، سەرەڕای ئەوەش پەرتووك هەر ئامادەیی دەبێ و خوێنەر دەستبەرداری نابێ.

لە سەرەتای دەیەی ١٩٩٠دا کە ڕۆژنامەی ئینتەرنێتی تازە دەگاتە پەیدابوو، ڕۆژنامە چاپییەکان چاویان لە ڕۆژنامەگەری ئینتەرنێتی دەکرد. لە چاوی ئەو دوو دڵ و بەگومانانەی کە خوویان بە کاغەز و مرەکەب گرتبوو، ئینتەرنێت جگە لەوەی هەڵگری هەموو تایبەتمەندییە نێگەتیڤەکانی تەلەفزیۆنی بوو وەك ئاڵۆزی، لاوەکیبوون و ساندیمانتاڵ بوون، جگە لەمانەش زۆری پێویست بوو، بتوانێ ببێتە جێگەی متمانەی وەرگر. ئەمڕۆ دۆخەکە بە تەواوی گۆڕاوە، (نیکۆلاس کریستۆف) یەکێك لە گۆشەنووسە ناودارەکان، نیویۆرك تایمزی ئینتەرنێتی وەك ئامرازێکی کاریگەر دەزانێ بۆ ڕاکێشانی وەرگر. ماڵپەری ئینتەرنێتی ئەم ڕۆژنامەیە زۆرترین ژمارەی میوانی هەیە، لە ڕۆژێکدا پێنج ملیۆن و سەد هەزار کەس سەردانی دەکەن، لە کاتێکدا لە، باشترین حاڵەتدا و واتە لە کۆتایی هەفتەدا ژمارەی فرۆشراوی ئەم ڕۆژنامەیە دەگاتە ملیۆنێك و سەد هەزار کەس. لە ساڵی ٢٠٠٣دا گەڕانی ئابووری بەشی دیجیتاڵی ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمز زیاتر لە ٨٨ ملیۆن دۆلار بوو، کە لە چاو ساڵی ٢٠٠٢دا نزیك بە ٢٢٪ گەشەی سەندبوو، ئەم گەڕانە ئابوورییە چوار ملیۆن و ٢٠٠ هەزار دۆلار سوودی ئابووری لێکەوتەوە، کە ١٤٧٪ سوودی ئابووری زیاتری هەبوو لە چاو ساڵی پێشتر.

خاڵی زۆر گرنگی ئەم ماڵپەرە ئەوەیە کە سەرەڕای ئەوەی هەڵگری ناوی نیویۆرك تایمزە، بەڵام بە هیچ جۆرێك هەمان ئەو هەواڵ و زانیارییانە ناخاتە سەر ئینتەرنێت، کە لە کۆپییە چاپکراوەکاندا دەخرێتە بەردەستی خوێنەران، وێڕای ئەوەی لە ساڵی ١٩٩٥ەوە تا ئێستا خزمەتگوزاریی بێ وێنە، بەتایبەت بە بەردەوامی بەم ماڵپەرە زیاد بووە. (مارتین نیسنهۆلتێز) بەرپرسی نیویۆرك تایمزی دیجیتاڵی دەڵێ: "دەبێ هەموو خاڵە بەهێزەکانی ئینتەرنێت بۆ دەستەبەرکردنی ڕەزامەندیی بەکاربەر بەکاربێنین و بە شەپۆلەکانی ئاشنا بکەین، بۆیە دەبێ لەسەر بنەمای خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی دیجیتاڵ خۆمان ڕێکبخەین، نەك ئەو بابەتانە بخەینە سەر ئینتەرنێت کە لە



ڕۆژنامەدا چاپ دەکرێن، ئەمە گرنگترین وانەیە کە دەبێ ڕۆژنامەکان لێی تێبگەن". نیویۆرك تایمز هەر ساڵێك زۆر باشتر لە ساڵی ڕابردوو کار دەکات، ئەمەشی لە مێژووی خۆیدا نیشانیداوە. لە ڕووی پێکهاتەو خستنەڕووەوە ڕۆژنامەگەریێتی کلاسیکی لەگەڵ ڕۆژنامەگەریی ئەلیکترۆنیدا جیاوازە، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا ڕۆژنامەگەری ئەلیکترۆنی تەنیا گواستنەوەی دەق و هەواڵ نییە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانەوە بۆ سەر شاشەکان، بەڵکو لەگەڵ ئەوەدا کۆمەڵێك باس و خواس و کارلێککاری چڕوپڕی تێدایە. بازنەی پێکهاتەی بابەتەکان وا لە خوێنەر دەکات بە ئارەزووی خۆی بەسەر شاشەی تۆڕەکانی ئینتەرنێتدا بگەڕێ و دەرەنجامی گۆڕانکارییەکان تەماشا بکات، هەروەها ئینتەرنێت ماوە و هەلێکی باش فەراهەم دەکات بۆ بەدەستگەیشتنی زانیاری زیاتر بۆ خوێنەران، ئەمەش جیاوازە لە جۆرە کلاسیکییەکە.

کارلێکاری خوێنەر لەگەڵ دیاردەکاندا هاندەر و گەشەپێدەری تواناکانی خوێنەران بوو بۆ بەدەستهێنانی هەواڵ و زانیاری نەك تەنیا لە شوێنێکی دیاریکراودا، بەڵکو لە چەندین ناوچە و هەرێمی جیاجیادا. لە ڕووی گەرم و گوڕی بڵاوکردنەوەی هەواڵ و خێراییەوە، چەرخی دیجیتاڵ توانی ئەو بوارە برەخسێنێ کە لە هەر کات و ساتێکدا خوێنەر بتوانێ بەدوای هەواڵەکاندا بچێ ئەمەش بواری کارلێکی ڕۆژنامەنووس و خوێنەر بەهێزتر دەکات، لەمبارەشەوە چەند لێکۆڵینەوەیەك ڕاستی سەرکەوتنی ئینتەرنێتیان وەکو باشترین هۆکاری میدیای هەواڵی بۆ باشتر ئاشناکردنی خوێنەر بە هەواڵەکان و یارمەتیدانی بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە بابەتەکان سەلماندووە. سەرباری ئەوەی چەندین گۆڕانکاری جۆری و بابەتی لە شێوازی ڕۆژنامەگەریێتی کلاسیکیدا هەیە، بەڵام لە ڕووی جۆری سانسۆر و بڵاوکردنەوەی بابەتەکان، خوێنەر زۆر ئازادانە هەواڵ و زانیاری وەرناگرێ وەك ئەوەی کە لەسەر شاشەکاندا بەدەستی دێنێ، بۆ نموونە: خوێنەر لە ڕووی کات بەفیڕۆدانەوە دەتوانێ تەنیا کات لەگەڵ چاوپیاخشاندنی ئەو بابەتانەدا سەرفبکات کە دەیەوێ زانیاری لەسەر هەبێ بۆیە لە ئینتەرنێتدا سانسۆری خودی و حکوومی کەمتر بەدیدەکرێ، مەگەر ئەوە نەبێ کە جاروبار هەندێ وێبسایت هاك دەکرێ.

هاتنە کایەی ئینتەرنێت و ڕۆژنامەگەریی ئەلیکترۆنی، بەجۆرێك دەرفەتی بۆ مرۆڤ ڕەخساند کە ئەگەر مرۆڤ توانای لە هەر بابەتێکدا هەبێ بتوانێ لەو مینبەرەوە وێبسایت و ڕۆژنامەی تایبەت بەخۆی هەبێ، زۆرجار بەناوبانگترین ماڵپەر و ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی کە چەندەها هەزار کەس ڕۆژانە تەماشایان دەکات، لەلایەن تەنیا کەسێکەوە بەڕێوە دەبرێ. وەرگێڕانی زمانەوانی دیسانەوە جموجوڵێکی تری جیوگرافی و کۆمەڵایەتی میدیا و ڕۆژنامەگەریێتی ئەلیکترۆنی بوو، کە لەگەڵ ئەوەی جاران ڕۆژنامەکان تەنیا لە ناوچەیەکی دیاریکراودا دەردەچوون و سانسۆرێکی جۆریی لەسەر

بوو، بەڵام وەرگێڕان لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تری بیانی و هەمەجۆر بوونی ماڵپەری بڵاوکردنەوە وایکرد سنوورەکان بەرفراوانتر و بەجیهانیی بێ.

زۆر لە رۆژنامە ئەمەریکییەکان خەریکن بایەخمەند دەبن بە رۆژنامەی دیجیتاڵی بەرابەر دابەزینی دابەشککردنی رۆژنامەی نووسراو، هەردوو ئامرازی رۆژنامەی کاغەزی و ئەلیکترۆنی بەراوردکردنیان لە رووی پرەنسیپەوە، نا ئینسافانە و ناهاوتایە. رۆژنامە لە هەر ئان و ساتێکدا لەبەردەم مەترسی ئەگەری کۆنبوون و نەماندایە، تیراژی تاڕادەیەك کەم، بێتاقەتی، ماندوێتی و نەبوونی بوارێك بۆ ئەوەی خەڵك بەدوایان بکەون و بیانخوێننەوە یان زۆر شتی دیکەی وەك هێڵە سوورە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان. رۆژنامە بەردەوام لە بارودۆخێکی نائاسایی و پڕ لە ململانێ و هەڵپە هەڵپدا دەژی، لە هەندێ وڵاتدا ئەم نائاسایی بوونە رەنگدەرەوەی قەیران و نائاساییبوونی خودی کۆمەڵگەشە. قەیرانی نووسراوەکانی رۆژنامە دەشێ رەنگدەرەوە یان دیوی ئەودیوی قەیرانی راستەقینەی کۆمەڵگە بێ. رۆژنامەگەریی چاپکراو کە بە درێژایی سەدەی بیستەم شاژنێکی تاج لەسەرنراو بوو هەزار حیسابی بۆ دەکراو جارێك بە خاوەنشکۆ و هەندێجار بە دەسەڵاتی چوارەم ناوزەد دەکرا، پێدەچێ ئێستا هەڕەشەی راستەقینە بۆ سەر تەختی ئەم رۆژنامەگەرییە هەبێ، بە هۆی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیاو پاشەکشەی سەنگی دنیا کە بووە بە گوندێکی بچووك، فەزای ئەلیکترۆنی ئەگەر بەرەکەشی لەژێر پێی رۆژنامەکان دەرنەهێنابێ ئەوا بەلایەنی کەم بەشداریکردووە لە کاریگەرییەکەی بەسەر مێشك و دڵ و دەروونی خوێنەراندا.

زۆر لە لێکۆڵینەوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە نەوەی نوێ پتر گرێدراوی تۆڕی ئینتەرنێتن لەسەر حیسابی رۆژنامەکان، بگرە چەندین توێژی نەوەی کۆنیش روویان لە رۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان کردووە و وازیان لەنەریتی کڕینی ئەو رۆژنامە کلاسیکیانە هێناوە کە لەسەردەمی خۆیاندا چووبووە نێو خوێنەوە، چونکە ئینتەرنێت هەرزانتر و ساناتر و خێراترە لە گەیاندنی رووداودا، ئێستا یەك رۆژ بووە بە زەمەنێکی دوور و درێژ و ئیدی ئەوەی بە دوای دەنگوباسدا بگەڕێ، ناتوانێ تا رۆژی ئایندە چاوەڕێ بکات تاکو وردەکارییەکان بزانێ، لەگەڵ ئەوەشدا رۆژنامەکان هەر بەهای خۆیان دەمێنێتەوە و هەرگیز شکست ناخۆن، بگرە کەناڵەکانی پەیوەندی ئاوێزانی یەك دەبن و کتێب و رۆژنامەو رادیۆ و کەناڵەکانی سەتەلایتو ئینتەرنێت شانبەشانی یەکتر دەمێنێتەوە و بە شێوەیەکی هارمۆنی بایەخی ئێمەیان لە نێو خۆیاندا هەریەکە و بەگوێرەی چێژ و جیاوازی کوولتورەکان دابەشکردووە.



ئەگەر چاپکراوەکان بەشێکی گرنگ بن لە بواری میدیادا، ئەوا رۆژنامە گرنگترین لایەنی چاپکراوی بواری میدیایە، رۆژنامە وەك یەکەم هەنگاوی بواری میدیا لە دیرۆکی مرۆڤایەتیدا رۆژنامە لە بایەخ و گرنگی نەکەوتووە، بە هۆی خێرایی و زۆری رووداوەکان و تامەزرۆیی مرۆڤ بۆ بیستن و بینینییەکان ئەمڕۆ ململانێیەکی توند لە بواری راگەیاندندا لەئارادایە و هەریەك لە رادیۆ و تەلەفزیۆن و ماڵپەرە ئینتەرنێتیەکان و رۆژنامەکان لە هەوڵدانن بۆ گەیاندنی تازەترین و سەرنجڕاکێشترین هەواڵ، ئەمە سەرەڕای ئەوەی بە هۆی تێکەڵبوونی شارستانێتییەکان و بەواقیعبوونی شەپۆلی جیهانگیری و بەنێودەوڵەتیبوونی سەرجەم کەناڵەکانی میدیا خواستی زانینی هەواڵ و گۆڕانکارییەکان لەسەر ئاستی دنیادا بەڕادەیەکە دوورترین و نزیکترین هەواڵ لە وەرگرەوە یەك بایەخ و کاریگەرییان هەیە، ئەمەش بە هۆی تێکەڵبوونی چارەنووس و نزیکبوونەوەی گرفتەکانە لەسەر ئاستی دنیادا، بۆیە زۆربوون و قورسبوونی ئەرکی میدیا لە دەستکەوتن و بڵاوکردنەوەی تازەترین هەواڵ، هاوکاتە لەگەڵ زۆربوونی خواستی وەرگر بۆ زانینی تازەترین هەواڵ و گۆڕانکاری لە دونیادا.

لەم ململانێ و گۆڕانکارییە گەورانەدا کەناڵە بینراو و بیستراوەکان لە پێشەوەن بۆ خێراتر گەیاندن و بڵاوکردنەوەی تازەترین هەواڵ و گۆڕانکارییەکان، بەمجۆرەش خاوەنی زۆرترین وەرگرن و زۆرترین کاریگەریش بەجێدێڵن، سەرەڕای ئەوەش تا ئەمڕۆ کەناڵە بینراو و بیستراوەکان نەیانتوانیوە رۆژنامە بخەنە دەرەوەی پرۆسەی میدیا، ئەمە لە کاتێکدا هەندێجار رۆژنامە دەبێتە تاکە کەناڵی میدیا بەتایبەت لە حاڵەتە نائاساییەکانی وەك جەنگ و کارەساتە سروشتییەکان کە دەبنە هۆی نەمانی کارەبا و پچڕانی پەیوەندییەکان. جگە لەمەش بە هۆی هەندێ تایبەتمەندی رۆژنامەوە، رۆژنامە بەردەوام وەك سەرچاوەیەکی گرنگی هەواڵ و زانیاری دەبینرێ و بەردەوامیش لە بەرەوپێشچووندایە.

**ئەو تایبەتمەندییانەی کە رۆژنامە لە کەناڵەکانی تری میدیا جیا دەکاتەوە بریتییە لە:**

١- رۆژنامە لە چەند لاپەڕەیەکی کاغەز پێکدێ و وەرگر دەتوانێ بۆ هەموو شوێنێك بیگوێزێتەوە، بەپێچەوانەی کەناڵەکانی تری بینراو و بیستراو و ئینتەرنێت.

٢- رۆژنامە هەواڵ و زانیارییەکانی چاپ دەکرێن و لەسەر لاپەڕەکان دەمێننەوە، وەرگر کاتێکی دیاریکراوی ناوێ بۆ بیستنیان وەك لە کەناڵە بیستراو و بینراوەکاندا هەیە، کە لەکاتی دیاریکراودا هەواڵەکان پەخشدەکرێن و ئەگەر وەرگر لەو ساتەدا ئامادە نەبوو ناتوانێ سوودیان

لێ وەربگرێ، بەپێچەوانەوە وەرگر چ کاتێك بیەوێ دەتوانێ ڕۆژنامە بخوێنێتەوە و سوودی لێوەربگرێ.

٣- وەرگر لە کاتی پێویستدا دەتوانێ بە هەواڵ و زانیارییەکانی ڕۆژنامەدا بچێتەوە لەبەر ئەوەی لەبەردەستیدایە و دەتوانێ لەلای خۆی ئەرشیفی بکات، بەڵام بۆ کەناڵی بینراو و بیستراو ئەمە ئاسان نییە.

٤- ڕۆژنامە سەرچاوەیەکی هەواڵ و زانیاری هەرزانە، ئەمڕۆ لە زۆربەی وڵاتانی دنیادا نرخی ڕۆژنامەکان بە کەمترین پارەی وڵاتە.

بە هۆی ئەم تایبەتمەندییانەوە تا ئەمڕۆش ڕۆژنامە لەبرەودایە و زۆرکات دەبینرێ کەناڵەکانی تری میدیا پشت بە ڕۆژنامەکان دەبەستن و دەیانکەنە سەرچاوەیەکی بەردەوامی هەواڵ. ئایندەی ڕۆژنامە لەم ڕۆژگاری پێشکەوتنە سەرسوڕهێنەرەی میدیا بەگشتی، بەندە بەو شێوازی کارکردنەی کە ڕۆژنامە بۆ خۆی هەڵیدەبژێرێ، باشترین شێواز و پلان بۆ ڕۆژنامەش هەڵبژاردنی ڕێچکەی ڕەخنەیی و ئازادی بیروڕا قووڵبوونەوەیە لە ناو خەڵکدا، خۆپاراستنە لە چاو نووقاندن لە کەموکوڕییەکانی دەسەڵات و شاردنەوەیان لە خەڵك، ئامادەبوونی ڕۆژنامەنووسان لە هەموو گۆڕانێکی یاسایی و کۆمەڵایەتیدا وەك دەسەڵاتی چوارەم و سەپاندنی ڕای گشتی بەسەر دەسەڵاتداو سەرخستنی خواست و ویستی خەڵك.

## میدیا لە ڕۆژئاوادا:

میدیا لە ڕۆژئاوا دەسەڵاتی چوارەم وەردەگرێ لە ڕووی کاریگەری لە ڕای گشتی، بەڵام لە کاتی ڕووداوە گەرمەکان دەچێتە خانەی یەکەم، شانبەشانی هەردوو دەسەڵاتی سیاسی و سەربازی دەوەستێ. بنچینەی میدیا لە ڕۆژ ئاوا بانگەواز بۆ ڕاکێشانی کەسی دووانەراو، ڕاکێشانیەتی بۆ ئامانجە مادییەکانی، بەهەر نرخو هەر هۆکارێك بێ، گرنگ نییە ئەم هۆکارانە ڕێپێدراو بێ یان ڕێپێنەدراو، گونجاو بێ یان نەگونجاو هەموو ڕیگەیەك دەگرنە بەر بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانیان. هەندێ بڕوایان وایە کە مەبەست لە کردنی جیهان بە گوندێکی بچووك ڕاستییەکی هۆکاری هێرشە بۆ سەر جیهانی سێیەم و ڕۆژئاوا مەبەستێتی یەك ڕۆشنبیری پیادە بکرێ ئەویش ڕۆشنبیری ڕۆژئاواییە، بەمەش جیهان وەکو گوندێکی لێدێ کە



یەك شێوازی ژیان و بەها و پێوانەی هەبێ، واتا پێویستە ڕۆژهەڵات هەمان بۆچوون و بیروباوەڕ و نەریت و تەنانەت خووڕەوشتی هەبێ، هەروەك بڕواشیان وایە کە پێویستە لە ڕووی خواردن و پۆشاکیشەوە ڕۆژهەڵات هاوشێوەی ڕۆژئاوا بێ.

لە جیهانی ئەمڕۆی ڕۆژئاوادا، بەدەگمەن تاك هەیە، کە خاوەنی (سێلفۆن و نێت و سەتەلایت) نەبێ کە بۆتە بەشێك لە پێداویستییەکانی ژیانی ڕۆژانە. ئەو دەرفەتە لە پاڵ بەگەڕخستنی بازاڕی سەرمایە بۆ خەڵکی ڕۆژهەڵاتیش ڕەخسا، کە لە سەرەتا ماڵە دەوڵەمەندەکانی گرتەوە دواتر جووتیارانیش، کە هەتا ئەگەر خاوەنی نێت و سەتەلایتیش نەبێ سێلفۆنێکی لەسەر نێکی بەستووە. لە وڵاتانی پێشکەوتووی سەرمایەداری و لەوانە لە ئەمەریکا تەواوی ڕادیۆ و ڕۆژنامەکان لەلایەن چەند کۆمپانیایەکی گەورە کۆنترۆڵ دەکرێ کە ژمارەیان لە پەنجەکانی دەست تێناپەڕێ، هیچکام لەم کۆمپانیایانە بەتەنیا ڕادیۆ و ڕۆژنامە کۆنترۆڵ ناکەن، بەڵام ئەم ڕەوتە بەخێرایی و بە شێوەیەکی بەرین بۆ کۆنترۆڵکردن و دەست بەسەراگرتنی تەواوی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان، ئێزگەکانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن، بڵاوکردنەوەی کتێب، پیشەسازی سینەما و میدیاکانیتر لەلایەن چەند کۆمپانیایەکی چەند میللەتێکەوە دەچێتە پێش. بەمەش دەکرێ وەك خاوەن کۆمپانیاکانیش پێشبینی دەکەن، لە ئایندەیەکی نزیکدا ٥-٦ کۆمپانیای گەورە کۆنترۆڵی تەواوی ڕادیۆ و ڕۆژنامە سەرەکییەکان بگرنە دەست. بە لەبەرچاو گرتنی تایبەتییەکی هاوبەش کە لە نێوان ئامانجە تایبەتی و سیاسی و ئابوورییەکانی خاوەنەکانی ئەم کۆمپانیانەدا هەیە و بە لەبەرچاوگرتنی توانایەکی سەرسوڕهێنەر کە بە تێکەڵبوونی ئامرازی جۆراوجۆر و مۆدێرنەکانی هەواڵ و میدیا پێکدێ، بوونی ١٠-٢٠ خاوەنی بەهێز لە جیاتی یەك خاوەن، جیاوازییەکی ئەوتۆی بۆ خەڵك نییە و ناشیبێ.

پێشبینی ئەم تێکەڵاوبوونەی کۆمپانیا گەورەکان لەسەر ئەو بنەمای گۆڕانکارییە کە لە چەند ساڵی ڕابردوودا ڕوویانداوە، بۆ نموونە لە دوای شەڕی جیهانی دووەمەوە ٨٠٪ی ڕۆژنامەکانی ئەمەریکا خاوەندارێتی سەربەخۆیان هەبووە، بەڵام لە ساڵی ١٩٨٩وە ئەم پارسەنگە پێچەوانە بووەوە و ئێستا خاوەنی زیاتر لە ٨٠٪ی ڕۆژنامەکان لە دەستی کۆمپانیای گەورەی زنجیرەییدایە، بەڵام دوای حەوت ساڵ ژمارەی ئەم کۆمپانیانە بووە سیانزە کۆمپانیای گەورە. ئێستا گەرچی زیاتر لە ٢٥ هەزار ئامرازی جۆراوجۆری میدیا لە ئەمەریکادا هەن، کەچی تەنیا ٢٣ کۆمپانیای گەورە کۆنترۆڵی زۆربەی ئەو ئامرازانە دەکەن.

ستراتیژ و ئامانجی ئەم کۆمپانیا گەورانە ئەوەیە کە دەبێ تا ئەو جێگەیەی دەکرێ خاوەندارێتیان بەسەر هەموو جۆرە ئامراز و دامودەزگاکانی هەواڵیدا هەبێ، (رۆبرت مورداك) کە یەکێکە لە گەورەترین خاوەنانی ئەم ئامرازانە، دەڵێ: "سەرەکیترین و رەسەنترین سیاسەتی ئابووری و جیهانی خۆی لەم زەمینەیەدا، کڕین و دەست بەسەردا گرتنی رادیۆ و رۆژنامەکانی ترە". خاوەنە رەسەنەکانی تۆڕە (تەلەفزیۆنەکانی کابڵ) هەر ئەو کۆمپانیایانەن کە رۆژنامەکان، گۆڤارەکان، کتێب و ئامرازەکانی تری میدیایان لەبەردەستە. ئەم کۆمپانیایانە بەردەوام جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە خاوەندارێتی گشتی یان بەشێك لەو بەرنامانەی خۆیان بلاوی دەکەنەوە، لەدەست خۆیاندا بێ.

ئێستا هەرچی لە ئەمەریکا دەخوێنرێتەوە و دەبینرێ کۆنترۆڵی لە دەست خاوەنانی ٢٣ کۆمپانیای گەورەدایە، ئەمانە دەتوانن بە کەڵك وەرگرتن لە ئامرازەکانی میدیا کۆمپانیاکانیتر وەلا بنێن، تەنانەت بانگەوازکردن بۆ سیاسەتمەداری دڵخوازی خۆیان یان ریسواکردنی، ئەم کۆمپانیایانە گرنگترین و بەهێزترین فاکتەری شکڵپێدانی بیروڕای گشتی ئەمریکان سەبارەت بە رووداوە جۆراوجۆرەکان و بە هۆی بوونی دەسەڵاتێکی وەها بەسەر بیروڕای گشتیدا ئەم کۆمپانیایانە لە ناوخۆی وڵاتدا هەژموونێکی کاریگەرو حاشا هەڵنەگریان هەیە. خواست و مەبەستی زۆربەی خاوەنانی ئەم کۆمپانیایانە بوون بە سەرکۆمار نییە بەڵکو بوونی هەژموونە بەسەر سەرکۆماردا، رادەی ئەم هەژموونە بەستراوەتەوە بە توانای رادیۆ و رۆژنامەکانەوە. زۆربەی رۆژنامەکانی ئەمریکا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا پێکهاتن. لەوانە؛ نیویۆرك تایمز، واشنتون پۆست و لۆس ئەنجیلۆس تایمز. ئەمانە رۆژنامە سادە و لۆکاڵییەکانی سەرەتای پێکهاتنی رۆژنامەکان بوون، بەڵام لە سەرەتای دەیەی ١٩٦٠ بە بەرزبوونەوەی ئاستی داهاتە گشتییەکان، چوونە سەری ئاستی خوێندەواری و زانیاری، بوونە دامەزراوی گەورە. لەوکاتەوە لەناکاو دونیای سەرمایەگوزاری بازرگانییەکی یەکجار پڕ لە قازانجی بەناوی رادیۆ و رۆژنامەکان ئاشکرا کرد و بەربەرەکانی بۆ کۆنترۆڵکردنی رادیۆ و رۆژنامەکان دەستپێکرد، پاوانکردنی خاوەندارێتیش رۆژ بە رۆژ زیاتر بوو. لەم ساڵانەی دواییدا کۆمپانیاکانی وەك (تایمز وارنەر) بەرادەیەك بەسەر بازاڕی کتێبدا زاڵبوون کە سەرەڕای بوونی یانزە هەزار گۆڤاری جۆراوجۆر لە ئاستی وڵاتدا، تەنیا سێ کۆمپانیای گەورە زیاتر لە نیوەی بازاڕیان لە کۆنترۆڵ و بەردەستدایە. هیچکام لە رادیۆ و رۆژنامە هەواڵییە سەرتاسەرییەکانی ئەمەریکا بەتەنیا ناتوانن وەڵامدەری تەواوی نیازەکانی کەسێکی ئەمەریکی بێت، لەم رووەوە سەرەڕای بوونی



زیاتر لە ٦١٠٠ رۆژنامەی لۆکاڵی، تەنیا شتێك کە لە رۆژنامەی سەرتاسەری دەچێ (واڵ ئێستریت جورناڵ)ە، ئەویش رۆژنامەیەکی تایبەتمەندییە. (نیویۆرك تایمز)، وردە وردە خەریکە وەك رۆژنامەیەکی سەرتاسەری لێدێ کە لە هەموو شوێنێکی ئەمەریکادا وەدەستدەکەوێ.

جەماوەری میدیای نوێ، بەو فرەیی و هەمەڕەنگی و ئەو کوولتورەی تێیدا باوە لە هەمەجۆر شوێنێکی جیهاندا هەن. پەیڤی چاپکراوی سەر کاغەز (کاغەزی رۆژنامە و ماڵپەری رۆژنامەکان)، وێنەی چەسپاو، وێنەی بزواو، تۆماری دەنگ و رەنگ، هەموو ئەم تەکنیکانە کار لە بیرکردنەوە و کوولتوری مرۆڤ دەکەن، نەك مرۆڤی رۆژئاوایی، بەڵکو مرۆڤ لە هەر شوێنێکدا بێ، دەکەوێتە بەر کاریگەری ئەم تەکنیکی میدیایە. گەلێ ئامرازی دیکەش هەن کە بە هەمان ئەندازە کاریگەرن، وەك موزیکی کلاسیکی و موزیکی هەرادار و ئەو فیلمە سینەماییانەی هۆلیوود دەیانهێنێتە بەرهەم و بەرنامەکانی تەلەفزیۆن و شێوازەکانی ژیان. سەرباری بەهاکانی ئایدۆلۆژیا وەك داد و مافی مرۆڤ و دیموکراسی و سەربەخۆیی تاك و ئازادی کە لە یەك کاتدا شتی ئەرێنی و نەرێنییان هەیە گەیاندنی نێودەوڵەتی بەرەو هاندانی تاکایەتی دەچێ، ئامرازەکانی میدیای نێودەوڵەتیش ئازادی تاك فراوانتر دەکات و لەکاراکردنی دیموکراتییەت لە نێو نەتەوەکاندا بەشدار دەبێ، هەروەها گەشەکردنی رۆژنامەگەری بووە مایەی بەگوڕ کەوتنی بازاڕی ئابووری و کوولتوری میللی رۆژئاوا.

بەهێزکردنی تواناکانی رۆژنامەگەری رۆژئاوا (میدیای بەریتانیا و ئەو دەزگا هاوبەشانەی لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا پەیڕەوی دیموکراتییەت دەکەن)، لە کاتی قەیرانی نێودەوڵەتیدا زۆر بە خێرایی و بە تەواوی کار لە پەیوەندی نێودەوڵەتی دەکەن، کە سەرکردەکانی جیهان و نەتەوە یەکگرتووەکان لایەنانی بازرگانی و رێکخراوی حکوومی لە بەدەستهێنانی هەواڵ، لە بارەی رووداوی جۆربەجۆر پشتی پێ دەبەستن. ئامرازەکانی میدیای نێودەوڵەتی لە ناسینی قەیران و کردەی تیرۆریستی و پێشێلکردنی مافی مرۆڤ و ئاراستەی ئابووری و قەیرانی بازرگانی و کارەساتی سیاسیدا، دەتوانن یارمەتی جیهان بدەن. (هێرمان و میك چیسنی) رەخنەیان لە میدیای ئابووریداری نێودەوڵەتی و گەشەسەندنەکانی گرت، هەردووکیان سەنترالیزمی هێزی ئامرازەکانی میدیا بە باش دەزانن، هەروەها بە تەواوی ئیدارەدانی میدیای جەماوەری و پێشکەشکردنی خزمەت لە ئاستی ئامرازەکانی میدیا رەت دەکەنەوە. ئەوان ئامرازەکانی میدیا بە هەڕەشەیەك بۆ سەر دیموکراسی دەزانن، بە هۆی ئەوەی ئاستی بەشداریکردنی جەماوەر کەم دەکەنەوە. وا لە کوولتوری کات بەسەربردن دەڕوانن کە لەگەڵ سیستەمی

دیموکراتیدا ناکۆکە، وا لە ئامرازەکانی میدیا دەڕوانن کە هۆکارێکن وا داڕێژراون کە درێ بە بازاڕ بدەن، نەك وەك پێویستییەکی پەیوەندیکردن لە نێوان هاوولاتیاندا. رەخنەی رۆژنامەوانی بە پارێزەوە دەڕوانێتە کۆمپانیای فرەرەگەز، ئامرازەکانی میدیا وەك ئەوەی رەخنەگران دەیبینن، دەکەونە بەر هەڕەشەی دەزگاکانی فرەرەگەز، ئەویش بە بەکارهێنانی میدیا بۆ وەدەستهێنانی قازانج. رەخنەگران پێشبینی دەکەن بەهای دەزگاکانی میدیا روو لە کزی بکات، لەگەڵ پشتگوێخستنی ئەو دەنگانەی بانگەشە بۆ کێبڕکێ و ئامادە نەبوون بۆ گەنگەشەکردن لە بارەی بابەتی هەواڵەوە دەکەن، لە ئایندەیەکی نزیکدا رەخنەگران ترسی ئەوەیان هەیە لە پێناو شتی تایبەتدا بنەماکانی رۆژنامەوانی بکرێتە قوربانی. هەندێ لە رەخنەگران لەو باوەڕەدان مەترسی لە کارکردنێکدا نییە، کە بۆ وەدەستهێنانی هەواڵ و بەدواداچوونی رووداوە، بەڵکو کێبڕکێ لە بواری دابەشکردنی هەواڵ و زانیارییە بە هۆی کێبڵەوە، یان لە رێگەی سیستمی مانگی دەستکرد یان پەخشی ئاساییە.

لە نێو هەموو ئەو رۆژنامانەی کە لە ئەمەریکادا کاریگەرییەکی زۆری هەیە بریتین لە رۆژنامەی نیویۆرك تایمز و یو ئێس تودەی و واشنتۆن پۆست و وۆڵ ستریت جورناڵ، ئەم رۆژنامانە هەژموونی ژیانی ئابووری و سیاسی ئەمەریکایان کردووە و بە سەرچاوەی رێسا و بیر و بۆچوون دادەنرێن، بۆ زۆربەی کەناڵە میدیاکانیتر.

(سیرج حلمی)، نووسەر لە رۆژنامەی لۆموند دیپلۆماتیك بە پێچەوانەی بۆچوونی (فرانسیس فۆکۆیاما) کە پێیوایە رۆژئاوای ئەمەریکی کۆتایی مێژووە، ئەم پێیوایە ئەمەریکا کۆتایی هەواڵە. (حلمی) تێبینی ئەوەی کردووە، کە بە بەردەوام هەواڵە راستەقینەکان دەکرێنە قوربانی لە پێناو ئاراستەیەکی بە ئەنقەست کە ئامانجی زیادکردنی ژمارەی بەکارهێنانە، ئەمەش لەوکاتە دەبێ کە هەتا کاری سەرنووسەرەکان لەگەڵ کاری بەرپرسان لە بارەی بازاڕکاری بسازێ، بەوەی دەستبەرداری وردبینی لە هەواڵی ئەو لایەنانە دەبن کە رێکلامی لا بڵاو دەکەنەوە، بۆ ئەوەی داهاتی رۆژنامەکانیان لەمیانەی رێکلام و سەرچاوەکانی هێزەوە کاریگەری خراپ نەکاتە سەر، هەمان شتیش بۆ تەلەفزیۆن، بەجۆرێك بڵاوکراوەکانی هەواڵ زیاتر ئەو هەواڵە ناوخۆیی و ئابڕوچوونانە بڵاو دەکەنەوە کە سەرنجی بینەری ئەمەریکی رادەکێشێ و ئامادەیان دەکات بۆ (دیاردەی لێسەندنەوەی مێشك)یان وەك (تۆماس فرانك) دووپاتی دەکاتەوە.



دەستەبەرکردنی زانیاری و بەشداری گەورەی لە بواری (پرۆسە گەیاندنەکان) کە وای لێهات لەسەر ئاستێکی فراوان لە بواری میدیا و رۆشنبیرکردن و کات بەسەربردن بەکاربهێنرێ، بەتایبەتی لە تۆڕی ئینتەرنێت کە وای لێهاتووە بەکارهێنانی فەراهەم بێ بۆ هەمووان، کە ئاسۆگەلێکی لەبەردەم مرۆڤدا کردەوە کە چاوەڕوانی نەدەکرد پێی بگات بەمشێوە ئاسانە، کە وای لێهاتووە ئاسان بێ چالاکییە رۆژانەییەکانی لە رێگەی ئەم تۆڕەوە پیادە بکات، هەر لە نامە گۆڕینەوە یاخود پەیوەندیکردن بەوانیترەوە یان مۆرکردنی بۆندی بازرگانی یاخود خوێندن...هتد، لە چالاکییەکان بەبێ کۆتوبەند بە کات و شوێنەوە. پەیمانگەی ستانفۆرد بۆ لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییە چۆنییەکان، توێژینەوەیەکی ئەنجامداوە تیایدا هاتووە کە، بەکارهێنانی ئینتەرنێت بە شێوەیەکی گەورە کاریگەری هەیە لەسەر ئەوکاتەی کە هاوولاتی ئەمەریکی لەبەردەم تەلەفزیۆن بەسەری دەبات، هەروەها بە خراپ کاریگەری هەیە لەسەر سەرجەم ئەوکاتەی کە لەگەڵ خێزان و هاوڕێکانی بەسەری دەبات.

سەبارەت بە ئامرازەکانی میدیا ئەوەی مایەی تێبینییە هەژمونی فیلم و بەرنامە ئەمەریکییەکانە بەتایبەتی و رۆژئاواییەکان بەگشتی، بەجۆرێك ئامرازەکانی میدیای ئەمەریکی کۆنترۆڵی ٦٥%ی ماددە میدیایی و رێکلامی و کوولتورییەکانیان کردووە، ئەم ئامرازانە برەو بە کوولتور و بەهای رۆژئاوایی دەدەن لەسەر کۆمەڵگەکانیتر، بە هۆی هەژموونی نیمچە تەواوی کۆمپانیا فرەرەگەزەکان لەسەر گەورەترین و گرنگترین تەکنیکە میدیاییە نوێیەکان و لەسەر کلیلەکانی جیهانی دواڕۆژ لە مێشکە ئەلیکترۆنییەکان، کە وای لێهاتووە بە شێوەیەکی راستەوخۆ دەست وەردەدات لە مەیدانی میدیا و گەیاندنەکان و چاوی بڕیوەتە قازانجە زۆرەکەی و زیادبوونی سەرمایەکانیان، کە سەرمایەی هەندێکی لە داهاتی دە وڵاتی ئەفریقی زیاترە.

کرانەوەی کۆمەڵایەتی و تێکەڵبوونی کۆمەڵگەکان، چاکترین دەرفەتە بۆ تەواوکاری لە ئاستی جیهاندا، ئەمەش پێویستی بە رۆژنامەگەرییەکی ئازاد و بەرپرس هەیە، ئەزموونی ئەمڕۆی رۆژئاوا لە بواری رۆژنامەگەریدا بەو ئاراستەیە کار دەکات.

**- شەو و رۆژ هەواڵ:**

تۆڕی میدیای نێودەوڵەتی سەرنجی ژمارەیەکی زۆر لە بینەرانی راکێشاوە، لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بینەران هەست بە کاریگەری کەناڵەکانی (CNN) و (MSNBC) و (CNBC) و (FOX NEWS) دەکەن کە بە سیستمی کێبڵ بەدرێژایی ٢٤ کاتژمێر گرنگترین هەواڵ و چیرۆکە هەواڵەکانی جیهان دەگوازنەوە، ئەم کەناڵانە لە رێگەی گەیاندنی

ئاسمانییەوە بەرنامەکانیان بە جیهاندا پەخشدەکەن. کەناڵی (CNN) بەرنامەکانی لە زیاتر لە ١٤٠ دەوڵەتدا دەبینرێ و راپۆرتەکانیشی لە کاتی هەر قەیرانێکی نێودەوڵەتیدا دەگەنە زۆربەی وڵاتانی جیهان، راپۆرتەکانی ئەم کەناڵە لە هەموو پایتەختەکانی جیهاندا دەبینرێن، بۆیە هەموو سەرکردەیەکی سیاسی و دیپلۆماسی تەماشای بەرنامەکانی ئەو کەناڵە دەکات، ئاواتیش دەخوازێ کە ئەو کەناڵە دیمانەیان لەگەڵدا بکات، بۆ ئەوەی هەموو جیهان بە راو بۆچوونی خۆیان ئاشنا بکات.

**– هەواڵی ئابووری و میدیای ئازاد:**

کەناڵگەلی ئابووری زۆر بەگوڕ و هێزەوە لە پێشبڕکێدان لەگەڵ بازاڕەکانی دراودا وەك (داوجۆنز) و (رۆیتەرز) و هی دی، ئەم بازاڕانە ئەنجامی سەودا و کردەکانی کڕین و فرۆشتنی پشك لە رۆژنامەی ئەلیکترۆنیدا بڵاو دەکەنەوە، هەروەها ململانێیەك رووی لە گەشەسەندنە لە نێوان ئەو لایەنانەی کە لە بازاڕی زانیاری نێودەوڵەتیدا بەشدارن. کەناڵی بومبێرگ بە نموونە، (٩٥٠) پەیامنێری لە ٧٩ نووسینگەی سەرانسەری جیهاندا هەیە و لەگەڵ کەناڵەکانی دیکەدا کەوتۆتە ململانێیەکی توند. سەرباری ئامرازەکانی میدیای چاپکراوی تایبەت و پسپۆر لە ئابووریدا، هەموویان دوایین هەواڵی ئابووری و ئاماری بازرگانی رادەگەیەنن کە بازاڕی جیهانی و دەزگای تێکەڵ و هاوبەش و حکوومەت و وەبەرهێنەران، بۆ راپەراندنی کاری ئابوورییان لە ئاستی نێودەوڵەتیدا پێویستیان پێی دەبێ.

لە ساڵی ١٩٩٠دا، گەشەکردنێك لە چەند وڵاتێکی ئاسیا (سەنگافوورە و مالیزیا و ئەندەنووسیا) کە رژێمی دیکتاتۆری حوکمڕانی دەکردن، دروستبوو. ئەو رژێمانە سانسۆریان خستبووە سەر چاپەمەنی نێودەوڵەتی وەك (ئاسیان وۆڵ ستریت ژورنال) و (فار ئیسترن ئیکۆنۆمیك ریڤیو) و (ئینترناشناڵ هیراڵد تریبون) بە هۆی ئەو هەواڵ و راپۆرتە وردانەی بڵاویان دەکردنەوە، کە لەگەڵ سیاسەتی ئابووری و سیاسییانەی ئەو وڵاتانەدا کۆك نەبوون. ئەو سانسۆرە تەمەن کورت دەبێ، چونکە لە سایەی سانسۆرو سەرکوتکردنی هەواڵدا گەلان ناتوانن لە ئابووری جیهاندا بەشدار بن. میدیایەك کە ئازاد بێ و یاساش بیپارێزێ، لە گواستنەوەی چالاکییەکانی سیستمی ئابووریدا کارا دەبێ، کە لە رێگەیەوە وڵاتان دەتوانن سەرمایەی بیانی بۆ خۆیان رابکێشن. وڵاتی چین بە نموونە، تا ئێستا میدیای ئازادی نییە کە بە وردی باس لە چاکە و خراپەی حکوومەت بکات بەتایبەتی لە بواری گەشەپێدانی ئابووریدا، بەڵام لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا رۆژنامەنووسان رۆڵێکی گەورە و کاریگەریان هەیە لە هاندانی وەبەرهێنانەدا،



ئەویش لە رێگەی رۆژنامەکانی (بارۆنز، فۆرچن، بزنز ویك، نیویۆرك تایمز، وۆڵ ستریت ژورناڵ)ەوە، چینیش لە گەنگەشەدایە لە بارەی بایەخی ئەوەی کە میدیای ئازادی هەبێ.

**– ململانێی رۆژنامەگەریی رۆژئاوا:**

لە ساڵانی شەڕی ساردا، گەنگەشەیەك لەئارادا بوو لە بارەی دابەشکردنی سیستمەکانی میدیای نێودەوڵەتی بۆ پێنج بەش: کۆمۆنیزم، دیکتاتۆرییەت، رۆژئاوا، شۆڕشگێڕ و پێشکەوتوو. کەچی لەم سەردەمەدا کە سەردەمی جیهانگیرێتییە، خەڵکانێك هەن میدیای نێودەوڵەتی دابەشی سەر دوو بەش دەکەن: دیکتاتۆری و رۆژئاوا. پێداگرتنی جاران سەبارەت بە مافی حکوومەت لە کۆنترۆڵکردنی لێشاوی هەواڵ و کۆت و بەندکردنی رۆژنامەنووس بەسەرچوو. گەنگەشەی ئەمڕۆ لە بارەی ئەوەیە کە هەواڵ و زانیاری بە چەشنی زانینەکانی دی، دەبێ رێ لە هاتنیان نەگیرێ، رۆژنامەنووسیش مافی ئەوەی هەیە لە هەر کوێیەك هەواڵی دەستبکەوێ، بڵاوی بکاتەوە و بەدواداچوونی بۆی هەبێ.

لە کۆتایی هاتنی شەڕی ساردەوە تێگەیشتنی رۆژئاوا بۆ رۆژنامەگەری و میدیای جەماوەری خۆی سەپاند و بووە تاکە مۆدێل لە جیهاندا، نەتەوەکانی دی (بێ لە نەتەوەکانی رۆژئاوا) جگە لەوەی زۆریان هەژارن ئامراز و پێداویستی ئەوتۆیان نییە تاکو رۆژنامەگەرییەکی کارای پێ دەستەبەر بکەن، رۆژنامەنووس لە نەتەوەی پاشکەوتوودا هەمیشە وێڵی دوای سەربەخۆیی و ئازادی پیشەکەی خۆیانن، چاویشیان لەوەیە ئەو سەربەخۆیی و ئازادییە لە حکوومەت بەدەستبێنن، ئیدی لە نێو ئەو نەتەوانەدا ئەرکی میدیا دەبێتە خزمەتکردنی حکوومەت، یان دەسەڵات. ئەم رۆژنامەنووسانە گەرەکیانە بەو جۆرەی دێتە دەست زانیاری بڵاو بکەنەوە، نەك وەك ئەوەی حکوومەت دەیەوێ. رۆژنامەنووسان لە سایەی حکوومەتی دیکتاتۆریدا دەیانەوێ دەنگیان بگاتە رۆژنامە گەورەکان بۆ ئەوەی هەواڵی گرنگ و هەستیاری خۆیانی تێدا بڵاو بکەنەوە وەك گەندەڵی دارایی، سەربەخۆیی و ئازادی لەم کارەدا دەبینینەوە.

ملیۆنەها مرۆڤ کەوتنە نێو چوارچێوەی (گوندی ئەلیکترۆنی)یەوە، ئەویش لە سایەی کەناڵی تەلەفزیۆنی ئاسمانی و کێبڵ کە لەگەڵ یەکدا لە ململانێدان. هەروەها ئەو ئیزگانەی بەرنامە بە شەپۆلی کورت بڵاو دەکەنەوە و ئینتەرنێتیش، لە رێگەی ئەو ساجەی پێوەندە بە مانگی دەستکرد و ئەنتێنەوە، تاکەکەس دەتوانێ لە هەر شوێنێکی جیهاندا تێکەڵ بەو گوندە ببێت. ئەو دکتاتۆرانەی حوکمی گەلانیان دەکەن، ناتوانن تا سەر، هەواڵ و زانیاری قۆرخ بکەن و رێگە لە هاتنی زانیاری لە دەرەوە بگرن. ناشتوانن رێ لە هاوڵاتیان بگرن لە بەدەستهێنانی هەواڵ و

زانیاری. سەرباری ئەوەی میدیای نێودەوڵەتی و فاکس و تەلەفۆن و ئینتەرنێت، ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری ئاسان کرد و سنوورێکی بۆ سانسۆری حکوومەت لەسەر هاتنی زانیاریدا دانا.

ئینتەرنێت و چاپەمەنی (رۆژنامە و گۆڤار و رۆژنامەی ئەلیکترۆنی) و ئامێری ڤیدیۆ کاسێت و کاسێتی تۆمار کراویش پاڵی بە تاکەکانەوە نا کە پەیوەندی لەگەڵ یەکدا بکەن و هەواڵ و بابەتی هەمەڕەنگ لە بارەی خۆیان ببینن، هەروەها گەیشتن بە ئەودیوی سنووری نەتەوەیی، ئامێری فۆتۆکۆپی و ئامێری دیکەی نوێ شۆڕشێکی سیاسییان لە نێو نەتەوەکاندا بەرپا کرد. ئەو میدیایەی بەرنامەکانی لە دەرەوە دێن هەواڵ و زانیاری بەو هاوولاتیانە دەگەیەنن کە دیلی دەستی حکوومەتەکانیان بوون، چونکە لەو کاتەی میدیای ئەو حکوومەتانە رێکلام و پڕوپاگەندەی بڵاو دەکردەوە، هاوکات دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی مافی مرۆڤیان پێشێل دەکردو هاوولاتی ئەشکەنجە دەدا و سیاسیانی نەیاری بەند دەکرد و مافی میدیای سەربەخۆی پێشێلدەکرد، کە لە هەوڵی ئەوەدا بوو یارمەتی هاوولاتیان بدات و بەو ئاراستەیەیان ببات کە لە پڕوپاگەندەی حکوومەت رزگاریان ببێ. میدیای رۆژئاواش لە هەوڵی بەردەوامدایە بۆ وازهێنان لەو پێشێلکاریانەی دژ بە مرۆڤ روو دەدەن.

زۆربەی ئەو فراوانبوونەی بەسەر دەزگاکانی میدیادا هاتن لە ئاکامی ئەو بایەخە زۆرە بوو کە بە هەواڵی ئابووری و دارایی دەدرا لە سایەی فراوانبوونی ئابووری جیهان و زۆربوونی جموجوڵی ئەو ئابوورییە. رۆژنامەی (وۆڵ ستریت ژورناڵ) پتر لە ۱۰۰ نووسینگەی لە دەرەوەی سنووردا هەیە بۆ پێڕاگەیشتن بە هەواڵی ئابووری لە ئاسیا و ئەوروپا، هەروەها بۆ بەدواداچوونی هەواڵەکانی دارایی و بازاڕەکانی دراو و پشکو گەشەکردنی باری دارایی و ئابووری دەوڵەتان، ئەم رۆژنامەیە پتر لە ۲۲٦ پەیامنێری لە ٦۲ دەوڵەتدا هەیە. ئاژانسی دەنگوباسی ئەمەریکا هەواڵەکانی جیهان رادەگەیەنێ، ئاژانسێکی دەگمەنە لە بوارەکەی خۆیدا، بە ملیۆنەها خوێنەر و گوێگرو بینەریان هەیە، کە پێشوازی لە هەواڵەکان دەکەن، رۆژانە ۲۰ ملیۆن وشە بڵاو دەکاتەوە و بریتین لە هەواڵ و شیکردنەوە و راپۆرت و راپرسی لەگەڵ هەزار وێنەدا، پتر لە ۹٥ نووسینگەی لە دەرەوەی ئەمەریکا هەیە، پەیامنێرانی کە بە درێژایی ۲٤ کاتژمێر کار دەکەن، ژمارەیان دەگاتە ٤۰۰ پەیامنێر. بۆ راپەڕاندنی کارەکانی، سوود لە مانگی دەستکرد و کێبڵ و ئیزگەو ئینتەرنێت وەردەگرێ، بۆ ئەوەی بەدرێژایی ۲٤ کاتژمێر هەواڵ بە هاوبەشانی بگەیەنێ.



ژمارەی ئەو هاوبەشانەی سوود لە خزمەتی ئاژانسی دەنگوباسی ئاسۆشێتد پرێس وەردەگرن دەگاتە ۸٥۰۰ هاوبەش کە لە وێنە و هەواڵدا هاوبەشن، ۳۳۰ هاوبەش کەناڵی تەلەفزیۆنین. ئاسۆشێتد پرێس پاش ئەوەی کادیران پێدەگەیەنێ و لە کاری رۆژنامەوانیدا قاڵیان دەکات، رەوانەی دەزگاکانی میدیایان دەکات، هەروەها بەرەو ئەوەش دەچێ پشت بە پەیامنێرانی بیانی ببەستێ، لە کۆی ٤۰۰ پەیامنێر تەنیا سیانیان ئەمەریکین. بە هۆی گەشەکردنی پیشەی رۆژنامەوانی، ئیدی ئاژانسەکانی هەواڵ عەودالی رۆژنامەنووسانی خۆجێیی بوون کە لە ولاتانی جۆراوجۆری جیهاندا پێگەیشتن، ئەوانە بەزۆری هەواڵ کۆ دەکەنەوە و بە چاکترین شێوە بەدوای رووداودا دەچن، چونکە ئەوان لە بارەی ولاتی خۆیان و زمان و سیاسەت و باری کۆمەلایەتی ئەوێ لە هەر کەسێکی دی شارەزاترن.

رۆژنامە هەمەجۆرە ئەوروپی و ئەمەریکییەکان پشت بە کادیرانی بیانی دەبەستن، بەڵام ئەو رۆژنامەیەی بەردەوام گەشەی کرد تا بووە ژێدەرێك بۆ راستگۆیی هەواڵ، رۆژنامەی (ئینتەرناشیوناڵ هیراڵد تریبیون)ی فەرەنسییە. (جیمس گۆردن بینێت) لە ساڵی ۱۸۸۷ دا، وەك کۆپییەك لە رۆژنامەی (نیویۆرك هیراڵد) بۆ ئینگلیزی زمانانی فەڕەنسا دایمەزراند. (ئینتەرناشیوناڵ هیراڵد تریبیون) بەهۆی کاری پیشەگەرانە و شێوازی گونجاوی دابەشکردنەکەی سەرکەوتنی وەدەستهێنا. رۆژانە بە شانزە لاپەڕە دەردەچێ و ۲۰۰ هەزار دانەی لە ۱۸۱ دەوڵەتدا لێ دەفرۆشرێ (تەنیا لە ئەوروپا ۱۳٥ هەزار دانەی لێ دەفرۆشرێ). لە ۸٥۰۰ کتێبخانەی ئەوروپا بۆ فرۆشتن نمایش دەکرێ، چاپی پاریس و هاگۆ و مەرسیلیا و رۆما و زیوریخی هەیە، بە فاکس و مانگی دەستکردیش بۆ چاپخانەکانی هۆنگ کۆنگ و سەنگافورە لە ئاسیاو بۆ میامی لە ئەمەریکا دەگوازرێتەوە، هەروەها بۆ ئەفریقا و رۆژهەلاتی ناوەڕاستیش. یەکەمین رۆژنامەیە لە مێژوودا کە لە یەك کاتدا لە چەندین شوێنی جیاجیا چاپ دەکرێ، بە گواستنەوەی لاپەڕەکانی لە رێگەی مانگی دەستکردەوە بۆ چاپخانە. وێڕای ئەوەی تا ئێستا رۆژنامەی هەرە ئەزمووندار و پڕ بایەخ و پڕ فرۆشە لەلای خوێنەرانی ئەمەریکا، هاوکات لەلایەن دیپلۆماتکارو سیاسەتمەدار و کارگوزار و رۆژنامەنووسانیشدا دەخوێنرێتەوە.

کۆمەڵە گۆڤارێکی ئەمەریکی هەن کە بەدەم خواستی خوێنەرانەوە دێن. گۆڤاری (تایم) و گۆڤاری (نیوزویك) کە بابەتی شایستە بەتایبەتی دەخاتە بەردەمی خوێنەرانی دەوڵەمەندی خۆی. گۆڤاری (تایم) لە کەنەداو ئەوروپا و ئەفریقا و رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا چاپی تایبەتی هەیە، هەروەها چاپی تایبەتی ئاسیا و ئەمەریکای لاتینیشی هەیە. ئەم چاپانە بە

خەسڵەتگەلێك دەرچوون کە بەدەم خواستی خوێنەرانەوە لە ٦٠ ناوچەی جیهاندا چوون. (نیوزویك) هەمان شت دەکات، لە هەر ژمارەیەکدا سەدان بابەت دەگۆڕێ، هەمووشیان لەگەڵ دانە لۆکاڵییەکەدا جیاوازن. رەنگە (ریدەرز دایگێست) گۆڤاری فرە خوێنەرو سەرکەوتوو ئەو بێ، کە ٧٤ چاپی نێودەوڵەتی بە ١٨ زمان دەردەکات، هەموو مانگێکیش ١٣ ملیۆن دانەی لێدەردەچێ، زۆربەی خوێنەرانیش درك بەوە ناکەن کە ئەم گۆڤارە رۆژنامەیەکی ئەهلی سەربەخۆ نییە.

## گۆڕانکارییەکانی سەروەری میدیای دەوڵەت:

سەبارەت بە چۆنێتی بەکارهێنانی ئامرازەکانی جیهانگیریەتی میدیا لە لاوازکردنی سەروەری وڵاتانی جیهان، پێویستە تەماشایەکی ئەرکەکانی وڵات بکەین، کە چۆن ئەم ئەرکانە بە هۆی جیهانگیرێتییەوە هەرەس دێنن یان تووشی گۆڕان دەبن، پێویستە جیاوازی لە نێوان چوار جۆری ئەرك بکەینەوە، یەکەمیان لە بارەی پرەنسیپ و بەها سیاسییەکانەوە، دووەمیان لە بارەی ئەو ئامرازانەیە بۆ پاراستنی ئەو بەهاو پرەنسیپە سیاسییانە، ئەو ئەرکانەش بریتییە لە: (ئەرکی بیروباوەڕی، پەرەپێدان، دابەشکردن هەروەها ئەرکی سزادان).

ئەرکی بیروباوەڕ بە مەترسیدارترین و گرنگترین ئەرکەکانی دەوڵەت دادەنرێ، کە لێیەوە دوو ئەرکی گرنگ سەرچاوە دەگرێ، ئەوانیش: ئەرکی پەیوەندیکردنی دەوڵەت و ئەرکی کوولتورییە. یەکەمیان بە مانا فراوانەکەی بریتییە لەوەی پێویستە لەسەر دەوڵەت یان دەسەڵاتی فەرمانڕەوا رادەیەکی دیاریکراو لە زانیاری ببەخشێتە تاکەکەسەکانی، واتە زانینی هەندێ پاشینەی کوولتوری پێش بڕیاردانی سیاسی، واتە تەوەرە راستەقینەییەکەی خولقاندنی پەیوەندییەکی مەعنەوی و فکری چەسپاوە لە نێوان تاك و دەوڵەتدا. بەڵام (ئەرکی کوولتوری) تەنها واتای پاراستنی بەهاو دابونەریتە بۆماوەکان نییە، بەڵکو بونیاتنانی کۆمەڵگەیەکی نوێیە و هەر گۆڕانکارییەك لە کۆمەڵگەدا دەبێ بەگوێرەی بەرنامەیەك بێ، کە تێڕامانیان تێدا کردبێ و بڕیاریان لەسەر دابێ و ویژدانی سیاسییان پێی رازی بێ. شۆڕشی گەیاندن بە هەموو دەستکەوتەکانییەوە هاتووە بۆ بەزاندنی سنووری نەتەوەیی و جەماوەری لۆکاڵی، ئەمەش وایکردووە دووبارە چاوخشاندنەوە بە گریمانە پێشووەکاندا بۆ تێگەیشتن و شیکردنەوەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان پێویست بێ، چونکە پەیوەندییەکان لە رێگەی کەناڵە حکوومییەکانەوە ئەنجام نادرێ بەڵکو بەسەرەوەی حکوومەتەوە تێپەڕ دەبێ، هەروەها



لە نێوان میللەتێك و میللەتێکی تردا نابێ، بەڵکو لە نێوان باکوورێکی دەوڵەمەند و باشوورێکی هەژاردایە.

پرۆسەی جیهانگیری ریشەی چۆتە قوڵایی هەندێ بوارەوە و سەروەرێتی نەتەوەیی وڵاتانی لە کەرتی میدیا و کوولتوردا بەزاندووە. بەمشێوەیە سنوورە ئاساییەکانی نێوان وڵاتان و سنووری شوێن و کۆت و بەندی جموجۆڵ و گەیاندنی بەزاندووە. بە شێوەیەك لە چوارچێوەی یەکگرتنی بازاڕەکانی جیهاندا لە بواری بازرگانی و وەگەڕخستنی سەرمایەی راستەوخۆ و گواستنەوەی سەرمایە و هێزی کار و کوولتور و تەکنەلۆژییەکان کۆت و بەندی کاتی کەمکردۆتەوە، ئەمەش لە چوارچێوەی سەرمایەداری و ئازادی بازاڕدا دواتر ملکەچکردنی جیهان بۆ هێزی بازاڕی جیهانی، ئەمەش دەبێتە هۆی بەزاندنی سنوورە نەتەوەییەکان و داکشانێکی گەورە لە سەروەری وڵاتان و تایبەتمەندی ئینتیمای کوولتوری و شارستانی بۆ نەتەوە یان نیشتیمانێکی دیاریکراو، بە هۆی بەکارهێنانی کیانگەلێکی میدیای زەبەلاحی سنووربەزێن، کە پلانەکەی وا دارِشتووە بۆ ئەوەی ئەو سنوورە ببەزێنێ و جۆرە پەیوەندییەکی تازە دروستبکات کە پێشێلی سەروەری وڵاتانی دیکە بکات بە ئاراستەی خزمەتکردن و بەدەستهێنانی بەرژەوەندی سیاسی وڵاتانی گەورە.

کارکردن بۆ کارکردنە سەر کۆمەڵگەکانی دیکە بۆ ئەوەی بێتە ژێر رکێفی جیهانگیرێتییەوە کە لەلایەن وڵاتێکی دەسەڵاتدارەوە ئاراستە دەکرێ، لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە وڵاتی دەسەڵاتدار لەو بڕوایەدایە نموونە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکەی راست و دروستن، بۆیە دەیەوێ بیکاتە بەهایەکی جیهانگیر. بەواتایەکی دیکە ئێمە لە رووبەڕووبوونەوەداین لەگەڵ هەوڵدان بۆ زاڵکردنی هەندێ بەهاو چەمك کە دەربڕی بەرژەوەندی و ئامانج و فەلسەفەی وڵاتێکی دەسەڵاتدارە کە سەرکردایەتی و ئاراستەکردنی سیاسەتەکانی جهانگیریەتی لە ئەستۆ گرتووە و هەوڵدەدات وڵاتانی دیکەی پێ داگیر بکات. بەگوێرەی ئەمە جیهان لە رووخان و دووبارە بونیاتنانەوەدا دەژی، لەهەمانکاتدا هەوڵدان لەئارادایە بۆ رووخاندنی ئەوەی کە لە دەوڵەتی نەتەوەییەوە هاتۆتە ئاراوە لە ماوەیەکی دوور و درێژەوە تا ئێستا، هەروەها بونیاتنانێکیش بەڕێوەیە، بەگوێرەی بیروڕای وڵاتی جیهانگیریکەر، ئەویش لەبەر پێویستی پەرەسەندنی رۆشنبیری. کەوابوو ئێمە لە بەرابەر ململانێیەکی شارستانیەتیداین کە ناوەڕۆکەکەی بریتییە لە شوێنخستنی کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکان بۆ یەك کۆمەڵگە بە هۆی کاریگەری فاکتەری تەکنەلۆژی و زانیارییەوە، ئەمەش بە واتای نەهێشتنی ناسنامەی نەتەوەیی ئەو کۆمەڵگەیانە

و داسەپاندنی ئەو بەهاو رەفتارانەی کە ریشەی قووڵی مێژوویی نییە لەناو ئەو گەلانەدا دێ.
لەبەر ئەوەی جیهانگیری رەهەندی جۆراوجۆری هەیە، بۆیە وڵاتی جیهانگیریکەر چەندەها جۆری ئامراز بەکاردێنن بۆ بڵاوکردنەوەی چەمك و بەهای جیهانگیری لەوانەی پێشخستنی ئامێرە تێکنەلۆژییەکان، دوای ئەویش بەکارهێنانی میدیا کە گرنگییەکەی لە ئامێرە تێکنەلۆژییەکان کەمتر نییە.

وەك دەزانین میدیا پەیامێکە لە نێوان نێرەر و وەرگرەوە، ئەم پەیامەش ناوەڕۆکێکی هەیە، ئامانجی نێرەر دروستکردنی جۆرە بڕواییەکە یان دارشتنی جۆرە وێنابینینێکە بەرابەر رووداوێك کە روویدابێ، یان بیروڕایەك بۆ رووداوێك ئامادە دەکات کە ئەگەری روودانی هەیە. بەمشێوەیە گوتاری میدیای جیهانی گرنگی خۆی لەوەوە بەدەستدێنێ کە بارودۆخێکی وەها دروستدەکات بۆ قبوڵکردنی ناوەڕۆکی نامەیەکی ئایندە. کەواتە ئێمە لەبەردەم ملکەچ کردنداین بۆ هەندێ پەیامی ناوەڕۆك جۆراوجۆر، کە مێشك بەرەو ئاراستەیەکی بیرکردنەوە دادەڕێژێ.

## کۆمەڵە میدیاییە نێودەوڵەتییە گەورەکان:

لەگەڵ پێشکەوتنی مەزنی تەکنەلۆژی کە گۆڕەپانی گەیاندن بەخۆوەی بینیوە سەرچاوە هەواڵییەکان بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر زۆربوون، بەڵام سەرچاوە سەرەکییەکان هێشتا کۆنترۆڵی خۆیان وەك سەرچاوەیەکی هەواڵی پاراستووە، گرنگترینیان: رۆیتەرز، ئەسۆشێتد پرێس (AP) کە دواتر بووە (APTN)، ئاژانسی هەواڵی فەرەنسی (AFP) و یونایتد پرێس ئینتەرناشناڵ (UPI) و فیزنیوز (VIS) و تۆڕەکانی ئاڵوگۆڕی هەواڵی وەك یۆرۆ فیزیۆن و ئینتەر فیزیۆن. هاوکات شەش کۆمەڵەی سەرەکی گەورە هەن کە لە چالاکی میدیایدا لەسەر ئاستی جیهاندا کار دەکەن و ئامادەبوونێکی نێودەوڵەتی گەورەیان هەیە و هەریەکە هێندەی توانای خۆی. چوار لەم کۆمەڵانە ئەمەریکین و یەکێکیان ئەورووپییە و ئەوی دیکە ئوسترالی ئەمەریکییە:

١- تایم وارنەر: گەورەترین دەزگای میدیاییە لە جیهاندا و فرۆشتنەکانی زیاتر لە ٢٥ ملیار دۆلارە کە سێیەکی لە ئەمەریکا، چاوەڕوان دەکرێ داهاتی لە دەرەوەی ئەمەریکاوە بۆ ٥٠٪ زیاد بکات، زۆر لە چالاکییە میدیاییە جۆراوجۆرەکانی لەخۆگرتووە، لەوانە:

٢٤ گۆڤار لەوانە (تایم).

- دووەم گەورەترین دەزگای بڵاوکردنەوە لە ئەمەریکا.



- تۆڕێکی تەلەفزیۆنی زەبەلاح و ستۆدیۆی بەرنامە و فیلمەکان و باڵەخانەی پەخشی سینەمایی (زیاتر لە هەزار شاشە) و گەورەترین تۆڕی کێبڵی تەلەفزیۆنی پارەدەر لە جیهاندا.
- کۆمپانیاکانی فیلم لە ئەوروپادا و زۆر لە دوکانە وردە فرۆشەکان.
- کتێبخانەیەکی گەورەی فیلم شەش هەزار فیلم و بەرنامەی تەلەفزیۆنی ٢٥ هەزار بەرنامە.
- هەندێ لە کەناڵە تەلەفزیۆنییە نێودەوڵەتییەکان وەك (CNHN، TNT، HBO).
- بەشداریکردنێکی زۆر لە کەناڵ و تۆڕە تەلەفزیۆنی یان بینینییەکاندا.

ژمارەی تەماشاکەرانی وێستگەی هەواڵی (CNN) زیاترە لە ٩٠ ملیۆن کەس لە ٢٠٠ وڵاتی جیهان، بەڵام (HBO) ملیۆنێك و ٢٠٠ هەزار بەشداربووی هەیە لە جیهاندا.

٢- کۆمەڵەی بەرتەلزمان: گەورەترین کۆمەڵەی میدیاییە لە ئەوروپا و سێیەم کۆمەڵەیە لە رووی گەورەییەوە لە جیهاندا، داهاتی ساڵانەی لە ١٥ ملیار دۆلار زیاترە، هاوپەیمانێتی و هاریکاری هەیە لەگەڵ زۆر لە کۆمەڵە میدیایە نێودەوڵەتییەکان لە ئەوروپا و ژاپۆنداو زۆر چالاکی هەیە، لەوانە:

- کەناڵی تەلەفزیۆنی لە ئەڵمانیا و فەرەنسا و بەریتانیا، سەرەڕای ستۆدیۆی سینەمایی جۆراوجۆر.
- کۆمەڵێ وێستگەی ئەورووپی.
- ٤٥ کۆمپانیای بڵاوکردنەوەی پەرتووك بە زمانە جیاجیاکانی ئەوروپا.
- زیاتر لە سەد گۆڤار لە ئەوروپاو ئەمەریکادا.

٣- کۆمەڵەی ڤیاکەم: کۆمەڵەیەکی میدیای بەهێزە لە ئەمەریکا، چارەکێکی داهاتی ساڵانەی کە لە دەرەوەی ئەمەریکا دەستدەکەوێ ١٣ ملیار دۆلارە، بە بەردەوامی سەرقاڵی خۆ فراوانکردنی نێودەوڵەتییە، هاوپەیمانێتی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری کۆمەڵە میدیاییەکان هەیە و چالاکییەکانیشی جۆراوجۆرە، لەوانە:

- ١٣ وێستگەی تەلەفزیۆنی لە ئەمەریکا سەرەڕای چەندەها تۆڕی پەخشکردنی ئاسمانی.
- کۆمپانیاکانی بەرهەمهێنانی تەلەفزیۆنی و سینەمایی و ڤیدیۆیی و موزیکی.
- کۆمپانیاکانی بڵاوکردنەوەی پەرتووك.

٤- دیزنی: گەورەترین کێبڕکێکەری کۆمەڵەی (تایم وارنەر)ەو داهاتی لە ٢٤ ملیار دۆلار زیاترە، لە بواری فیلمی منداڵاندا کارێکی باش دەکات و بە گەورەترین بەرهەمهێنی مادە

منداڵییەکان لە جیهاندا دادەنرێ، هەر لە رۆژهەڵاتەوە (چینەوە) تا ئەوروپا و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست تا دەگاتە ئەمەریکای لاتینی ئامادەبوونی هەیە، چالاکی جۆراوجۆری هەیە لەوانە:

- ستۆدیۆ فیلمی و ڤیدیۆییەکان و بەرنامە تەلەفزیۆنییەکان و تۆڕی (ABC) تەلەفزیۆنی زەبەلاح لە ئەمەریکا، وێستگەی جۆراوجۆری تەلەفزیۆنی و رادیۆیی.
- چەندین کەناڵی تەلەفزیۆنی نێودەوڵەتی وەك (DISNEY، ESPN)ی وەرزشی.
- بازاڕی بازرگانی لەژێر ناوی (دیزنی)داو، سەنتەرەکانی یاریکردن و رابواردن لە سەرتاسەری جیهاندا.
- دەزگاکانی بڵاوکردنەوەی پەرتووك.
- حەوت رۆژنامەی رۆژانە و سێ کۆمپانیای بڵاوکردنەوەی گۆڤار.

ئەم کۆمەڵەیە لەگەڵ دامودەزگا میدیاییەکان لە ئەوروپا و ئاسیا و ئەمەریکای لاتینیدا، هەروەها لەگەڵ کۆمپانیاکانی پەخشکردن و گەیاندنی فرەرەگەزیدا هاوپەیمانێتی هەیە. (مایك ئیزنەر) بەڕێوەبەری کۆمپانیای واڵت دیزنی دەڵێ: "زۆر شوێن هەیە لە جیهاندا بەو پرۆگرامانە رازی نابن کە ناوەڕۆکیان سیاسی بێ، بەڵام بەوانە رازی دەبن کە ناوەڕۆکی کارتۆنی سووکیان هەبێ وەك بەرهەمەکانی دیزنی کە بەگوڕێکی زۆرەوە دەیانەوێ".

٥- نیوز کۆپەرەیشن: پێنجەم کۆمەڵەی گەورەیە لە بواری میدیادا کە داهاتی دەگاتە دە ملیار دۆلار، بەڵام گەورەترین یاریزانی نێودەوڵەتییە لە بواری میدیا لە جیهاندا، کۆمەڵەی (رۆبەرت مەردۆخ پێنج)ی دامەزراند کە ئێستا خاوەنی سێ یەکێتی چالاکییە میدیاییەکانی لە سەرتاسەری جیهان، لەوانە:

- ١٣٢ رۆژنامەو ٢٥ گۆڤار لە ئوستڕالیا و بەریتانیا و ئەمەریکا (بە یەکێك لە سێ کۆمەڵە رۆژنامەگەرییە گەورەکان دادەنرێ لە جیهاندا).
- کۆمپانیای فۆکس بۆ بەرهەمهێنانی سینەمایی و تەلەفزیۆنی، تۆڕی فۆکس بۆ پەخشکردنی تەلەفزیۆنی، سەرەڕای ٢٢ وێستگەی تەلەفزیۆنی.
- تۆڕی ستار بۆ پەخشکردنی ئاسمانی بە دەوری جیهانداو، تۆڕی سکای بەتایبەتی لە بەریتانیادا.
- دەزگاکانی بڵاوکردنەوەی پەرتووك.

ئەم کۆمەڵەیە لە بواری میدیادا لەگەڵ کۆمەڵە میدیاییەکانی دیکەدا هاوپەیمانە، بنکەی سەرەکی لە شەش وڵاتدایە، کە چالاکییە جۆراوجۆرەکانی لێوە پەخش دەکرێ، بەتایبەتی



وڵاتانی ئوستڕالیا، بەریتانیا و ئەمەریکا. بە ئاڵۆزترین و فراوانترین کۆمەڵەی میدیایی لە قەڵەم دەدرێ و لە وڵاتانی چین و هندستاندا (سەرەڕای ئەوروپا و ئەمەریکا) دەستی باش دەڕوا. سەرکەوتوویی شێوازی کارکردنی دەگەڕێتەوە بۆ هاوبەشبوونی لەگەڵ لایەنە جێبەجێکارە ناوخۆییەکاندا، سەرەڕای خۆ دوورخستنەوە لە پێکداکێشانی بیروبۆچوونە سیاسییە ناوخۆییەکانی ئەو وڵاتانەی کە کاری تێدا دەکەن.

گرنگترین تایبەتمەندییەکانی ئەم کۆمەڵەیە، بریتییە لەوەی بە زۆر زمانی جیهانی پەخشی خۆی دەکات، بۆ نموونە کۆمەڵەی (FOX) لە ئەمەریکای لاتینیدا بەهەردوو زمانی ئیسپانی و ئینگلیزی پەخشدەکات. هەروەها دەتوانێ رۆڵی خۆی لە وڵاتە تازە گەشەسەندووەکاندا ببینێ و پێگەی خۆی تیادا جێگیر بکات، هاوکات سەرچاوەی هەواڵیی و بەرنامەیی تایبەت بەخۆی هەیە کە بریتین لە کۆمپانیای سەربەخۆ یان هاوبەش، سەرەڕای هەبوونی کەناڵی پەخشکردنی تایبەت بە خۆیان.

٦- کۆمەڵەی (TCT): تایبەتە بە پەخشکردنی تەلەفزیۆنی بەهۆی کێبڵ و مانگی دەستکرد لەمیانەی سیستمی بەشداریکردنەوە. لەم بوارەشدا بوونێکی بەهێزی هەیە، چونکە خاوەنی دوو مانگی دەستکردە بۆ پەخشکردن بە دەوری جیهاندا (نرخیان ٦٠٠ ملیۆن دۆلارە)، داهاتی ساڵانەی ئەم کۆمەڵەیە لە حەوت ملیار دۆلار زیاترە.

هەروەها دوو جۆرە کۆمەڵە میدیای نێودەوڵەتی دیکە هەن:

یەکەم: چالاکی میدیایی تیایدا بەشێکە لە چالاکییەکی فراوانتری کۆمپانیا سەرەکییەکە.

دووەم: کۆمەڵەی میدیایی بچووکتر لەرووی داهاتەوە، بەڵام ئیمپراتۆرییەتی میدیایین کە ساڵانە داهاتیان لە یەك ملیار دۆلار کەمتر نییە، لێرەدا ئەوانە کە دیارترن و لەسەر گۆڕەپانی نێودەوڵەتیدا زیاتر بوونیان هەیە بریتین لە:

١- یونیڤێرساڵ: (کۆمەڵەی سیگرامی نێودەوڵەتی) خاوەنیەتی و داهاتی کۆمەڵەی میدیایی تیایدا حەوت ملیار دۆلارە، ئەمەش نیوەی داهاتی کۆمپانیا سەرەکییەکەیەتی. بەرچاوترین چالاکییەکانی بریتییە لە بەرهەمهێنانی کاری سینەمایی و تەلەفزیۆنی و موزیکی و بڵاوکردنەوەی پەرتووك، کە خاوەنی ٢٧ پەرتووکخانەیە لە جیهاندا، لە ئەوروپا و لە رۆژهەڵاتی ئاسیادا بەدەسەڵاتە (بەنیازە ٢٠٠ ملیۆن دۆلار تا ساڵی داهاتوو لە وڵاتی چیندا بخاتە گەڕ).

٢- بوڵیگرام: کۆمپانیای فلیپسی بەناوبانگ خاوەنییەتی، کارە سەرەکییەکانی بریتین لە بەرهەمهێنانی سینەمایی و تەلەفزیۆنی، داهاتی لە شەش ملیار دۆلار زیاترە، نیوەی فرۆشتنەکانی لە ئەوروپا و چارەکێکی لە ئەمەریکایە.

٣- سۆنی بۆ رابواردن: بەشێکە لە کۆمپانیای زەبەلاحی سۆنی ئەلیکترۆنی ژاپۆنی، تایبەتمەندە لە بەرهەمهێنانی سینەمایی و تەلەفزیۆنی و موزیکی و پەخشکردنی ئاسمانی، داهاتی ساڵانەی لە ٩ ملیار دۆلار زیاترە، هاوبەش و هاوپەیمانێتی جۆراوجۆری هەیە لە ئەوروپاو ئاسیاو ئەمریکای لاتیندا.

٤- ژەنەراڵ ئیلیکتریك: لە کۆمپانیا گەورەکانی جیهانە تایبەتمەندە لە کەرەستە کارەباییەکاندا، خاوەنی تۆڕی (NBC) تەلەفزیۆنی و رادیۆییە، داهاتی زیاترە لە پێنج ملیار دۆلار، ئامادەبوونێکی نێودەوڵەتی و هاوپەیمانێتی جۆراوجۆری هەیە لەگەڵ کۆمپانیاکانی بەرنامە کۆمپیوتەرییەکانی مایکرۆسۆفت، ٥٠٠ ملیۆن دۆلاری خەرجکردووە بۆ خستنەگەڕی کەناڵێکی تەلەفزیۆنی هەواڵیی بە هۆی ئینتەرنێتەوە کە ئەویش کەناڵی (MSNBC)ە.

٥- کۆمەڵەی هۆڵنجەر (کەنەدا): خاوەنی چالاکییەکی رۆژنامەوانی فراوانە، خاوەن ٦٠ رۆژنامەی رۆژانەیە.

٦- تەلەفزیۆنی راستەوخۆی ئەمەریکی (دایرێکت تیڤی): ئەم کۆمپانیایە بریتییە لە کۆمپانیای پەخشکردن لە رێگەی مانگە دەستکردەکانەوە، کە خاوەن ١٤ مانگی دەستکردە لە جیهاندا و سەر بە کۆمپانیای (HUGE)ی ئەلیکترۆنی، کە بەشێکە لە (ژەنەراڵ مۆتۆرز). تەلەفزیۆنی دایرێکت پەخشی دەگاتە ١٠٠ وڵات و مۆرکی گشتی بریتییە لە جووڵاندنەوەی ئاسۆیی و هەوڵدان بۆ پەخشکردنی بەرنامەکانی لە رووبەرێکی فراوانتر لەسەر رووی زەوی، هەرچەندە بوونی ئەمەریکی بەسەر ئەم جووڵانەوەیە زاڵە. بە شێوەیەکی گشتی زۆر کۆمەڵەی میدیای هەن (لە ئەمریکا زیاتر لە ٢٠ کۆمەڵە هەن کە داهاتی ساڵانەیان لە یەك ملیار دۆلار زیاترە، نزیك بەوەش لە ئەوروپادا).

بەڵام چوار دەزگای میدیایی هەن لە ئەمریکای لاتیندا کە قەبارە دووەمن و لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی کار دەکەن، هاوکات لە ئاسیاو رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەزگای قەبارە دووی تیادا نییە، هەروەها ناوچە عەرەبییەکان رەوشیان لاوازترە. ژاپۆن سەرەڕای بەهێزی لە رووی ئابوورییەوە ئەوا لە رووی میدیایەوە لە رۆژئاوا دواکەوتووترە، جگە لە کۆمپانیای سۆنی،



دەزگای میدیایی نێودەوڵەتی ژاپۆنی دیکە نییە، سەرەڕای بوونی چەندین دەزگای میدیا (لە کۆی هەزار کۆمپانیا ٢٢٧ کۆمپانیای ژاپۆنی گەورەی تێدایە) بەڵام ئەم دەزگایانە جەخت لەسەر بازاڕی ناوخۆی ژاپۆنی دەکەنەوە، یەکێکیان (NHK)ەیە کە داهاتی لە شەش ملیار دۆلار زیاترە.

**پەشێوی هەواڵی نێودەوڵەتی:**

کەلێنی مێشکی میدیایی لەسەر ئاستی راپەڕاندنی سیاسەت و مومارەسە میدیاییەکان و ئاستی جیهانی و لۆکاڵی بەرز دەبێتەوە، لەبەر چەند هۆیەك گرنگترینیان ناهاوسەنگی لە کەمبوونەوەی زانیارییەکان لە باکوورەوە بۆ باشوور و چەسپاندنی ئاراستەی سەری تاکلایەنە بۆ میدیا لەسەرەوە بۆ خوارەوە، لە سەنتەرە نێودەوڵەتییەکان لە باکووری کۆنترۆڵکراوی تەکنۆلۆژیای پێشکەوتوو و زانین و کوولتوری میدیا بۆ لایەنە هەژارترینەکان لە باشوور و لە حکوومەتەکانەوە بۆ تاکەکان و گەلان و لە کوولتوری رۆژئاوایی زاڵبوو بۆ کوولتورە شوێنکەوتووەکان. لە سایەی شۆڕشی زانستی و تەکنەلۆژی و لە چوارچێوەی هەواڵە بەردەوامەکان کە هێزە کۆنترۆڵکراوەکانی بازاڕی جیهانی سەرکردایەتی دەکات لە پێناو جیهانگیریی کوولتور و فێربوون و ئایین و سەرجەم پێکهاتەکانی سیستمی شارستانی کە پێشتر پارێزگاری لە سەربەخۆبوونێکی رێژەیی دەکرد لە دەرەوەی بازنەکانی بازاڕی جیهانی و بەهاکانی و لە سایەی هەژموونی سیاسی و ئابووری دەزگا داراییە نێودەوڵەتییەکان و کۆمپانیا فرەرەگەزەکان و هەشت وڵاتە گەورەکە بە سەرکردایەتی ئەمەریکاو، لەسایەی ململانێی کوولتوری و شارستانیدا، کەلێنی مێشکی میدیایی دەردەکەوێ.

چیتر تەکنۆلۆژیای گەیاندن و زانیارییەکان بە تەنیا پێگەیەکی سەنتراڵی پێکناهێنێ لە تۆڕی بەرهەمهێناندا، بەڵکو پێگەی دڵ کار پێدەکات لە ستراتیژییەتی سەرلەنوێ پێکهێنانەوەی سیستمی پەیوەندییە نێوەوڵەتییەکاندا لەسەر ئاستی سیاسی نێوان حکوومەتەکان. ئەمەش بە هەرمێندان بەوەی ناودەبرێ بە (شەرعییەتی نێودەوڵەتی) و پێوەرە دووفاقییەکانی و لەسەر ئاستی کوولتوری لە نێوان کوولتورە جیاوازەکان بە بەرزراگرتنی پێگەی کوولتوری رۆژئاوایی و پەراوێزخستنی کوولتورەکانی باشوور. لەسەر ئاستی گەیاندن بە هەرمێندان بەوەی ناودەبرێ بە (گوندی گەیاندنی جیهانی) کە بەئەنقەست پشتگوێ دەخات جیاوازی زۆری نێوان رێژەکانی پەرەسەندنی میدیایی و گەیاندن لە نێوان بەشەکانی جیهان باکوور و باشوور ، جا لە رووی تەکنۆلۆژیای گەیاندن بێ یان لە تێرکردنی میدیایی.

لەگەڵ پەرەسەندنە زانستی و تێکنەلۆژییەکان کە جیهانی هاوچەرخ بەخۆوەی دەبینێ و وڵاتانی باکوور و ئیمپراتۆرییەکانی جیهانگیریی سەرمایەداری سەرکردایەتی دەکەن، فۆرمگەلی نوێ و رووبەڕووبوونەوەی بێ وێنە دەرکەوتن کە پەیوەستە بە هۆشیاری و بەها مرۆڤایەتییەکان و شێوازە رەفتارییە مرۆییەکان لە چوارچێوەیەکی شارستانی (سیاسی، ئابووری، کوولتوری) کە لە رێژەکان و جۆرێتی پەرەسەندن لە نێوان کۆمەڵگەکانی باکوور (کە خاوەنی کلیل و ئامرازەکانی پێشکەوتنی زانستی و تێکنەلۆژییە) لەگەڵ کۆمەڵەکانی باشوور زۆر لێکنزیکن. تێکەڵبوونی تەکنەلۆژی پەیوەندیکردن و زانیارییەکان و دەرکەوتنی فۆرمە نوێیەکانی تەکنۆلۆژیای گەیاندن وەك هۆکارە جۆراوجۆرەکانی میدیایی و ئامرازەکانی گەیاندنی کارلێکی و دەرکەوتن و بەکارهێنانی ئەوەی ناودەبرێ بە رێگەی خێرا بۆ میدیا و زانیارییەکان، هەموو ئەم پەرەسەندنە تەکنۆلۆژیانە و ئەو گۆڕانکارییانەی کە لەگەڵیدا هاتن لە بونیاتە کۆمەڵایەتی و پەیوەندییە ئابوورییەکان و ئەوەی لەسەریەوە رێکدەخرێ لە لابرنی بەربەستە سیاسی و ئابوورییەکان و کەمکردنەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت و هاتنە ئارای رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و ئاراستە بەرەو نا سەنتراڵی و جیهانگیریی گەیاندن و دەرکەوتنی مافە پەیوەندییەکانی سەرجەم توێژە کۆمەڵایەتییەکان لە دانیشتوانی گوند و شارەکاندا.

هەموو ئەم پەرەسەندنانە بە کۆمەڵ بوونە هۆی ناچارکردنی توێژینەوەکانی گەیاندن بۆ گۆڕینی رێڕەوەکەی و تەنانەت گۆڕینی ئاراستەکانی، هەروەها بووە هۆی سەرهەڵدانی ئاراستەگەلی نوێ کە کاریگەری راستەوخۆی هەبوو لە پاڵپشتی فیکری رەخنەیی هاوچەرخ لە بوارەکانی کۆمەڵناسی و ئەدەب و کوولتور و میدیا و گەیاندن، ئەم ساڵانەی دوایی دەرکەوتنی تێڕوانینی رەخنەیی جۆراوجۆری بەخۆوە بینی لە بارەی رۆڵی میدیا و گەیاندن لە ژیانی تاك و کۆمەڵەکان، ئەو تەنگژەیەی ئاشکرا کرد کە رووبەڕووی تێڕوانینە وەزیفییە ئیمبریقییەکان دەبێتەوە کە قوتابخانەی ئەمەریکی لە ساڵانی پەنجاکاندا دایمەزراند. دیارترین ئەم ئاراستانە جەخت لەسەر لێکۆڵینەوەی سەرجەم تیۆرەکان دەکاتەوە، کە پەیوەندی کاریگەری و کاریگەر پێ بوون دەردەخات لە نێوان میدیا و سەرجەم دیاردە کۆمەڵگەییەکان و کارلێکی نێوان زانستی گەیاندن لەگەڵ کۆمەڵناسی و زانستی مرۆڤایەتی، ئەو تێڕوانینانەی پشت دەبەستێ بە تایبەتمەندی کوولتوری و کۆمەڵایەتی لە چوارچێوە مێژووییەکەی، شوێنی ئەو تێڕوانینانەی گرتەوە کە ئاراستە و مۆرکی گشتاندنی هەیە، کە جەخت دەکاتەوە لەسەر یەکە دەستەیی و



تاکییەکان و لاگیری دابەشکردنی دیاردە میدیاییەکانە بۆ دەستەگەلی داخراوی دابڕاو لە چوارچێوە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکەی. هەرچەندە کۆ دەنگییەك هەیە لە بارەی بایەخ و ئەرکەکانی میدیا و گەیاندن، بەڵام هێشتا کۆدەنگییەك دروست نەبووە لە بارەی دیاریکردنی چەمك و چوارچێوە تیۆرییەکانی و هێشتا ئاراستەیەکی باو هەیە کە سوورە لەسەر پێناسەکردنی میدیا بە پێوەری جێبەجێکردن و بەکارهێنانەکانی، زیاتر وەك لە پەیوەستبوونی بە چوارچێوە تیۆرییەکان کە لێیەوە دەرچووە و رێگەمان پێدەدات بە رەخنەگرتن و هەڵسەنگاندنی ئەم بەکارهێنانە.

دەکرێ دووپاتکردنەوەی گرنگی دەستەبەربوونی چوارچێوە و دەروازە تیۆرییەکان لە توێژینەوەکانی میدیا و گەیاندن، لە درك کردنمانەوە بێ بۆ پێویستی تیشك خستنە سەر ئەو جیاوازیانەی کە لە نێو ئەم نەسەقە زانینەدا هەیە لە پێناو گەیشتن بەسەرلەنوێ بونیاتنان و پێکهێنانی تۆڕێکی وا کە ئەو ماناو ئاماژانە دەیخولقێنێ و لەمیانەیەوە کاریگەر دەبێ لەسەر شێوازە رەفتارە مرۆییەکان، ئەمەش وەك هەوڵێك بۆ ناسینی توانا فێرکارییەکانی میدیا و ئاشکراکردنی رۆڵەکەی لە خولقاندنی شێوازە دیاریکراوەکان لە رەفتاری مرۆیی و پەراوێزخستنی شێوازەکانیتر، بەرزڕاگرتنی پێگەی کوولتورێك لەسەر حیسابی کوولتورەکانیتر یان هەڵبژاردنی سیستمێکی بەهاکان کە سەر بە کۆمەڵگەکانی باکوورە لەسەر حیسابی سیستمی بەها دەرچووەکان لە چوارچێوەی شارستانی لە کۆمەڵگەکانی باشوور. دۆزینەوەکانی بواری تەکنۆلۆژیا شێوازی کۆکردنەوە و پەخشکردنی هەواڵی بیانی و شێوازی پێشوازیکردنی هەواڵیشی گۆڕی، جاران پەیامنێر دەبوو لەو دەوڵەتە بیانییەدا بمێنێتەوە کە هەواڵەکانی ئەوێی بە پاپۆڕ یان بە پۆستە بۆ کەناڵە میدیاییەکەی بناردایە، بەڵام ئەمڕۆ لە سایەی تەکنۆلۆژیای پێشکەوتووەوە دەزگاکانی میدیا زۆر بە فراوانی هەواڵباران دەکرێن. ئەمڕۆ پەیامنێر وێرای مۆبایل لاپتۆپ بەکاردێنێ کە بە ئینتەرنێتەوە گرێدراوە و نوێترین هەواڵی دونیای دەستدەکەوێ، بەمەش لە خەڵکی دانابڕێ، ئەم خەسڵەتە لە گەیشتندا دەمودەستییەکی دایە هەواڵی نێودەوڵەتی کە پێشتر نەیبووە.

سەبارەت بە راپۆرتی تەلەفزیۆنی، ئێستا گرنگترین کەناڵە ئاسمانییەکان پشت بە سیستمی مانگی دەستکرد دەبەستن، کە خێرایی و توانایەکی زۆر چاکی هەیە لە بواری گواستنەوەی نیشانەکانی تەلەفزیۆن، شەپۆلی بەرەو هەمەجۆر کەس دەچێت، سەبارەت بە راپۆرتی زیندوو لە رێگەی مانگی دەستکردەوە، پێشوازی لە کاردانەوەکانیان دەکات، ئەم جۆرە ناردنە دەکرێ ببێتە جێگرەوەی ناردنی ئاسایی. رۆژنامەگەریش سوودی لەو پەرەسەندنە خێرایەی بواری

مۆبایل وەرگرت، ئیدی هەموو نووسەرێك لە توانایدا دەبێ هەردەم لـە پەیوەندیـدا بـێ لەگـەڵ نوێنەران و ڕۆژنامەنووساندا، هەرچەندە ماوەی نێوانیان دووریش بێت یان ئەگەر پێویستی کـرد بە مۆبایل هەواڵ بەدەستبێنێ. ئامێری دیجیتاڵیش ئامرازی گرنگە لەبەردەستی ڕۆژنامەنووسدا بۆ ئەوەی ئەرکەکانی بەجێ بێنـێ، بـە هـەزاران لیـستی زانیـاری دیجیتـاڵی بـە دەق یـان بـە کۆمپیوتەر کۆ دەکرێنەوە، بایەخی کۆکردنەوە و ناردنی زانیاری بەم شێوازە رووی لە زیـادبوون کرد، مەودا هیچ بایەخێکی نەما بۆ پەیامنێر. جۆرێکی دیکەی بەکارهێنانی مانگی دەستکرد لەوەدا خۆی دەنوێنێ کە یارمەتیدەرە بۆ بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەگەری نێونەتەوەیی و ڕۆژنامـەی نێودەوڵـەتی، لاپـەڕەکانی هەنـدێ ڕۆژنامـەی ڕۆژانـە یـان هەفتانـە بـە مـانگی دەسـتکرد دەگوازرێنەوە و ڕەوانەی چاپخانە دەکرێن، بۆ ئەوەی لە هەمەجۆر شوێنی جیهان چاپ بکرێن و لە یەك کاتدا لە وڵاتە دەستنیشانکراوەکاندا دەستبکەوێ.

ئامرازەکانی میدیا ئاوێنەن و وەك ئاوێنە وێنە هەڵدەگرن و ڕاست و دروسـت دەیخەنـە بـەر چاوی هاووڵاتیان، تا ئەوان هەرچۆن بیانەوێ ڕووداوەکان لێك بدەنـەوە. لـە وڵاتانـانی ڕۆژئـاوا بۆچوونێکی باش لە بارەی ئامرازی میدیای گشتی هەیە کـە ئـەو ئامرازانـە دەتـوانن و دەبـێ ڕووداوەکان بە شێوەیەکی بێلایەنانە تۆمار بکەن و بە خوێنەر و بیسەر و بینـەری ڕابگەیـەنن، بێ ئەوەی سانسۆر یان پڕوپاگەندە بکەن. بۆ ئەوەی ئامرازەکان ئەو ئەرکە بەدیبێنن، پێویستە، سەربەخۆ بن لە دەسەڵات. ڕۆڵی هەواڵ و ئامرازی کات بەسەربردن لـە جیهانگیریـدا ڕەهەنـدی دروستی خۆی دەپارێزێ. هەواڵ، بە چەشنی سیاسەت، بۆ جیهان شتێکی گەوهەرییە. خـەڵکی لە هەموو شوێنێکی جیهان بایەخ بەو ڕووداوانە دەدەن کە لە دەوروبـەریان ڕوودەدەن، هـەواڵی گرنگ کەناڵەکانی میدیای تەنیوەتەوە، هەواڵ و زانیاری بەسوود پێشدەکەوێ هاوکات هـەواڵی پڕوپوچیش بڵاو دەکرێتەوە، جا چ باسی دەوروبەر و ناوخۆ بکات، یان ئەوانەی پێوەندیـدارن بـە ژیانی ڕۆژانەی تاکەکانەوە.

لەگەڵ هاتنە ئارای شۆڕشی زانیاری و گەیاندندا، ئەو لایەنانـەی کـە خـاوەن ئامرازەکـانی میدیا و کەرەستەکانی بەرهەمهێنانی ماددە میدیاییەکانن وەك وڵاتانی ڕۆژئاواو لە پێشەوەیان ئەمەریکا دەستیان بە قۆرخکردنی میدیا کرد، ئەمەش بواری بۆ بـە لێـشاوهاتن و خنکانـدنی میدیایی بە یەك ئاراستەدا ڕەخساند، بۆیە جیهانی یەکەم بووە نێـرەر و جیهـانی سـێیەم بـووە وەرگر، کە وایکرد لە سەرەتای ئەم سەدە نوێیەدا میدیای ڕۆژئاوا لە گواستنەوەی بابەتییانـە و بێ لایەنانەی هەواڵ خۆی بدزێتەوە، بۆیە دەستیکردووە بـە گواسـتنەوەی ئـەو بابەتانـەی کـە



ناوەڕۆکی پڕوپاگەندەیی و سیاسییان پێوەیە و مەبەستدارن، هەروەها بڵاوکردنەوەی کوولتـور و بەهاو سیستمەکانی خۆیان.

لێکۆڵینەوەکان ڕەنگدانەوەی پرسی پشێوی هـەواڵییان دووپـاتکردەوە، بـوونی کێـشەیەکی میدیایی کەڵەکە بوو کە خۆی لە هەڵقوڵانی ناهاوسەنگی زانیارییـەکان بـە یـەك ئاراسـتە لـە وڵاتـانی پێـشکەوتوو بـۆ وڵاتـانی جیهـانی سـێیەم دەنـوێنێ و بـوونی ئـەم کێـشەیە پاشـان چارەسەرکردنی پەیوەستە بە حاڵەتی ئابووری و توخمی مرۆیی کە دوو خەسڵەتن بە شـێوەیەکی گشتی زۆر لـە وڵاتـانی جیهـانی سـێیەم بەدەسـتییەوە دەنـاڵێنن. نایەکـسانی چـەندێتی لـە هەڵقوڵانی هەواڵە نێودەوڵەتییەکان دەرەنجامێکی لۆژیکیانەی سروشتی ئاژانسە جیهانییەکان و ڕۆڵەکانیانـە، کـە ئاژانـسە گـەورەکانی هـەواڵ، کۆکردنـەوەی هـەواڵ و دابەشـکردنیان لـە چوارچێوەیەکی نێودەوڵەتی قۆرخ کردووە. سەبارەت بە جیاوازی چۆنێتی هەواڵەکان، گـرنگترین هۆکارەکانی دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی پیادەی پرۆسەی گەیاندن و پرۆسـەی دوورکەوتنـەوەی بـە ئەنقەست، ئەو پیادە و کۆتوبەندانەی هەندێ لە وڵاتانی جیهانی سێیەم دەیسەپێننە سەر چـوون و بۆ هاتنی هەڵقووڵانی هەواڵەکان.

ئاژانسەکانی هەواڵی جیهانی هەر لە سەرەتای دروستبوونیانەوە کاریگەرییەکی ڕوونیان هەیـە لە دەستنیشانکردنی چەمك و بەها هەواڵییەکان، هەروەها گرنگی ڕێژەیی بۆ جـۆرە جیاوازەکـانی هەواڵ و ئاژانسە هەواڵە ڕۆژئاواییە گەورەکان لە ڕووی چـەندێتییەوە کـۆنترۆڵی بـازاڕی جیهانیـان کردووە؛ بەتایبەتی بۆ وڵاتانی تازە گەشەسەندوو. بـەجۆرێك ئەجینـدای ئـەو وڵاتانـە و تەنانـەت هەموو جیهانیش دادەنێ. ئەوەی بە تێڕوانینی ئەم ئاژانسە سەرەکییانە گـرنگ بـێ، بـۆ هـەموو وڵاتانیتر گرنگ دەبێ. بۆیە پرۆسەی پێشکەشکردنی هەواڵەکان دەوەستێتە سـەر تێڕوانینـی ئـەم ئاژانسانە و بایەخەکانیان کە هەوڵدەدات بە گواستنەوەی بۆ هەموو وڵاتانیتر بەوپێیەی سەرچاوەی سەرەکی ئەم هەواڵانەیە کە ناکرێ دەستبەرداری بین، هەروەها ناکرێ گومـان لـە ڕاسـتگۆییەکەی بکرێ و بە ئاژانسە هەرێمییە بچووکەکان بەراورد بکرێت.

پشێوی چەندێتی لە هـەڵقوولانی هەواڵـە نێودەوڵەتییـەکان، دەرەنجـامێکی لۆژیکییـە بـۆ سروشـتی ئاژانـسە جیهانییـەکان و ڕۆڵیـان، کـە نـاکرێ دەسـتبەرداری سیاسـەت و شـێوازی کارکردنیان بن، بەڵام سەبارەت بە جیاوازی چۆنیەتی لە هەڵقولانی هەواڵەکان، کاریگـەری ئـەم ئاژانسانە لە دەستنیشانکردنی چەمکی هەواڵ و دانانی پێوەرە تایبەتییەکانی چـییەتی هـەواڵ دەردەکەوێ کە، بەپێی ڕۆڵەکەی لە دەرەنجامی پێداویـستی و پێوەرەکـانی هـەر کۆمەڵگەیـەك

جیاوازە. ئاژانسەکانی هەواڵ لە شێوازی دابەشکردنی ئامرازەکانی گەیاندن بۆ پەیامنێرانی، بەمەبەستی تەغتییەکردنی رووداوە گرنگەکان کاریگەر دەبێ. هەروەها بە بەرژەوەندی ئەو وڵاتانەی کە سەر بە ئەوە یان کاری تێدا دەکات کاریگەر دەبێ و لاگیری خزمەتکردنی کارمەندانێتی لە ناوخۆدا و ئەوانەی کە لە چوارچێوەی هەژمونی دەوڵەتدان کە ئاژانسەکە سەر بەو وڵاتەیە. لە سەرەتای هەفتاکانەوە هەندێ لە وڵاتانی جیهانی تازە گەشەسەندوو درکیان بە جۆرێك لە پاشکەوتوویی میدیایی کرد کە لە کۆنترۆڵکردنی ژمارەیەکی کەم لە وڵاتانی رۆژئاوای پێشکەوتوو لەسەر پیشەسازی ئامرازەکانی میدیا و خاوەنداربوونی بۆ کادیرە مرۆییە بەهرەمەندەکان و شیاو بۆ کاری میدیایی خۆی دەبینێتەوە، سەرەڕای بەرزبوونەوەی ئاستی تەکنۆلۆژیا و کارکردن بۆ فراوانبوون لە کردنەوەی بازاڕگەلی نوێی ماددە میدیاییە رۆژئاواییەکان ئەمە وێرای کاریگەری سیستمی ئابووری و کۆمەڵایەتی رۆژئاوا کە هانی گەشەی ئەم دیاردەیە دەدات.

ناهاوسەنگی لە هەڵقوولانی نێودەوڵەتی بۆ ناوەڕۆکی میدیایی بە (داگیرکاری میدیایی) ناودەبرێ، لەبەر زیادبوونی پشتبەستنی ئامرازەکانی میدیا لە وڵاتانی تازە گەشەسەندوو بە وڵاتانی رۆژئاوایی، دەکرێ وا لەم داگیرکارییە میدیاییە بڕوانرێ کە جۆرێك لە شوێنکەوتوویی میدیایی بۆ وڵاتانی جیهانی یەکەم پەیدا بووە، لەبەر ئەوەی تەنها هەڵقوولانێك نییە بۆ بەرنامەگەلێکی دیاریکراو، بەڵکو لەبەر پێویستی شیکردنەوەی قووڵ و لێکۆڵینەوەی رۆڵی هێز و فاکتەرە پەیوەستبووەکانە بە پەیوەندییەکانی نێوان وڵاتان، چونکە ئەم پەیوەندییانە وای لێهاتووە تا مەودایەکی دوور دەستنیشانی ناوەڕۆکی مادەی هەواڵە پێشکەوتووەکان لە وڵاتێکەوە بۆ یەکێکیتر دەکات. ئەم نایەکسانییە وایکردووە وڵاتانی جیهانی سێیەم پەنجەی تاوان بۆ وڵاتانی پێشکەوتوو درێژ بکەن، بەوەی رێی تێناچێ جیهان بۆ دەستەیەکی دیاریکراو دابەش ببێ کە توانای گەیاندنی دەنگی بۆ جیهان هەبێ لەبەر ئەوەی ئامرازی پێویستی لەمبارەیەوە هەیە و دەستەیەکی ژمارە زۆرتریش ناتوانێ ئەم کارە بکات کە لەگەڵ بەندەکانی مافی مرۆڤیشدا رێك ناکەوێ. کاریگەری شوێنکەوتوویی کەڵەکەبوویی و فیکری و میدیای مەترسییەکەی کەمتر نابێ لە کاریگەری پاشکەوتوویی ئابووری و ملکەچبوونی سیاسی و سەربازی، بەڵکو زۆرجار هۆکاری سەرەکییە بۆی.



## شارستانییەتی وێنە:

لە جیهانێکدا کە ئامرازەکانی گەیاندنی تیا پێشکەوتووە بە هەموو تەکنیکە بەکارهاتووەکانی، کەچی گەیاندنی هەستی و کۆمەڵایەتی تێیدا ونە، ئەمەش ئەو جیاوازییەیە کە مرۆڤی جهانگیریەتی تێیدا دەژی. ئەوەتا سەرەڕای رادەی جۆراوجۆرێتی ئامرازەکانی بۆ پەیوەندیکردن بەویتر بەهەمان رادە وا هەستدەکات جیهانە تایبەتییەکەی رۆژ بە رۆژ لێی تەسك دەبێتەوە، لەهەمانکاتدا وا هەستدەکات لە نێو فەزایەکی بێ سنووردا شەپۆل دەدات. ئەمە ئەو بەهایەیە کە هاوڕێیە لەگەڵ ئەو برە زۆرەی وێنە یەك لە دوای یەکەکان و لە سایەی نەبوونی مانادا مرۆڤ دەتوانێ ئەو بڕیارە بدات کە زیاتر وەڵامدەرەوەی غەریزەکانیەتی، بە هۆی ئەم کاریگەرییە راستەوخۆیەی وێنە ئاماژە بەهێزەکان بە رەچاونەکردنی ئەوەی راستی یان ساختەیە، چەندین بڕیاری ترسناك لە بارەی ژیانی وڵاتان و گەلان لە ژێر کاریگەری وێنەی ساختەی بینراو دراون، ئەوەی پشتبەستنی بە وێنەی ساختە لە دەست رۆیشت پەنا بۆ وێنەی راستیی دەبات و دەیشێوێنێ بۆ ئەوەی لەگەڵ بارودۆخ و پرسەکان گونجاو بێت.

لێرەوە هۆشداری ئەوە دەدرێ بۆ مامەڵە نەکردن لەگەڵ وێنە بەوەی ئاماژەی راستەقینە بن هەروەك پێشتر لە کاتی دروستبوونی وابوو بەوەی ئامرازێکی میدیاییە و رۆڵێکی بەرچاوی بینیوە لە ناساندنی راستییەکان کە ویستویەتی بیسڕێتەوە. ئەمە مانای وا نییە کە وێنە رۆڵە میدیاییەکەی لەدەست داوە بەپێچەوانەوە، لەبەر ئەوەی وێنە رۆڵێکی گرنگ دەگێڕێ لە میدیادا بۆیە بۆتە جێی یاری پێکردن و شێواندن، چەندین وێنە بۆتە هۆی وەرچەرخانی گەورە بە هۆی ئەو رووداوانەی کە هاوێنەی وێنەگرەکان توانیویانە خۆیانی پێ بگەیەنن، تەکنیکی یاریکردن بە وێنە و بەکارهێنانی لە چەسپاندنی تێڕوانینێکی دیاریکراو پێشکەوتووە، لێرەوە جەخت لەسەر پێویستی ئەوە دێتە کایەوە کە وێنە لە روخسارییەوە هەڵنەسەنگێنرێ و پێویستە لە تەکنیکی خوێندنەوەی وێنە و تێگەیشتنی بزانرێ تاکو بینەر توانای جیاکردنەوەی شتی باشی لە خراپ هەبێ.

لە تێڕوانینی بیرمەندی فەرەنسی (ریجیس دوبریە) ئێمە لە سەردەمی وێنە، سەردەمی بواری تەلەفزیۆنیدا دەژین، ئەگەری لەدەستدانی بیناییمان هەیە، تووشی کوێری هاتووین بە هۆی زۆریی ئەو وێنانەی پیشانمان دەدرێ، بەجۆرێك نازانین لەکوێوە دێ و مانای چییە و بۆچی بەکاردێ، هونەریش تەنیا وەك پۆلێنێکی لێهاتووە نەك تاموچێژ بە بینین، بەڵکو تەلەفزیۆن قووتی دەدات بێ ئەوەی هەرس بکرێ، سینەماش سەرەڕای پێزانینەکەی پەراوێز دەخرێ، بەمەش سەرەڕای وریاییمان ئەگەری تووشبوونمان بە نابینایی و جیا نەکردنەوەیەکی گشتگیر

هەیە. ئەوەی (دوبریە)ی نیگەران کردووە ئەو لێشاوە هەڵقوولاوە بێ پچڕانەی وێنەی تەلەفزیۆنییە، کە وایکردووە وێنە لەهەر پەیوەستبوونێك بەهەر راستییەکی هێمای یان ئایینی دابماڵرێ، بەمەش سەربەخۆ دەبێ و لە پرەنسیپی واقیعییەت دەربازی دەبێ.

(دوبریە) پێیوایە سەردەمی وێنەی ئەلیکترۆنی پەلە دەکات لەوەی بیرمەندان بخاتە ژێر رکێفی خاوەن سەرمایەکان و ئیمپراتۆرییەتەکانی دەزگا میدیاییەکان، لە سایەی دیموکراسییەتی میدیایی خامە تەمبەڵەکان دەبنە پێشەنگ لەسەر شاشە بچووکەکە. (دۆبریە) دەڵێ: "سەرەڕای وریاییمان لەوانەیە تووشی نابینایی بین بە هۆی زۆر تەماشاکردنەوە، کاتێك هەموو شتێك ببینین ئەوا هیچ شتێك بەهای نامێنێ". بەمەش وتەکەی (جان جاك رۆسۆ) بە راست دانانرێ کە دەڵێ: "کەم تەماشاکردن وات لێدەکات کە ئەندێشەت زیاتر ببێ". لە سەردەمی وێنەی ئەلیکترۆنی مرۆڤ لەگەڵ ئەوەی دەیبینێ رادێ و لە روانگەی ئەوەی بەها بوونی نابێ کە دەبینێ کاتێك هەموو شتێك دەبینرێ، هیچ شتێك بەهای نامێنێ، بۆیە سەیر نییە کە مرۆڤ تووشی کوێری بێ لە جیهانێکدا کە بینایی لە دەستدابێ. بە بڕوای (بول فیریلیۆ) فەیلەسووفی فەڕەنسی، سەردەمی وێنە سەردەمی بۆ هەڵبەستە و لەگەڵ دوبریە لەوەدا کۆکە کە کەس لە بارەی سەردەمی وێنە (سەردەمی جەنگی میدیایی) هیچ نازانێ کە لە پڕێکدا وا خۆمان لەبەردەم خێرایی رووداوەکانی دەبینینەوە کە فۆرمێکی تۆقاو وەردەگرێ و تێڕوانینمان بۆ جیهان وێران دەکات، ئەمەش نهێنی سەردەمی جەنگی میدیاییە کە لە ناوچە جیاجیاکانی جیهاندا بەردەوامە، ئەمەش (فیریلیۆ)ی هاندا بڵێ براوە لە جەنگەکانی ئایندە ئەوەیە کە شەپەنگی ئەلیکترۆموگناتیسی بە شێوەیەکی باشتر بقۆزێتەوە و دواتر نابینینی دروستبکات کە هەر زوو دەبێتە مایەی کوێری و لەدەستدانی هەستی بینین و ئاراستەکردن.

**مێژووی هەژموونگەریی وێنە لە ئامرازەکانی میدیادا بە سێ ناوەندا تێپەڕ دەبێ:**

١- ناوەند (بازنە)ی وتن: بریتییە لەو ماوە دوور و درێژەی کە مرۆڤایەتی پێیدا تێپەڕ بووە، هەر لە سەرهەڵدانی نووسینەوە تا سەرهەڵدانی چاپ کە بریتییە لە سەردەمی (لاهوتی- خواوەندی)، نووسین لەلایەن خواوەندەکانەوە، بزماری بێ یان هێرۆگلێفی واتایەکی بەهێزی تێدایە، خواوەند فەرمان دەفەرمووێ و مرۆڤیش دەینووسێتەوە، هەروەها بەو فرمانانە فرمان دەداتەوە، خوێندنەوەش بە لێوەکان ئەنجامدەدرێ و بە شێوەی کۆمەڵ کۆمەڵ، پاشان ئایینە گەورەکان هاتن بۆ ئەوەی ئەو سروشە زارەکییە بهێننە سەر شێوەی نووسین، هەموویان یەك



سروشن و زیاتر نین، تەورات، ئینجیل و قورئان، لێرەوە پیرۆزیی زمان و یەکبوونی توانای خواوەندی لە قسەکردندا دەردەکەوێ.

٢- ناوەندی نووسین یان سەردەمی چاپکردن: لێرەدا وێنەکان سەر بە دەقەکان دەبن و نووسەریش وەك راگەیەنەرێکی راستی دەردەکەوێ، لەگەڵ هەبوونی سەرچاوەی نووسراوی زۆردا.

٣- ناوەندی تەلەفزیۆنی یان سەردەمی ئەلیکترۆن: ئەمە وایکرد لە کتێب کە لە پایە هێماییەکەی خۆی بێتە خوارەوە، هەرچەندە لەم سەردەمەدا گوێگرتن رۆڵی خۆی هەیە، بەلام ئامێرەکانی بینین دەسەڵاتی خۆیان هەیە، ئەمەش پێچەوانەیە لەگەڵ هەبوونی توانای تەواو و دانپیانراودا بۆ ئەو شتانەی کە نەبینراون (خواوەند، مێژوو، ژیری).

وێنە لە چەمکە گشتییەکەیدا تەنها دەربڕینێکی بینینی و داهێنانە کە رێچکەی ئەندێشە و قسەکردن و بیرۆکە و مانا پێدانێك دەگرێتە بەر کە لەو ژینگە کوولتورییە وەرگیراوە کە تیایدا گوتاری وێنە تیایدا دەجوولێتەوە، کە بە جیاوازی وێنەکان و جیاوازی پەیوەندی بەردەوام کە لەگەڵ وێنەکەدا روودەدات دەگۆڕێ. بۆشاییەك هەیە لە نێوان ئەو وێنەیەی کە لەسەر شاشە دەردەکەوێ و ئەو وێنەیەی کە بینەران لەشوێنەکانیتر دەیبینن، پەیامی تەلەفزیۆنی پەیامێکە ئامانجەکەی داخرانێکی ئایدۆلۆژییە پەیوەستە بە مەبەستی نێرەر بۆئەوەی بینەر وا لێبکات کە تەنیا لەو چوارچێوەیەدا شتەکان ببینێ و کاریگەری هەبێ بەسەریدا. کاتێك کە تەماشای تەلەفزیۆن دەکەی هەموو توانای مێشکت بەکاردێنی بۆ پێکهاتنی وێنەیەك لە هزرت کە هەڵقولاوی وێنە تەلەفزیۆنییەکەیە بە شێوەیەکی کاریگەر، بەمجۆرە ئەو وێنە تەلەفزیۆنییە جێگەی ئەو وێنە پێشووە دەگرێتەوە کە لە مێشکی تۆدا بووە. مەترسی ئەو وێنەیە لەو کاتەدا زیاد دەکات کە بیروبۆچوونی ئەو کەسە لە بارەی ئەو شوێن و رووداوانەی کە هەرگیز نەیبینیوە و نایشیبینێ بەو شێوەیە دەبێ کە وێنەکە مەبەستێتی و لە ئاکامدا رەفتار و هەڵوێستەکانی لەمەودوای بە شێوەیەکی ئایدۆلۆژییانە لەسەر ئەو شێوە وێنانە بەندە کە لە مێشکیدا چەسپیوە.

فەزای وێنە وەك فەزایەکی بەرجەستەکراو تەنها سنووردار نەکراوە بە بەرجەستەکردنی ئەو پەیامەی کە دەینێرێ، بەڵکو هەوڵدەدات بە خەیاڵی کەسی وەرگریش بەرجەستە بکات، بەوەی شێوە یان وێنەیەکی دیاریکراو بەسەریدا دەسەپێنێ ئەمەش بەپێچەوانەی حاڵەتی گوێگرتنە لە رادیۆ، چونکە لە حاڵەتی گوێگرتن بۆ رادیۆ خەیاڵ ئازاد دەکرێ و بە هەموو شێوەیەك بواری وێنە دروستکردنی لە مێشکی خۆیدا پێدەدرێ، کەواتە لە جیهانێکی وێنە دروستکردنی بێ

سنووردا دەژی. بەمەش مەترسی گوتاری وێنەیی لەو توانایەوە سەرچاوە دەگرێ، کە مێشك بۆ خۆی رادەکێشێ و وێنەی ناو مێشکی مرۆڤ تووشی گۆڕان دەکات، واتە ئەو وێنە و زانیارییەی کە لە بارەی شتێك هەتە دەیگۆڕی بۆ زانیاری و شتی دیکە، بەمەش وێنە دەتوانێ کاریگەری لەسەر بینەر هەبێ بە نەهێشتنی وێنەیەك لە مێشکی بینەرداو فریودانی رووکەشی بە وێنەیەکی نوێ کە دوورە لە واقیعەوە، بەڵام دەتوانێ بڕوا بە بینەر بکات، ئەمەش رۆڵی مەترسیداری وێنەی تەلەفزیۆنیمان پیشاندەدات لە بواری پڕوپاگەندە و سیاسەت و رێکلامی بازرگانیدا. (دۆبریە) لە بارەی شارستانێتی وێنە و جیهانگیریی تەلەفزیۆن دەڵێ: "وەکچۆن چاپەمەنییەکان رەهەندێکی نەتەوەیی بوو، رادیۆش رەهەندێکی کیشوەری بوو، ئەوا تەلەفزیۆن رەهەندێکی جیهانی هەیە، ئەمە لە رووی تێکنەلۆژییەوە راستە، بەڵام لە رووی کۆمەڵایەتی و ژیرییەوە راست نییە، چونکە تەلەفزیۆنی جیهانی باوەڕی بە یەکێتی مرۆڤایەتی لەمیانەی کۆکردنەوەی هەموو بینەراندا نییە. لە رۆژئاوا بەتایبەتی و لە ژێر تێڕوانینماندا، جوگرافیایەکی نامۆ دروستدەکات لەمیانەی هاوپەیمانێتییەکی راستەوخۆ لە نێوان شتە گشتگیر و ناوخۆییەکاندا، کەواتە لەگەڵ یەکبوونێکی شتە جیهانی و ناوخۆییەکاندا". تەل و وێستگە هەرێمییەکان یان ئەوانەی کە سەر بە گرووپەکانن و ئەو تەلەفزیۆنە تازەیەی کە پێی دەڵێن تەلەفزیۆنی دراوسێ یان تەلەفزیۆنی کارلێککردن، ئەمانە هەموو یارمەتیدەرن بۆ هەڵوەشانەوەی ئەو پەیوەندییە گەورانەی کە لە رابردوودا دروستکراون لە نێوان تاکەکەس و مرۆڤایەتیدا، وەك نەتەوە و چین و حزب و قوتابخانە و دەوڵەت و سوپاو یاساو کۆمار...هتد.

## دوارۆژی جیهانگیریی میدیا:

پرسی میدیا لە وڵاتانی جیهانی سێیەم چەندین ناکۆکی و پرسیار دەورووژێنێ کە لە دەوروبەرە دواکەوتووەکەی و لەو واقیعەیدا، کە هیچ پێکەوە بەستنێکی بە چەمکی میدیاوە نییە سەرچاوە دەگرێ، ئەم واقیعە رووبەڕووی چەندین پرسیارمان دەکاتەوە بەمەبەستی هەوڵدان بۆ ناسین و پێشبینیکردنی دوارۆژی ئەم بوارە کە پێویستی بە دیموکراتیکردنی بارودۆخەکەی هەیە، هەر لە بواری هزرییەوە تاکو بەکارهێنانی ئەو رێگە و ئامرازانەی کە پێویستن هەروەها رزگارکردنی لە هەموو شوێنکەوتەیەکی ناوخۆیی و دەرەکی. جهانگیریەتی وەك دیاردەیەك هێشتا بەپێی تێڕوانینێکی تیۆری بونیات نەنراوە کە مەبەستی دروستکردنی



پێکهاتەیەکی چەمکی و زانستی بێ، بیانووی سەرەکیش بۆ ئەمە ئەوەیە کە پێکهاتەکانی ئەم دیاردە و بۆچوونە تائێستا بێتوانان و لە ئاکامدا ناتوانرێ تیۆری بکرێنەوە. میدیاش لە گۆڕانکارییەکی بەردەوامی گەورەدایە بۆیە ناتوانرێ بە تەواوی لە لایەنەکانی هاوکێشەکە و چۆنێتی کارکردنی بگەی.

**بۆ تێگەیشتن لە سروشتی پەیوەندی نێوان جیهانگیری و میدیا و پێشبینیکردنی دوارۆژی ئەم پەیوەندییە، پێویستە چوار تێبینی رەچاو بکەین:**

- تێبینی یەکەم لە هاوکاتبوونی هەردوو دیاردەکە لە رووی مێژووییەوە خۆی دەبینێتەوە، نەك تەنها لەسەر ئاستی کرداری، بەڵکو لەسەر ئاستی گوتار و نووسینیش. سەرەتای هەشتاکانی سەدەی رابردوو تەنیا بە سەرەتای سەرکەوتنی بیری لیبڕالی نوێ دانانرێ، کە جیهانگیری وەك دەرهاوێشتەیەکی سروشتیو وەرگێڕانێکی تایبەتی، بەڵکو هەروەها بە سەرەتای شۆڕشێکی تەکنەلۆژی فراوان دادەنرێ لە بوارەکانی میدیا و گەیاندندا، کە خێراییەکی باشی بەخۆوە بینی بە هۆی خێرایی لە دۆزینەوە زانستییەکان و پەیڕەوکارییە تێکنەلۆژییەکان و بەلێشاو هاتنی بەرنامە و پڕۆگرامسازییەکان و بانکی زانیارییەکان و داپۆشینی دەورە زەوی بە مانگە دەستکردەکان....تد.

ئەم هاوکاتبوونە لە رووی کردارییەوە لەلایەن وڵاتە پێشکەوتووەکانەوە ئەنجامدرا لە میانەی ئەو سیاسەتانەی کە حکوومەتەکانیان دایانڕشت، کە سیاسەتی ئازاد بوون و کەرتی گەیاندنی کرد بە کەرتێکی تایبەت هەروەها قۆرخکردنی لە بواری زانیارییەکاندا شکاند، بۆیە بزاڤی میدیا و گەیاندن وەها بە خێرایی پێش نەدەکەوت ئەگەر ئەم بیرە نوێیە سەرکەوتنی وەهای وەدەست نەهێنایە کە جهانگیریەتی یەکێك لە لقە سەرەکییەکانێتی.

- تێبینی دووەم خۆی لە ئەو شوێنە دەبینێتەوە کە هەردوو دیاردەکە تیایدا پەیدا ببوون. جەمسەرە پیشەسازییە گەورەکان (وڵاتان و گرووپە ئابوورییەکان و تۆڕە میدیا و پەیوەندییەکان...تد) بوون کە زاراوەی جیهانگیرییان بڵاوکردەوە، هەر خۆیان لە پشت شۆڕشی تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان بوون لە رووی توێژینەوە و پەرەپێدان و دارشتن و پیشەسازیکردن و دابینکردنی ئامێرەکانی بۆ بازاڕ. سەنتەرەکانی توێژینەوەی ستراتیژی ئابووری و سیاسی لە وڵاتانی پێشکەوتوو بوون کە زاراوەی جیهانگیرییان دۆزییەوە و بە تەواوی بەربڵاویان کرد، هەروەك ناوەندە توێژینەوەکان لە بواری تەکنۆلۆژیای میدیا و گەیاندنی پێشکەوتوودا، بەهەمان شێوەش بۆ داڕێژەرانی تۆڕی گەیاندن و بەرنامە زانیارییەکان و ناوەڕۆکە

تەلەفزیۆنییەکان و تەکنەلۆژییە کارلێککەرەکان. مەرجەعییەتی هزریی هەردوو دیاردەکە و باکگراوەندیان لەسەر ئاستی کوولتوری و لەسەر ئاستی نوێنەرایەتی یەك لایەنە، بەواتایەکیتر یەك لایەنیی بیری لیبڕالی نوێ.

– تێبینی سێیەم لەمیانەی ڕەهەندی سوودلێبینی ئەرکیی ئاڵوگۆڕییەوە لە نێوان دیاردەی جهانگیریەتی و ئەو بازدانە میدیاییەی ئەم دوو دەیەی کۆتاییەدا دەتوانرێ هەستی پێ بکرێ. جهانگیریەتی (وردتر بڵێین، ئامرازەکانی؛ وەك (بانکی نێودەوڵەتی و سەندوقی دراوی نێودەوڵەتی و ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی و ڕێکخراوی نێودەوڵەتی بۆ گەیاندن و ڕێکخراوی جیهانی بۆ خاوەندارێتی پیشەسازی و بیریی و...تد)، شۆڕشی میدیایی بۆ بڵاوکردنەوەی بیروبۆچوون و بڕیار و پەیامەکەی بەکارهێنا، لەسەر ئاستی جیهانی لەمیانەی پەخشکردنی تەلەفزیۆنی لەسەرتاسەری جیهاندا، هەروەها لەمیانەی بانکی زانیارییەکان کە تۆڕەکانی زانیاری و مانگە دەستکردەکان پەخش و بڵاوی دەکەنەوە. لەبەرابەردا میدیا و گەیاندن (کۆمپانیای ئامێرەکان و دارێژەرانی بەرنامە و ناوەڕۆکەکان و دروستکەرانی کەرەستەکان و وەگەڕخەرانی تۆڕەکان...تد)، جیهانگیرییان وەك ئامرازێکی نموونەیی بەکارهێنا بۆ بڵاوکردنەوەی کاڵاو خزمەتگوزارییەکانیان. بۆ نا؟ لە کاتێکدا دەسەڵاتی جیهانگیری بازاڕەکانی بۆ دەکرێتەوەو قۆرخکراوەکان و کۆتوبەندە گومرکییەکان دەشکێنێ و توانای گواستنەوەی بۆ ئاسان دەکرێ لە کەشوهەوا نیشتیمانییەکاندا کە بەرە بەرە دەبنە کەشوهەوای بازرگانی و ئابووری یەکگرتوو، کەواتە یەك ئامانجی و هەماهەنگییەك لە بەکارهێنانی ئامرازو قازانجێکی هاوبەشی هەیە.

– هەبوونی هەمان بۆچوون یان یەکبوون لە بۆچووندا لە نێوان جیهانگیری و میدیادا، بە بۆچوونی جیهانگیری دەبێ جیهان ببێتە یەك شێوە لە ڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە، هەروەها بە بۆچوونی شۆڕشی میدیا و گەیاندن دەبێ جیهان لە ڕووی میدیا و کوولتورەوە ببێتە یەك، کەواتە جهانگیریەتی لە هەوڵی دروستکردنی کەشوهەوایەکی ئابووری و کۆمەڵایەتی جیهانی یەکگرتوودایە، کە شمەك و خزمەتگوزارییەکان تیایدا بگوازرێنەوە وەکچۆن لەناو یەك نیشتیماندا دەگوێزرێنەوە، هەروەها میدیا لە هەوڵی ئەوەدایە هەموو کوولتور و تایبەتمەندییەکان بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە، لە پێناو دروستکردنی ئەو ڕەوشە جیهانییە یەکگرتووە. لە نێوان ئەم دوو بۆچوونەدا دەبینین زۆر لە ئابووری و وڵات و کوولتور و کۆمەڵگەکان بە بەردەوامی بەربەستیان بەرابەر ئەو دوو جۆرە هەوڵانە لاواز دەبێ، بۆیە



پێویستە لەو میکانیزمانە تێبگەین کە ئەم دوو دیاردەیە بەڕێوە دەبەن، هەروەها پێویستە لە شێوازی ئیشکردنیان تێبگەین بە بەکارهێنانی ئامرازی زانستی ڕاست و دروست، دوور بێ لە هەموو هێرشێکی نابەجێ بۆ سەریان کە وامان لێبکات ڕاستییەکان بە تەواوی نەبینین و بابەتیانە تەماشای بابەتەکە نەکەین.

ئەو کۆمەڵگە میدیاییەی کە لە سێبەری جیهانگیریدا وڵاتە گەورەکان باسی لێوە دەکەن بریتییە لە قۆناغی دوای سەردەمی کۆمەڵگەی بەکاربردن، کە لەم سەردەمەدا فرەرەگەزنامەیی هاتە ئاراوە یان بریتییە لە ٣٠ ساڵی دوای جەنگی جیهانی دووەم. کەواتە کۆمەڵگەی میدیایی بریتی دەبێ لەو کۆمەڵگە بەکاربردنە نوێیەی سەردەمی جهانگیریەتی یاخود ئەو تایبەتمەندی و ئاکار و پاڵ پێوەنەرەی دەبێ. کۆمەڵگەیەك دەبێ بێ لەسەر ژێرخانێکی فراوان و خێرا دامەزرا، کە دامودەزگا خێزانی و فێرکاری و تەندروستی و کارگێڕی و بەرهەمهێنەرەکان بە یەکەوە دەبەستێتەوە، لە ئەنجامیشدا کارکردن و فێربوون و چارەسەرکردن و کاریگەری نواندن لە داڕشتنی بڕیارەکان لە دوورەوە دێنە ئاراوە. ئینتەرنێت و بازرگانی ئەلیکترۆنی دەروازەیەك دەبێ بۆ ئەم کۆمەڵگەیە، بەڵام بەگوێرەی داتاو لێکۆڵینەوەکان دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە گەیشتن بە شێوازی ئایندەیی ئەو کۆمەڵگەیە لەکاتێکدا دەبێ، کە هەموو پێکهاتە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان پێکەوە گرێبدرێن بە هۆی پێکهاتەیەکی تەکنەلۆژی فراوان و خێراو پێکەوەبوو، کە گەرەنتیکەری کارلێککردنی تەواوی ئەمپەڕو ئەوپەڕی ئەو پێکهاتەیە بێ، ئەمەش لەوانەیە زیاتر لە دە ساڵی پێویست بێ. میدیا توانی سەرجەم ئەو سنوورە دەستکردانە تێپەڕێنێ کە مرۆڤایەتی خولقاندی و کردییە خاڵی جیاکردنەوەی نێوان وڵاتانی دونیا توانی بە هەموو بزاوتە جیاجیاکانی مرۆڤایەتی ئاشنا بێت، بەمانایەکیتر میدیا بۆتە ژێدەری کۆمیونیکەیشن و پەیوەندی نێوان مرۆڤ و مرۆڤایەتی، مرۆڤ و جیهان، عەقڵ و تەکنیك، کار و زانیاری، مانەوە و فێربوون، کلیك و شارەزابوون، زەوی و فەزاو زۆر شتیتر. سەرەڕای هەموو ئەو کار و فرمانە مرۆڤایەتیانە کە میدیا گێڕاویەتی لە ڕەخنە و کەموکورتی دوور نییە، هەر لە بێ لایەنییەوە تا دەگاتە ئاستی کارکردن لە پێناو ڕاستیدا، نەشیتوانیوە هەموو ڕاستییە پەنهانەکان ئاشکرا بکات لە کاتێکدا یەکێك لە ئەرکە گەوهەرییەکانی میدیا ئاشکراکردنی ڕاستییە.

زۆرجار لەم سەردەمەدا میدیا بە ئامرازی داگیرکاری وڵاتان پێناسە دەکرێ، بەو مانایەی کە بەخواست و ناخواست دەچێتە هەموو ماڵێکەوە و کاریگەری لەسەر هەموو ئەو کەسانە

دادەنیێ کە کاتەکانیان بە ئامرازەکانییەوە دەگوزەرێنن، زۆرجاریش ئەو دەزگا میدیایانە کۆنترۆڵکراوی دەزگا سیخوڕی و دامەزراوە نهێنییەکانن. جیهانگیری سەلماندی زۆربەی ئاژانسەکانی هەواڵ سیخناخکراوی ئەو دەزگایانەیە، ئەو دەزگایانەش هەریەکەو ئۆرگان و وابەستەی ئاسایشی نەتەوەیی وڵاتێکە. میدیا ئەگەر باش بەکاربهێنرێو بە شێوەیەکی راست ئاراستە بکرێ دەتوانێ رۆڵی گرنگ لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگەدا بگێڕێ و بە کردەوە دەسەڵاتی چوارەم بێ، میدیاش وەك هەر کایەیەکی تری کۆمەڵگە پێویستی بە زەمینەی لەبار و بیری میدیایی واقیعبین هەیە تا بتوانێ خۆی بسازێنێ و ئەو زەمینە و بیری کارکردنە پراکتیزە بکات، بەشێك لە خودی ئەو زەمینە لەبارکردنەش راستەوخۆ دەکەوێتە ئەستۆی بوارەکانی میدیا خۆی، چونکە میدیا و میدیاکاران بە لەبەرچاوگرتنی ئازادییە رۆژنامەنووسییەکان و تێگەیشتنی واقیعی لە ئەرك و مافەکانی بواری میدیا، بەرچاو روونتر دەبن لە گەیاندنی راستییەکان کە رووبەروویان دەبنەوە.

جیهانگیریی میدیا بەدرێژایی رۆژگار ریشەی خۆی دادەکوتێ و دەبێتە بەشێك لە واقیعی جیهانی، یەکێك لە کۆمپانیا ئەمەریکییەکان باس لەوە دەکات کە لەداهاتوویەکی نزیکدا مرۆڤ دەتوانێ سەد کەناڵی تەلەفزیۆنی بەروونی ببینێ لە کاتێکدا لەبەرابەر کۆمپیوتەرەکەیدا دەبێ، ئێستا تاقیکردنەوەی پەخشی تەلەفزیۆنی تایبەت بە ئینتەرنێت هەیە (کە بە شێوازێکی پێشکەوتوو نییە وەك تەلەفزیۆنی ئاسایی). ئەگەر زۆربەی ئەو گۆڕانکاریانەی کە ئەمڕۆ دەیبینین، بە هۆی شۆڕشە تەکنەلۆژییەکان لە بواری گواستنەوە و گەیاندن و دروستکردنی زانیارییەکاندا هاتبنە ئاراوە، ئەوا فشاری کات و شوێن بەمشێوە سەرسوڕهێنەرە لەلایەن میدیاوە جیهانی هەموو هێناوەتە بەرچاو و دەستی مرۆڤی سەدەی بیست و یەکەم وای لێکردووە خەونی گەورەتر ببینێ ؛ ئەویش بە بەراوردکردنی بارودۆخی خۆی لەگەڵ بارودۆخی خەڵکیتر بە شێوەیەکی بەردەوام. لێرەوە، ئەو تەنگژەی کە ئێستا دەوڵەت پیایدا تێپەڕ دەبێ و ئەو چەمکانەی کە پەیوەندییان پێوە هەیە وەك سەروەری و دەسەڵات و شتی دیکە، تەنها هۆیەکەی جیهانگیریی ئابووری نییە، بەڵکو جیهانگیریی میدیاشە.

تێکەڵاوبوونی سێ بازنەی (رۆژنامە، رادیۆ و تەلەفزیۆن) کە لەرابردوودا سەربەخۆ بوون، بەرەبەرە بوونە بازنەیەکی زل کە زەحمەتە لە نێویدا کوولتوری جەماوەری یان گەیاندن یاخود میدیا جیا بکرێتەوە، کاریگەر دەبێ لەسەر ئەوەی نیشتیمانی بێ یان لۆکاڵی، چونکە جیهانگیری لە بنەڕەتدا جیهانگیری ئامرازەکانی میدیای جەماوەری و ئامرازەکانی گەیاندن و



هەواڵەکانە، ئەمەش وایکردووە ئامرازەکانی میدیا یاری بە ژیانی سیاسی بکەن هێندەی ئەوەی سیاسی یاری پێ بکات، بەمەش چەمکی (دەسەڵات) ئاوەژوو دەکاتەوە و وای لێدەکات (بەپێی دەربڕینی جۆرج بالاندیە) ملکەچی تەکنۆلۆژیای رووخسارەکان بێ. بۆیە ئەمڕۆ هەموو لایەنەکان لەناو کۆمەڵگە (لە تاکەکان و سەنتەری فشار و دەزگا ناحکوومییەکان و پیاوانی خاوەنکار و سیاسییە بەرهەڵستکارەکان) دەیانەوێ ببنە خاوەنی بنەماکانی یارییەکە و بەپێی توانا سوود لە دەسەڵاتی میدیا وەربگرن، ئەویش بە خاوەنداریبوونی نهێنییەکان لە میدیا و گەیاندندا، چونکە کۆمەڵگەی هاوچەرخ چیتر بە کۆمەڵگەیەکی میدیا نەماوە بەڵکو بۆتە ئاراستەکراوێکی میدیایی و ئەمڕۆ تاك و دامەزراو و بزاڤ و چالاکییە ناحکوومییەکان لەگەڵ دەوڵەتدا رکابەری دەکەن لە هەژموونداریییان بۆ پرسە گەرمەکان و رکابەری دەکەن لە پیشاندانی بۆ بەردەم جیهان لە رێگەی ئامرازەکانی میدیا و گەیاندنەوە، لەبەر ئەوەی ئامانجە مرۆیەکان پەیوەست نییە بە شوێنێکی دیاریکراو بۆیە پرسی سەروەرێتی هەرێمی هێندە جێی بایەخ نەما، چونکە ئەم ئامانجانە پێویستی بە جۆرە سەروەرێتییەکی ترە ئەویش خاوەنداربوونی ئامرازەکانی میدیایە بەتایبەتی بینراو لە رێگەی ئاسمان و مانگە دەستکردەکانەوە. دەسەڵاتی داهاتوو دەسەڵاتی ئەوە دەبێ کە خاوەنی زانیاری بێ، نەك جبەخانەی جەنگی یان سەرمایەداری مرۆیی یاخود سامانی سروشتی یان ئەوانەی کە ئەمڕۆ بە فاکتەری خۆشگوزەرانی و گەشەسەندن لە سەردەمی ئاشتی و کارتی فشار لە سەردەمی ناهەمواریدا دایدەنێن.

ئەم سەردەمە ژمارەییە لە کرۆکیدا خەونێکە لە ناو خەوندا، بەڵام دوارۆژ دەبێتە خەونێکی زیندوو، چونکە ئابووری داهاتوو ئابوورییەکی نا ماددی دەبێ و واقیعی گریمان بۆ کراوە و دەق و ئاڵوگۆڕەکانی داهاتووش دیجیتاڵی دەبێ. سەدەی نوێ بەپێچەوانەی سەدەکانی پێش خۆی، رکابەرییەکان لە سەرمایەداری ماددییەوە گواستراوەتەوە بۆ سەرمایەداری زانیاری، بۆیە زانیاری و زانین و توێژینەوەی زانستی بایەخی خۆیان پەیدا کردووە، بۆ نموونە ویلایەتە یەکگرتووەکان ٣٪ی بودجەی وڵاتی بۆ توێژینەوەی زانستی تەرخانکردووە، کە لە بودجەی وڵاتانی ئەفریقا زیاترە. ئایندەی ئامرازەکانی میدیای نێودەوڵەتی نادیارە، چ لە بارەی گۆڕانی تەکنۆلۆژیاوە یان سەبارەت بە رۆڵی بێ سنووری لە بواری سیاسەتی ئابوورییەوە، لێشاوی بەردەوامی هەواڵی جیهانی بە درێژایی ٢٤ کاتژمێر لە رۆژێکداو گەیشتنی لەوپەڕی خێراییدا بۆ شوێنی جیاجیای جیهان، هۆکارێکە بۆ گۆڕانی گێتی و روانینی ئێمە بۆ جیهان. کێرڤو

ئاماژەکان ئەوە دەخەنەڕوو کە لێشاوی میدیا بەردەوام ڕوو لە زیادبوونە، زۆربەی هەواڵەکان ئیدی بەرەو باکوور یان باشوور، ڕۆژهەڵات یان ڕۆژئاوا ئاراستە دەکرێن، نەتەوەکانیش ئیدی نەك هەر پێشوازی لە هەواڵ دەکەن، بەڵکو هەواڵیش دەنێرن. ڕۆژنامەنووسانی ئەکادیمی و هی دیکەشی بایەخ بە پاراستنی جۆرایەتی ڕۆژنامە دەدەن، بەها باوەکانی ئازادی و سەربەخۆیی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان لە جیهاندا درێژەیان دەبێ و دەمێننەوە، کە ئیدی لە دایکبوونی دەزگای میدیای فرەرەگەز دەبینێ، کە بە شێوەیەکی سەرەکی بایەخ بە وەدەستهێنانی قازانج دەدات لە پرۆژەی کات بەسەربردندا (وەك بەرهەمهێنانی بەرنامەی کێبرکێ و کامێرای شاراوە و بەرنامەی هەمەڕەنگ)، بە جۆرێك پێویستمان بە ڕێکخستنی کاری ئامرازەکانی میدیای نێودەوڵەتی دەبێ، بۆ ئەوەی نەبێتە هەڕەشەیەك بۆ سەر ئازادی دەربڕین، یان ئازادی بازاڕی میدیا سەرکوت بکات.

هاوکاری و کێبرکێی نێوان ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان (چ لۆکاڵ بن یان جیهانی) بەڵگەی ئەوەیە هاووڵاتیان لە خۆئامادەکردندان بۆ پێشوازیکردن لە هەواڵ و زانیارییەکی گشتی و چاك. ئایندەی سەرکەوتنی ئامرازەکانی میدیای نێودەوڵەتی بەندە بە ئابووری بەهێزی جیهانەوە، کە ئەویش لەلای خۆیەوە بەندە بە ژمارەی ئەو کەسانەی لە نێو نەتەوە جیاجیاکاندا دەتوانن پشتگیری دیموکراتییەت و کرانەوە لە نێو کۆمەڵگە و بازاڕەکانی ئابووریدا بکەن، کە پێویستە هەڵسوکەوت تێیدا بە یاسا و ڕێسا بێ. بازدان بە نێو کەناڵەکاندا، خۆشی خێراو وێنەیەك جوڵاو و وروژاندنی هەمیشەیی، کورتترین ماوەی سەرنج ڕاکێشان، جیهانێکە زیاترین خراپەکانی ئەوەیە کە بێزارکەر بێ، ئەوەی جێی مەترسییە لەم ڕۆشنبیرییەدا ئەوەیە پەیوەندییە مرۆڤییە ڕاستەوخۆکان کە پڕ بوون لەئارامی و خۆشەویستی و سۆزو کۆمەڵگەکانی مرۆڤایەتیان بەدرێژای چاخەکان پێکەوە دەبەستەوە، ئێستا بەرەو دواوە دەگەڕێتەوە پەیوەندییەکی تەمومژاوی کە فەزای ئەگەر جێگەی دەگرێتەوە. لە واقیعدا بازاڕیش بەتەنیا نەماوەتەوە لە دیاریکردنی پێوەرە تەلەفزیۆنییەکاندا- لەگەڵ چەند بوونێکی دەگمەندا، بەڵام ئێمە بەکردەیی بزانین یاخود نا، دەچینە ناو جیهانێکی تازەوە کە ناوی "جیهانی ئەگەرییە" کە بوارت پێدەدات بچیتە ناو جیهانێکی وەهمییەوە.

ئێستا کۆمەڵگە بەگشتی بەویستی خۆی بێ یاخود لە ژێر کاریگەری پرۆسەکانی داشۆرینی مێشکدا بێ، تەبەننی ڕۆشنبیرییەکی بۆش دەکات و وای لە مرۆڤ کردووە لەم چرکەیەدا بژی و وەك چرکەیەك کە بێ لایەن بێ لەوەی پێش ئەو هەبووە و لەوەش پاش ئەو دێتە پێش. ئەم



حەزە لە وازهێنان لە خود و لە لێپرسراوێتی بریتییە لە مەرجێکی حەتمی بۆ هاتنەدی خۆ سەپاندن و دیکتاتۆرییەت، وەك (موسیس فاینلی) دەڵێ "ئایدۆلۆژیای چینی بە دەسەڵات لە پشتییەوە هیچ سوودێك نییە مەگەر لەلایەن خەڵکی ژێر دەسەڵاتیانەوە قبوولبکرێ"، واتە ئێمە خۆمان بە دەستی خۆمان دەسەڵات بەدەستە ستەمکارەکان دروستدەکەین، بەمشێوەیە پەراوێزی دیموکراسی دەگۆڕێ بۆ بۆشیی و ملکەچکردن و پاشەکشە تەشەنە دەکات. پشتبەستن بە شاشە ئەلیکترۆنییەکان بەشێکە لە شتێکی هەرە گەورە کە ناوی تەشەنەکردنی ژیاری تەکنۆلۆژیایە، زۆرێك دەترسن لەوەی کە ئەم ژیارە وێکچوونێکی قرکەری لێ بەرهەم بێت و هەڕەشە لەنەمانی ڕۆشنبیرییە خۆماڵییەکانیش بکات، ئەو شوێنەی تیایدا دەژین (دابونەریت و مێژوو) شوێنەوارێکی مەزنی تیاماندا بە جێهێشتووە، تەنانەت ئەگەر خۆشمان پێی نەزانین، کاتێك پێمان دەگوترێ ئێمە وێکچووین ئەوکات خۆبەخۆ بۆ بناغەی جوگرافی و کۆمەڵی هۆزایەتی خۆمان دەگۆڕێین و بەدەوریدا دەخولێینەوە تا ئەوکاتە هەست بە ئەندامبوونمان دەکەینەوە، ئەوەش یارمەتیمان دەدات لەسەر تێگەیشتن لە هۆکارەکانی زیندووبوونەوەی پشتگیری ڕەچەڵەکیمان لە سەردەمی جیهانگیریدا، کە دەبوایە بەربەست و سنووری نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگە مرۆییەکانی نەهێشتایە، ئەم جیهانە دابەشمان دەکات بۆ خاوەنی زانیارییەکان و بێبەشیشە لێیان، بە شێوەیەك هەڕەشە لە بنەماکانی دیموکراسییەت و بەها لیبراڵییەکان دەکات، ئەو بنەما و بەهایانەی کە ناوەڕۆکی گوتاری سەردەمی جهانگیریەتی و زانیارییەکان و شۆڕشی تەکنۆلۆژیا پێکدێنێ.

کاریگەری ئەم گۆڕانە بەدواییەکدا هاتووانە لە وڵاتانی جیهانی تازە گەشەکردوودا بە شێوەیەکی گشتی و وڵاتانی ئێمە بە شێوەیەکی تایبەتی لە دوو ئاراستەی دژیەکەوە دەچێ، لەلایەکەوە ئامرازەکانی میدیا پەراوێزێك لە ئازادی و دیموکراسییەتی پێشتر نەبوومان پێ دەبەخشن کە دەرخەری هۆشیاری نوێی حکومەتەکان ناکات، بەڵکو پێویستی مامەڵە لەگەڵ سروشتی سیستمی میدیای نێودەوڵەتی نوێ داوای لێدەکات. لەلایەکیترەوە توند بە قووڵدا چوونە لە بە شوێنکەوتەیی میدیاییداو لە هەژموونی ئەو تاك جەمسەرییەی هەوڵدەدات بۆ قەرزکردنی تێڕوانین و بەهای خۆی بەسەر گشت گەلانی جیهاندا.

**ئەم پێکەوە نەگونجانە ناچارمان دەکات بە هۆشیارییەکی گەورەترەوە مامەڵە لەگەڵ دەوروپشتماندا بکەین و بۆ ئەوەی بە کەمترین زیان لەم ڕەوشە ڕزگار بین، تەنها دوو ڕێگا لەبەردەماندا هەیە:**

یەکەم: بریتییە لە کارکردن بۆ زیاتر هاوکاریکردنی یەکتر و لەسەر هەر دوو ئاستی دوو قۆڵی و کۆمەڵی، لە پێناو دامەزراندنی تەکەتولێکی رۆشنبیری و میدیایی کە سنوور بۆ شوێنەواری نێگەتیڤی هەژموونی تاك جەمسەری دابنێ.

دووەم: میدیامان لەسەر بناغەی (میدیا لە پێناو گەشەکردن) دابمەزرێ، بەئامانجی بەشداری لە بەرزبوونەوەی کۆمەڵگە و گەشەپێکردنی لە رێگەی هاندانی جەماوەری خوێنەر و بیسەر و بینەر، تاکو هەست بە ئاستی مەترسی گرفتەکانی گەشەکردن بکەن و بیریان لێ بکەنەوە و پاڵیان پێوەبنێن رووەو داهێنانی ئەو چارەسەرانەی دەبنە هۆی دەرچوون لەو بازنە بەتاڵەی دواکەوتن، کە لە چوارچێوەیدا زۆربەی کۆمەڵگەکانمان ژیان بەسەر دەبەن. دەبێ ئەمە لەسەر بە زۆرلێکردنی دەسەڵاتی نەبێ، بەڵکو لەسەر پابەندبوونێکی پیشەیی و ئیرادەیەکی نیشتیمانی ئازادی ئامرازەکانی میدیا بێ و لە درکپێکردنی حاڵەتەکانی کۆمەڵگەکانمان و بارودۆخی تایبەتیمانەوە هەڵبقوڵێ.

تەکنۆلۆژیا تابلۆی خۆی وەك بەهەشتێکی بەڵێن پێدراو پیشاندەدات، بەدڵنیاییەوە هەندێکمان دەڕۆین بۆ جیهانی نوێ، هەندێکیش بۆ هەتا هەتایی دەکەونە تاریکییەکانی دواکەوتن. لەم جیهانەدا رێگەیەك نییە بۆ ژیان مەگەر بە مامەڵەکردن لەگەڵی و بە زمانی خۆی نەبێ، لەبەردەمماندا رێگەیەك نییە بۆ هاتنەدی هیچ راپەڕینێکی چاوەڕوانکراو، مەگەر بە تێکەڵبوون لەگەڵ ئەم جیهانەدا لە پێگەی کەسێکی ئازادی پشتبەستوو بە رۆشنبیری خۆی و بە ساغڵەمی کۆمەڵگەکەی نەبێ، چونکە بزاوتی مێژوو بەردەوام بەرەو پێشەوە دەڕوات و دان بە تەمبەڵەکان یاخود ملکەچ و ئەوانەی بارن بەسەر خودی خۆشیانەوە نانێ.

# بەشی شەشەم

## میدیای کوردی و جیهانگیری

"ئێمـە لەبـەردەم هـاتنی لێـشاوی تـەکنۆلۆژیادا تـەنها جەسـتەمان بـۆی کراوەتەوە نەك عەقڵ"

(مهاباد قەرەداغی)

ئەگەر بە تێڕوانینی زۆر لە پسپۆران، رووخانی بلۆکی کۆمۆنیست و هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت سەرەتای قۆناغی پێگەیشتن و فراوانبوونی جیهانگیری بێ، ئەوا کوردیش لەوکاتەوە بە شێوەیەکی باشتر لە رابردوو توانی لە نێوەندە نێودەوڵەتییەکاندا بوونی خۆی بسەلمێنێ و دەروازەیەك بدۆزێتەوە تا لێیەوە هەناسەی لێوە. جیهانگیریەتی کاریگەری زۆری لەسەر نەتەوەی کورد لەسەرجەم بوارەکانی ژیاندا هەبووە، بەتایبەتی لە رووی گەیاندنی ئەو مەینەتی و کارەساتانەی کە بەسەریدا هاتووە، ئەگەر بچووکبوونەوەی جیهان نەبوایە کە خۆی لە جیهانگیری دەبینێتەوە، رەنگە تائێستاش مەینەتییەکانی کورد هەر لەو چوارچێوە بچووکە بمابایەوە کە پێشتر تێیدا بوو، بەهەمان شێوە وا بەئاسانیش دەنگی نەدەگەیشتە هەموو شوێنێك.

نووسین لە بارەی جیهانگیری، یان دەچێتە چوارچێوەی لایەنگرانییەوە (لیبڕالە نوێیەکان و ئینتەر ناسیۆنالیستەکان)، یاخود دەچێتە چوارچێوەی نەیارانییەوە (دەوڵەتگەراکان، رادیکاڵەکان و گۆڕانکاریخوازەکانی جیهانی) و نووسینە پەرش و بڵاوە کوردییەکانیش لەمبارەیەوە تا ئێستا ویستوویانە بە یەکێك لەم دوو ئاراستەیە بچن. هەڵسەنگاندنی دۆخی ئەمڕۆی کورد و تاوتوێکردنی نەتەوە بێدەوڵەتەکان لە سەردەمی جیهانگیریدا، ناکرێ بگوترێ کە ئەم نەتەوە بێ دەوڵەتانە تووشی چ زیانێك دەبن بەپێچەوانە ئەگەر ئامادەی گۆڕانکارییەکانی سەردەم بن، بە لەبەرچاوگرتنی تواناو لێهاتووەکانیان و خۆیان هیلاك بکەن بۆ دەستکەوتەکانی جیهانگیریەتی، دەتوانن ئەنجام و بەرهەمێکیان هەبێ، گۆڕانکارییەکان لە تەواوی کایەکانی ژیان لە کوردستان لەئارادایە، ئەم گۆڕانکارییانەش سیاسەتێکی جیهانی دەخوازێ.

لە نێوان سوود و زیانی ئەم دیاردەیە، کێشەی راستەقینە لە جیهانگیریەتی کوولتووردا نییە، بەڵکو لە تێگەیشتنی کوولتوری جیهانگیریدایە، پێویستە متمانە بە خۆمان پەیدا بکەینەوە لەوەی شارستانییەتێکی دێرینمان هەیەو نابێ هەست بە ترس بکەین لە کوولتورەکانی تر، بەڵام پێویستە ئەوەی دەشێ بگۆڕدرێ لە کوولتورەکەمان بیگۆڕین هاوکات بە بنەما چەسپاوەکانیشی پابەند بین، بۆ ئەم مەبەستە دەبێ میدیا بخەینە خزمەت کوولتورەکەمان. پرسیار ئەوەیە، ئێمە لە کوێی پێشکەوتنی زانست و تەکنۆلۆژیاین تا ئەم ساتە، کە لەوانەیە داهاتوو گەورەتر بێ؟ ئێمە لە کوێی ئەم بوارە گەورەیەی چوارچێوەی



مەعریفەو رۆڵەکەیداین؟ وەك (مهاباد قەرەداغی) رووناکبیر دەڵێ: "ئێمە لەبەردەم هاتنی لێشاوی تەکنۆلۆژیادا تەنها جەستەمان بۆی کراوەتەوە نەك عەقڵ" واتە نەمانتوانیوە بە شێوەیەکی گشتی لۆژیکیانە گۆڕانکارییەکەمان وەرنەگرتووە. کەواتە دەکرێ بڵێین ئێمە هێشتا نەچووینەتە نێو ئابووری زانیارییەوە و تەنیا رۆڵی وەرگرێکی سەلبی دەبینین و نەمانتوانیوە بەپێی پێویست بەروبوومی دەسکەوتەکانی شۆڕشی تەکنیکی و زانستی و تەکنەلۆژی بچنینەوە، لە کاتێکدا وڵاتە پێشکەوتووەکان لە دڵی ئەوەی ناودەبرێ بە (قۆناغی دوای پیشەسازی) دایە. هێشتا کوولتوری گۆڕانکاری و خۆگونجاندنی لەگەڵ پێداویستییەکانی پەرەسەندنی مەعریفی نەگەیشتۆتە کۆمەڵگەکەمان، لە کاتێکدا چوونمان بۆ نێو (ئابووری زانیاری)یەوە تاکە رێگەی سەرکەوتنمانە لە رووبەڕووبوونەوەی ململانێیەکانی سەردەم و شوێن پێ قایمکردنمان لە نێو گەل و نەتەوەکاندا.

## وەرچەرخان لە میدیای کوردستاندا

لە دوای راپەرینی ساڵی ١٩٩١ی خەڵکی کوردستانی باشوور، هەلێکی زێڕین بۆ ئازادییەکان هاتە پێش و بەرەو رووی دونیای نوێ و تازەگەریدا کراینەوە، ئەو شتانەمان کەوتە بەردەست کە هەرگیز بیرمان لێ نەکردبووەوە، پێشوازیمان لە هەموو شتەکانی سەردەم کرد و ئامادەباشی خۆمان بۆ گۆڕان لە رووی ماددییەوە راگەیاند، یەك لەو دامەزراوانەی بووژانەوەیەکی گەورەی بەخۆوە بینی، دامەزراوەی میدیا بوو بە هەموو جۆرەکانییەوە، لە رووی گەورەبوون و بەرفراوانبوونی رایەڵەی میدیا، کردنەوەی دەرگاکان بەرووی جیهانداو گەیشتنی شەپۆلی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیای سەردەم بۆ کوردستان. هەرچەندە ئەو مێژووە هاوکات بوو لەگەڵ گۆڕانکارییە گەورەکانی جیهان و سەرهەڵدانی سیستمی نوێ و جیهانگیری، بەڵام میدیای کوردی تا ماوەیەکی زۆر لە فۆرمە کۆنەکەیدا مایەوە و چەند دەزگایەکی میدیا دامەزرا، هەرچەندە رووبەر تەسك و خۆماڵی و پەخشیان کورت بوو، بەڵام دواتر پەرەی سەند و بووە کەناڵی ئاسمانی کە دەروازەیەکی گرنگ بوو بۆ کرانەوە بە رووی جیهان کە ئێستا خاوەنی چەندین کەناڵی ئاسمانی و دەیان کەناڵی ناوخۆیین.

دامەزراوەکانی میدیای کوردی دەروازەیەکی گەورەیان خستە سەر پشت و هەنگاوی یەکەمیش لە دروستکردنی رایەڵەی جیا جیا بوو، ئەوەش بووە مایەی ئەوەی کۆمەڵگە زیاتر بکرێتەوە و هەنگاوی باش ببڕێ بە بوونی فەزایەکی کراوە بۆ دیالۆگێکی جدی لە نێوان

کۆمەڵگە خۆی لەلایەك و لە نێوان حزب و دەسەڵات و جەماوەر لەلایەکی دیکە، ئەمەش بووە هاندەرێك کە کۆمەڵگەیەکی ژیرو وریا و بەشدار لە راپەڕاندنی دامەزراوەکانی حزب و دەسەڵات و جەماوەریش خۆیان رای جیاواز و تایبەتیان هەبێ، بە هەبوونی پێشنیاز و داخوازی دەسەڵات و لێپرسراوانیش بخەنە بەردەم چەندین پرسی چارەنووسساز کە دەرەنجام کۆمەڵگە لە رێگەی بیرورا گۆڕینەوە دیالۆگ داخوازییەکانی دەهێنێتە دی و دەزگاکانیش وەك دەزگای رۆشنبیری و میدیا دەبن بە ئامراز و خاڵی پەیوەندی نێوان خەڵك و دەسەڵات.

لەم رۆژگارەی کە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی تێیدا تێپەڕ دەبێ قۆناغێکە تا بڵێی هەستیار و لەهەمانکاتدا لە بارە بۆ هەنگاوی زیاتر بۆ خۆناساندنی زیاتر لە پێناوی بەدەستخستنی داوا رەواکاندا، بەتایبەت میدیا وەك پەرگالێك بەکارهێنانی بۆ ئێمە پێویستە و میکانیزمێکی باشە بۆ گەیاندنی پەیامی ئازادی و داواکان. لەگەڵ ئەوەی بوونی تەکنیك و تەکنۆلۆژیای سەردەم زەمینەکەی لەبارترو ئاسانکاری زیاتری بۆ رەخساندووین، کە سنوور لە کارەکاندا نەناسین و رووداو و پێشکەوتنەکان لە کورتترین ماوەدا بە شوێنی پێویست بگەن. کۆمەڵگەی کوردستانی نزیکەی دەیە و نیوێکە لەسەرجەم بوار و کەناڵەکانی ژیانیدا بە ئەزموونێکی تایبەتدا تێدەپەڕێ و هەنگاوی ورد بەرەو خۆناسینی پترو راستکردنەوەی بەشێکی هەڵەکانی پێشووی دەنێ و بەنیازە لەسەرجەم کایەکانی ژیانیدا پێ بنێتە قۆناغێکی نوێوە. بۆ ئەم مەبەستە میدیا لەلایەکەوە رۆڵێکی بەرچاو و گرنگ دەبینێ لە بەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنبیری و هۆشیاری تاکەکانی توێژگەلێکی فراوانی کۆمەڵگە و فاکتەرێکی گرنگە بۆ دەربازکردنیان لە پاشماوەکانی ئەو کۆڵەوارییەی تێیدا دەژین ئەگەر ئاراستەیەکی بنیاتنەری هەبێ، لەلایەکی دیکەش رۆڵی رووخێنەر دەبینێ ئەگەر لە دەرەوەی ئەم ئاراستەیەدا هەنگاو بنێ، کە ئەمەشیان بۆ رۆڵی تێکڕای کەناڵەکانی میدیا دەگەڕێتەوە.

میدیا بە سەرجەم بوارەکانییەوە دەروازەیەکی کاریگەرە بۆ گەیاندنی مەعریفە و پەروەردەکردنی نەوەیەکی چاو کراوە بۆ داهاتووی هەر کۆمەڵگەیەك، بە مەرجێك سیاسەتێکی زانستیانەی بنیاتنەر پەیڕەو بکرێ و میدیا لە دۆخی (میدیا تەنیا بۆ میدیا) بەرەو ئاقارێکی ئامانجدار بەرێ، کە ئەویش میدیا لە پێناو پەروەردە و هۆشیارکردنەوە و پێگەیاندنە. لەم دۆخەی کوردستاندا میدیا پێویستە خاوەن پەیامێکی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی بونیاتنەر بێ و لەپاڵ سەرجەم دەزگا پەیوەندیدارەکانی دیکەی دەوڵەتدا بەشێك لە بەرپرسیارێتی بگرێتە ئەستۆ و ئەو رۆڵە بونیاتنەرە ببینێ، زۆرجاریش پێویستە رێخۆشکەر بێ بۆ هێنانە کایەی



گۆڕانە ئەرێنییەکانی کۆمەڵایەتی و رۆشنکار و دەستپێشخەر بێ لە بەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنبیری و هۆشیاری تاکەکاندا.

هیچ میدیایەك لە جیهاندا نییە ئامانجدار نەبێ، ئامانجەکانی میدیا لەهەر کۆمەڵگەیەکدا پابەندن بە ئایدۆلۆژیا و سیاسەت و بەرژەوەندییەکانی چینی باڵادەست و دەسەڵاتدار، کەواتە جۆری ئامانج و سنوور و ئاراستەکەش بەگشتی لەلایەن ئەو دەسەڵاتەوە دەستنیشان دەکرێ و چییەتی ئەو دەسەڵاتەش دەستنیشانی چییەتی میدیا و ئامانجەکانی دەکات، هەروەها شێوازی کارکردنی بۆ گەیشتن بە هێنانەدی ئەو ئامانجانە دەستنیشان دەکات، لێرەدا دەردەکەوێ کە کامە کەناڵی میدیا و تا چ ئەندازەیەك لە بەرژەوەندی کۆمەڵگەدایە، بەوەی هۆشیارکەرەوە و بونیاتنەرە یان رووخێنەر و گومڕاکەر. لەوانەیە بوونی ئەو هەموو میدیایە لە کوردستان کەشێکی تازەی هێنابێتە کایەوە، بەڵام تائێستا پێداویستییەکانی مرۆڤی کوردی پڕ نەکردۆتەوە، چونکە بەشێکی گەورەی کۆمەڵگەی کوردی نەخوێندەوارە و ئەوەشی خوێندەوارە مەرج نییە رۆژنامە بخوێنێتەوە یان سەیری ئینتەرنێت بکات، بۆیە کاریگەرترین جۆری میدیا، میدیای بینراو و بیستراوە.

کەناڵە ئاسمانییە کوردییەکانیش رۆڵی گەورەتریان هەیە لە ئاگادارکردنی خەڵك، بۆ نموونە رۆژانە هەواڵی کوردستان دەگەیەنێتە جیهان و کوردانی تاراوگە سوودی زۆری لێ دەبینن، بەهەمان شێوە کەناڵە سەتەلایتەکان هەواڵ و پێشهاتی کوردانی تاراوگەش دەگەیەنێتە خەڵکی کوردستان و کەسوکاریان، بەمجۆرەش سەرەڕای دووری ماوەی نێوان هەردوولا، بەڵام بەردەوامبوونێك لە نێوانیاندا هەیە و پەیوەندییەکە درێژەی هەیە، هاوکات بەهۆیەوە کوردی تاراوگە توانیویانە تارادەیەکی باش پارێزگاری لە ناسنامە و کوولتوری خۆیان بکەن ئەمەش پێچەوانەی ئەو بۆچوونانەیە کە پێیانوایە جهانگیریەتی سڕینەوەی ناسنامە و کوولتوری نەتەوایەتییە. پرۆژەی میدیا بەبێ هەبوونی سیاسەتێکی کوولتوری نابێتە پرۆژەیەکی فەرهەنگی ئەفراندنی بەرفراوان و لە سنووری کێبرکێی ئایدۆلۆژیانەی تەسکەوە دەربازی نابێ. دەبێ میدیای کوردی بەچاوێکی وردبینانەتر لە خۆی بڕوانێ و راشکاوانە ئاماژە بەو دەرفەت و توانایە بدرێ کە ئەمڕۆ لەبەردەستدایە، باش نییە کەناڵە ئاسمانییەکانمان لە ئاست پێشەنگی کردن بۆ رووداو و پێشکەوتنەکان لەدواوە بێ، لەگەڵ بوونی ئەو ئەتمۆسفیرە باش و گونجاوەی لەسەر ئاستی کوردستان و رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا رەخساوە، هەڵدانەوەی پەراوێکی نوێ پێویستە بۆ میدیای کوردی بە مەبەستی بوون بە پێشەنگ بۆ گەیاندنی رووداوەکان.

## ئینتەرنێت .. دەرکەوتەی نوێ:

لەگەڵ بچووکبوونەوەی دونیا و تێکئالانی کێشەکانی و پابەندبوونی ئێمە و کێشەی میللەتەکەمان بە زۆر لە ولاتانی جیهان، وایکردووە پێویست بکات هەمیشە ئاگامان لە گۆڕانکارییە تازەکانی جیهان بێ، باشترین رێگە و پێشکەوتووترین هۆکاریش بۆ ئەمە لەم سەردەمەی ئێستادا، ئینتەرنێتە. ئەم تەکنۆلۆژیا پێشکەوتووە زۆر بە زوویی و بەئاسانی هەواڵ و گۆڕانکارییەکانی هەموو دونیا لە شاشەیەکی بچووکدا کۆدەکاتەوە، دەتوانین بڵێین ئێستا ئینتەرنێت یەکێکە لە پێداویستییەکانی ژیان لە پاڵ ئاو و هەواو خواردندا. بەو پێیەی کوردیش یەکێکە لەو گەلانەی کە لەو سەرزەمینەدا ژیان بەسەر دەبات، هەوڵیداوە لە تەکنۆلۆژیاکانی سەردەم سوودمەند بێ، هەرچەندە سەراپای مێژووی کارەسات و نەهامەتی و ناخۆشیو دەربەدەری بووە، بەلام زوو یا درەنگ خۆی گەیاندە ئەم قۆناغە بۆ ئەوەی لەگەڵ رەوتی پێشکەوتن و تەکنۆلۆژیادا بێت.

دەکرێ بڵێین ئەمڕۆ کوردستان پارچەیەکی چالاکە کە هەموو هۆکارەکانی گەیاندنی پێوە لکاوە، بەوەی ئێستا ئینتەرنێت بۆتە پێویستییەکی وا کە لە زۆربەی دامودەزگا حکوومی و حزبی و ئەهلییەکان و رێکخراوە مەدەنییەکان و زانکۆکانی کوردستان و تەنانەت ماڵاندا بەکاردێ و کەم کەس هەیە وردە زانیارییەکی نەبێ لە بارەی ئینتەرنێت، لەهەمانکاتدا ئەو کەسانەش کە تائێستا بەکاریان نەهێناوە لەبەر نەخوێندەواری یان بایەخ نەدان بەم لایەنە یاخود نەبوونی دەرفەت بۆ بەکارهێنانی دەگەڕێتەوە. نەخش و کاریگەری ماڵپەرو رۆژنامە ئینتەرنێتییەکان بەسەر شانۆی رووداو و ململانێیەکانی نێوان جەماوەری کوردستان و دەسەلاتەوە، هەرچەندە سنوورداریش بێ لە بەرژەوەندی خەڵکدا وەخۆ کەوتووە. ئەم دیاردە نوێیە کە وەکو پانتایی و کەناڵێك بۆ ئازادی بیروڕا دەربڕین و نووسین جێی خۆی لە ناو رۆژنامەوانیو میدیای کوردستاندا کردۆتەوە، هەروەها دەروازەیەکە بۆ بردنەسەری ئاستی هۆشیاری و رەخنە و نارەزایی خوارەوە لەبەرابەر دەسەلاتداو بۆتە بڵندگۆیەکی جەماوەری و ئازاد نەك تەنها بۆ رەخنەگرتن لە دیاردە دزێوەکان، بەڵکو بۆ نیشاندانی بوون و خستنەڕووی هەست و ناخی مرۆڤی ئەم کۆمەڵگەیە بەرابەر جیهان و هەموو پێکهاتە و دیاردەکانی.



سەرەڕای ئەوەی سەرهەڵدانی ئینتەرنێت لە کوردستان مێژووییەکی دووری نییە، بەلام ئەو ئازادی رادەربڕینەی کە لە ناو ماڵپەرە کوردییەکاندا بەدی دەکرێ وایانکردووە هەنگاوێکی خێرا بەرەو پرۆسەی بەدیموکراسیکردنی کۆمەڵگەی کوردی بنێین، ئەگەرچی هەندێ ماڵپەر هەن ئەو ئازادییە بە خراپ و بۆ مەبەستی تایبەت بەکاردەهێنن و رەچاوی پێودانگ و ئاکاری رۆژنامەنووسیانە ناکەن و هەموو سنوورێکیان بەزاندووە و هەندێ کەس و لایەن بۆ مەرامی تایبەتی بەکاری دەهێنن، هەندێجار ئەم سەکۆیە بۆ توانج و جوێن و بەزاندنی سنووری ئازادی بەکاردەهێنن. بەداخەوە زۆر قەڵەم بەدەست و دەنگبێژ لەم ماڵپەرو ژوورانەدا بەناوی ئازادی بیروڕاوە جنێو دەبەخشنەوە و ئازادییەکانی بەرابەریان پێشێل دەکەن، لەو روانگەیەی گوایە خزمەت بە گەلەکەیان و دۆزەکەی دەکەن، لەکاتێکدا پێویستە بۆ شتی زۆر باشترو زۆر رەخنەی دروستکەر بەکاربهێنرێ، بەلام بە شێوەیەکی گشتی ژمارەی بەشداربووانی ئەم تۆڕە لە هەرێمی کوردستاندا رۆژ بە رۆژ دوای لە زیادبووندایە و ئەو پێشکەوتنە خێرایەی لە هەرێمی کوردستان دەبینرێ لە زۆر ولاتی دراوسێ نابینرێ لە رووی سەربەستی بەکارهێنانی ئینتەرنێت. پێموایە ماڵپەرە کوردییەکان نەیانتوانیوە بە شێوەیەکی رێکوپێك کەڵك لە تۆڕی ئینتەرنێت وەربگرن، نەیانتوانیوە ئەو ماڵپەرانە بخەنە گەڕ بۆ بەهێزکردنی پەیوەندیی ناوخۆی کورد لەلایەك و بەهێزکردنی پەیوەندییەکان لەگەڵ جیهانی دەرەوە، لەلایەکی دیکە گەرموگوڕ کردنی فیکرو رۆشنبیری کوردی و کارلێك پێکردنی ئەو رۆشنبیری و فیکرە نەتەوەییە لەگەڵ تەوژمە تازەکانی جیهانی.

بۆ ئەوەی لەم بوارەدا پێش بکەوین پێویستە ئەو توانا مرۆییانە پێش بخەین کە دەتوانن ناوەڕۆکێکی پێشکەوتوو دروستبکەن و پەرەپێدانی بونیاتی ژێرخانی ئینتەرنێت و قەدەغەکردنی قۆرخکردنی خزمەتگوزارییەکان و دابەزاندنی نرخی تێچوون لە دیارترین ئەو فاکتەرانەن کە دەمانباتە قۆناغێکی پێشکەوتووترەوە، بەتایبەتی بۆ فێربوونی ئەلیکترۆنی، بۆیە پێویستە زانیاری پێویست بۆ خوێندن یان مەشقی پیشەیی لە رێگەی ئامرازە ئەلیکترۆنییەکانی وەك کۆمپیوتەر و مۆبایل بگەیەنین بۆ بەزاندنی سنووری کات و شوێن.

## کولتووری کارلێکردن:

سەرەڕای گرنگی تۆڕەکانی دیجیتاڵی و ماڵپەرەکانی ئەلیکترۆنی تاکیی و گشتی، بەلام ناتوانێ رابوونێکی ئەدەبیی کارا بەدی بێنێ و بەردەوام بێ لە گەیاندنی پەیامە میدیاییەکەی،

مەگەر بە هەوڵی گرووپیی لە چوارچێوەی هاوپەیمانێتی نەبێ بە یارمەتی دەوڵەت، یان سوود وەرگرتن لە یارمەتی لایەنەکانیتر لە شێوەی هاوبەشییە کوولتورییەکاندا بە بەرژەوەندی رووناککردنەوەی کۆمەڵگە و هۆشیارکردنەوەی لە رووی میدیایی و کوولتورییەوە، واتە پێویستە ئەم ماڵپەرانە هەماهەنگ بن لە خولقاندنی تۆڕێکی کوولتوری کوردیی هاوبەش، کە هەموو خامە بەرچاو و کاریگەرەکان کۆبکاتەوە لە رووی داهێنان و رەخنەیی و زانستی بە مەبەستی خولقاندنی کوولتورێکی داهێنانکاری.

لە ئەورووپا دەیان کەناڵی ئاسمانی و پرۆگرامی منداڵان تەرخانکراون بۆ بەرەنگاربوونەوەی داهاتوویان، جا لە رووی هەستی نەتەوایەتی بێ یان زانست و تەکنیك، هەوڵدەدرێ برەو بدرێ بە بەهرە و زیرەکی منداڵان و پاداشتکردنیان و فێرکردنی دابونەریت و هەڵسوکەوتی رۆژانەیان لە ناو کۆمەڵگە و خێزاندا، هەر لە باخچەی ساوایانەوە دەستپێدەکرێ، وا لە منداڵان دەکرێ زۆرتر بەپەرۆشەوە بن بۆ بینینی بەرنامەکان. بەپێچەوانەی ئێمەوە، چەند فلیمێکی کارتۆنی زۆر کۆن هەیە و بەردەوام لێ دەدرێتەوە و ناوەرۆکێکی زۆر بێ مانایان هەیە، چەندەها وشەی ناشیرین بەکاردێ کە منداڵان بەئاسانی لاسایی دەکەنەوە. جاروبار شانۆگەری دراماو زنجیرەی کۆمیدی کە جێگای سەرنجی گەورە و بچووکە و بینەر خۆشی لێ دەبینێ، کە راستەوخۆ کاریگەری دەبێ لەسەربیان، بەڵام بەداخەوە، چەندەها وشەی عەرەبی و جنێوی تێدایە کە لە ناو کۆمەڵگە دەوترێنەوە، دەبوایە ئەمە بەهەل وەربگیرایەوە و ببوایە بە کەناڵێك بۆ فێرکردنی وشەی جوان و زمانێکی پاراوی کوردی دوور لە زمانی بێگانە و جنێو.

لە ئەمڕۆی جیهانگیرێیدا، میدیا کاریگەرییەکی بە هێزی لەسەر هەر تاکێکی کۆمەڵ هەیە لە گشت جیهاندا، بۆیە لە وڵاتانی پێشکەوتوو، لە پێشبڕکێیەکی بێ ئەندازەدان، ئەم هەڵە بەلای خۆیاندا بقۆزنەوە بۆ مەبەستی سیاسی، زانستی، کۆمەڵایەتی بەگشتی و نەتەوایەتی بەتایبەتی. بە لەبەرچاوگرتنی وەرچەرخانەکانی دنیاو دیاردە تازەکانی ناو گۆڕەپانی سیاسەتی نێودەوڵەتی و هەرێمی ناوخۆ و ئەو پەرەسەندنانەی بەسەر دۆزی کورددا هاتوون لە هەموو پارچەکاندا، کاتی ئەوە هاتووە کەناڵێکی ئاسمانی کوردی ئەوتۆ دابمەزرێ کە خاوەنی گوتارێکی سیاسی نەتەوەیی، ئاسایش، ستراتیژی بێ و گوتاری لۆکاڵی و حزبی تێپەڕێنێ، لەم کەناڵەدا دەکرێ پانتاییەکی گەورە بۆ مەسەلەکانی ئاسایشی نەتەوەیی کوردی تەرخانبکرێ و هەوڵبدرێ رۆشنبیری باو و باڵادەست لە ناو کۆمەڵگەی کوردی و ئینتیمای تاکی کورد بۆ نەتەوە و وڵات بەهێز بکات، چونکە لە سەردەمی رۆشنبیری وێنەدا تەلەفزیۆن نەك هەر راستییەکان نیشاندەدات، بەڵکو خۆی بۆتە راستی، واتە شت، رووداو و چالاکییەکان با هەبن، بەڵام کە



نیشان نەدرێن وەکو ئەوەی نەبن وایە، ئەوەش وای لە بینەرانی کوردستان کردووە زۆرتر سەیری کەناڵە بیانییەکان بکەن، بەمەش داهاتوویەکی ترسناك چاوەڕێمان دەکات. بۆیە پێویستە:

- هەوڵبدرێ بەرنامەی بەهێز و هاندەر لە کەناڵە ئاسمانییەکان ئامادە بکرێ، کە زۆرتر سوودبەخش بن لە رووی رۆشنبیرکردن و پتەوکردنی هەستی نەتەوایەتی.
- دەستبەرداری بەرنامە و فیلمی کارتۆنی لاواز بێت و هەوڵبدرێ لە ژێر چاودێری پسپۆڕان و خاوەن بڕوانامەی بواری دەروونی منداڵان و هەرزەکاران، لەمبارەیەوە نەخشە دابڕێژرێ و لەسەر بناغەی زانستی پەرە بە پرۆگرامەکان بدرێ و چیتر منداڵان بە نا رێکوپێکی پەروەردە نەکرێن.
- دابەزاندنی دراما و شانۆگەری و بەرنامە بەمەرج بێ، دوور بێ لە وشەی بێگانە و نامۆ بە زمانەکەمان و بەکارهێنانی وشەی ناشیرین، هەوڵدان خستنەڕووی کارەسات و چەرمەسەری سیاسی و کۆمەڵایەتی بەدەست دوژمنانی کوردستان و خستنەڕووی دڕەندەیی و رەگەزپەرستییان لەئاست نەتەوەکەمان.
- وازهێنان لە بڵاوکردنەوەی کلیپی کەم تواناو بێ ئاستی هونەری.
- دروستکردنی سایتی منداڵان لە ئینتەرنێت و دروستکردنی یاری کۆمپیوتەری، کە زۆرتر بۆ کۆکردنەوەی زانیاری بێ لە بارەی کوردستان و مێژووییەکەیەوە و لە قوتابخانەکاندا بڵاو بکرێتەوە.
- دانانی پەیامنێران لە وڵاتان و گواستنەوەی دەنگوباسی نوێ و راستەوخۆ.
- کردنەوەی کەناڵی تایبەت بەموزیکی تێکەڵ لە گۆرانی کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی و ئینگلیزی، تا بەردەوام بینەرانی کورد ئەوداڵی گەڕان نەبن بە دوای کەناڵە بێگانەکان، هەروەها بێگانەش بەکورد ئاشنا بکرێ وەك نەتەوە.
- رێگا بە کەرتی تایبەت بدرێ کە کەناڵی سەربەخۆ دابنێن، بەتایبەتی ئەو کەسانەی خاوەن بەهرەو توانایەکی باشن، کە دەتوانن پەرە بە بڵاوکردنەوەی کوولتور و هەستی نەتەوەیی بدەن.

لەگەڵ ئەوەی لە کوردستاندا هێشتا زۆر کێشەی بنەڕەتی یەکلا نەکراونەتەوە، لەوانە نەبوونی پسپۆڕی شارەزای پێویست، ئامێری پێویست و ئەکسێس بۆ زانیارییەکان و نەبوونی توانای دانیشتوان بەگشتی بۆ بەکارهێنانی ئینتەرنێت و هەبوونی کۆمپیوتەر، سەرباری ئەمانەش کۆمەڵێك رۆژنامە و گۆڤار هەن کە بە هەردوو جۆرە تەقلیدییەکە و ئەلیکترۆنییەکە

بەردەوام زانیاری و هەواڵ بڵاو دەکەنەوە، ئەمەش هێمای دوا نەکەوتنە لە ڕەوتی گۆڕانکارییەکانی بواری ڕۆژنامەگەریی لە جیهاندا. ئێستا لە کوردستاندا لەگەڵ ئەوەی ژمارەیەکی زۆر ڕۆژنامە و گۆڤار بەدی دەکرێن، سەرباری ئەمەش هەر ڕۆژنامەیەك لە پشتییەوە دەزگایەکی چاپ و وەشاندن هەیە و وێبسایت و ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی خۆی هەیە، کە خۆشبەختانە هەندێ لەو ڕۆژنامانە وەرگێڕدراونەتە سەر چەندین زمانیتر، بەتایبەتی عەرەبی و ئینگلیزی. سەرەنجام، برەودانی میدیای نووسراو بۆ میدیای ئەلیکترۆنی، ئینتەرنێت کاریگەر بوو بۆ گۆڕانکاری لەسەر ئاستە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان.

## میدیای کوردستان لە تای تەرازوودا:

ناسنامەی میدیا لە کوردستان هێشتا یەکلا نەبۆتەوە کە لە رووی جۆر و تایبەتمەندییەوە چ جۆرە ناسنامەیەکە، چونکە سەرجەمیان ناوەڕۆکیان گشتییە بۆیە لێکچوونێك لە نێوانیاندا هەیە، ئەم سیما گشتییەش لەبەردەم پێشکەوتنیدا ئاستەنگە و کارێکی ئەستەمە کەناڵێکی میدیا بتوانێ هەموو وەرگرانی رازی بکات یان هەموو خەڵك تێیدا خۆی بدۆزێتەوە، بۆیە دابەشکردنی کەناڵەکان بەسەر جۆری بابەت و چینی وەرگر ئێجگار پێویستە. ئەمڕۆ میدیا لە کوردستان پێویستییەکی زۆری بە پەیامی روونتر و کاریگەرتر هەیە بەئامانجی پەڕینەوە لەم قۆناغی گواستنەوەیە و ناکرێ چاوەڕوانی گۆڕانەکان بکرێ تا خۆی دێ و پێویستییەك دەیسەپێنێ، بەڵکو پێویستە گۆڕانەکان بە بەرنامەی کورتخایەن و درێژخایەن کاری بۆ بکرێ و پلانی داڕێژراو بۆ سبەی هەبێ، تا بزانین میدیای کوردستان بەلای کەم لە دە و بیستساڵی داهاتوو بەرەو کوێ هەنگاو دەنێ و دەگاتە کوێ.

ئێمە تائێستا ئەو دەرفەتەمان بۆ نەڕەخساوە میدیا بگوازینەوە بۆ قۆناغی پیشەسازی و بازاڕی ئازاد لە میدیاش بێتە کایەوە، ئەمەش دەرفەتی نەڕەخساند کە دەزگای گەورەی میدیا لە رووی جۆری دروستبێ، ئەمەش وایکرد کە پێشبڕکێی نێوان میدیاکان پێشبڕکێیەکی ناوخۆیی بێ و بە پێوەری ناوخۆ کار بکات، مەرجیش نییە هەموو کاتێ پێوەری ناوخۆ ئەکتیڤترین و خێراترین پێوەر بێ. ئەم فرەییەی کە لە کوردستاندا هەیە لە زۆری و بۆری کەناڵەکانی میدیا لە هەندێ روو بۆتە هۆی بارگرانی بەسەر کاروانەکە نەك هێزی پاڵپشت کە بەرەو پێشەوەی ببات. لەم ١٧ ساڵەی دواییە لە کوردستان ژمارەیەك میدیاکاری هەڵکەوتووی لێ دروست ببوایە کە ناوبانگی نەك هەر تەنها ناوخۆیی، بەڵکو ناوچەیی و جیهانیشیان هەبوایە.



وەکچۆن لە دە ساڵی رابردوو، کوردستان لە چەند هەنگاوی راگەیەنراو و رانەگەیەنراو کار بۆ گۆڕینی کۆمەڵگە دەکات لە کوولتوری شۆڕشگێرییەوە بۆ کوولتوری دەوڵەت و دامەزراوەیی ئەمەش پلانێکە کارو ئیرادەی دەوێ، میدیاش کە بەشێکی زیندووی کۆمەڵگەیە لەو هەنگاوانە نابێ بەدەر بێ، ریزی یەکەمی هەڵسوڕێنەرانی زۆربەی میدیاکانی کوردستان بەهەموو رەنگەکانییەوە، بەتایبەتی میدیا حزبی و رێکخراوەییەکان لە پێشمەرگە و ئەندامانی دێرینی حزبە سیاسییەکانی کوردستان پێکهاتووە، بۆیە گوتاری سیاسی و شۆڕشگێری بەسەر کاری میدیاکان زاڵە چ راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، هەتا ریزی دووەم و خوارتریش لە میدیاکان ئەوانەی لە نەوەکانی دواتریشن زێتر ئەم کاریگەرییەیان بەسەر دیارە.

ئەوەی ئەمڕۆ بە شێوەیەکی گشتی لە میدیای کوردستاندا دەبینرێ، سەرباری ئەو هەموو توانا ماددیانەی بۆی دابینکراوە، بە شێوەیەکی گشتی هێشتا کەمتەرخەمە و وەکو پێویست بەرپرسیارێتی نەگرتۆتە ئەستۆ و خاوەن پرۆسەیەکی رۆشنبیری ئاکار رۆشن و دیار نییە، بە ئاراستەیەك هەنگا و دەنێ کە زیاتر ئاکاری وروژێنەرو بەکاربەری پێوە دیارە، ئەمەش خوێنەری سەرلێشێواو دروستدەکات نەك خوێنەرێکی چۆنایەتی هۆشیار.

میدیای کوردی هێشتا نەگەیشتۆتە ئاستی ئەوەی دوو جۆر لە گوتار لێك جیا بکاتەوە، گوتارێك بە ئاراستەی ناوەوە و یەکێکیتر بە ئاراستەی دەرەوە. ئێمە گوتارمان هەیە بە ئاراستەی ناوەوە، بەڵام هێشتا گوتارمان نییە بە ئاراستەی دەرەوە، تائێستا میدیایەکمان نییە بە ئاراستەی جیهانی دەرەوە کە ئەرکی ناساندنی دۆزی کورد، بەتایبەت ئەو تاوانانەی لە دژی میللەتەکەمان ئەنجامدراون بخاتە سەرشان و کاری بۆ بکات، چونکە پەڕاندنەوەی ئەو تاوانانە بۆ ناوەندی سیاسی و کوولتورییەکانی جیهان، یەکێکە لە ئەرکە هەرە گرنگەکانی میدیای کوردی.

هەروەها میدیای کوردی نەیتوانیوە ببێتە سەرچاوەی هەواڵ بۆ ناوەندەکانی میدیای جیهان، بۆیە هێشتا نەبوونەتە خاوەن میدیایەکی سەربەخۆ و جدی، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نائارامی سیاسی و تێنەگەیشتن لەو کارانەی میدیای حزبی بەجێی دەهێنێ و دواتر ئەو ئامانجانەی میدیای کوردی ناپێکێ کە جیاوازن لە ئەرك و ئامانجەکانی میدیای حکوومی سەربەست و جدی، بەو مانایەی رووبەرێکی شیاویان لە سەربەستی رادەربڕینیان بۆ زامن بکات.

میدیاکانمان هەندێجار هەنگاوی جوان دەنێن، لەپاڵ ئەوەشدا هەنگاوی نەشازو چەواشەش دەنێن، ئەوان هێندەی کۆمەڵگەی پاشاگەردانی میدیای دونیا و ناوچەکە و کوردستانی گرتۆتەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی یەك گۆشەنیگا هەیە ئەویش تێکەڵاوکردنی گشت کاغەزەکانە بە چەواشەیی، سەرەنجام میدیا هەنگاوی تاکی کەسەکانە و پاشتر دەبێتە رۆڵبینینی ئەو کەسانە دواتر دەگاتە خەڵك و مێشکیان دەهاڕدرێ. شۆڕشی زانیاری گەیاندن بەخەڵك دەبێ بەرپرسانە بێ، رۆڵی میدیا گەیاندنی راستییەکانە بە ئاراستەی ماقووڵ و خزمەتکردن دوور لە هەڵەشەیی و شکاندنی دەستکەوتەکان، دەزگاکانی میدیا دەبێ بوار بڕەخسێنێ بۆ هاوڵاتیان تا بتوانن درێژە بە دیالۆگەکانیان بدەن بەو مەرجەی لە چوارچێوەی ئاکاری رادەربڕین و رۆژنامەوانی لانەدرێ، تاکو میدیا نەبێتە ئامێر و فاکتەری هەڵگەڕانەوەی راستییەکان و تێکوپێکدانی شیرازەی کۆمەڵگە و شکاندنی پیرۆزییەکانی دەستکەوتەکان.

گرفتێك کە میدیای کوردی پێوەی دەناڵێنێ ئەوەی کە خەڵك و دەزگاکانی میدیا تەنها خۆیان دەبینن و لە نێوان هەنگاوی تاك و کۆدا نازانن بە چ هەنگاوێ بێنە مەیدان. بەداخەوە ناتوانین ئەو کۆمەڵگە تەندروستانە بنیاتبنێین و بتوانین دیالۆگێکی جدی بێنینە ناو کۆمەڵگە و ئەوان خۆیان لە دەرەوەی دەستکەوتەکان نەبینن و هەموو دەستکەوتەکانی کوردیش هی هەموو بۆ چینێك یان گرووپ و حزبێك دیاری ناکرێ.

**بۆ ئەکتیڤکردنی میدیای کوردی پێویستە رەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکرێ:**

- وێستگەکانی کەناڵە ئاسمانییەکان بە شێوەیەکی تەواو بەرنامەکانی لە بارەی پرسی کورد بە زمانی بیانی بەتایبەتی ئەوروپی پەخش بکات و ئاراستە بێ بۆ رای گشتی لەو وڵاتانە.
- بەشداریکردن لە بەرنامەی کەناڵەکانیتر لەلایەن رۆشنبیرانەوە بۆ زیاتر ناساندنی پرسی کورد.
- هەواڵە کوردییەکان بدرێ بە ئامرازەکانی میدیای ئەوروپی و بیانی.
- دۆزینەوە و بەگوڕخستنی کادیرانی میدیای کوردی و بەئەکادیمی کردنیان.



## سەرچاوەکان


- ابراهيم درديري، لغة الإعلام اليوم، دار العلوم للطباعة و النشر، الرياض، ١٩٩٨.
- بيل جيتس، المعلوماتية بعد الأنترنت، ت: عبدالسلام رضوان، سلسلة عالم المعرفة، الكويت، ١٩٩٨.
- د. حنان يوسف، تكنلوجيا الأتصال و مجتمع المعلوماتية، ط٢، اطلس لنشر و الأنتاج الأعلامي، القاهرة، ٢٠٠٦.
- خيري خليل الجمايلي، الإتصال و وسائله في المجتمع الحديث، الأسكندرية، المكتب الجامعي الحديث، ١٩٩٧.
- سوزان القليني، تكنلوجيا الأتصالات و نظم المعلومات، دار النهظة العربية، القاهرة، ١٩٩٩.
- فاروق سيد حسين، الشبكة العالمية للمعلومات، مكتبة الأسرة، الهيئة العامة للكتاب، القاهرة، ١٩٩٨.
- د. مؤيد عبدالجبار الحديثي، العولمة الأعلامية و الأمن القومي العربي، ط١، الدار الأهلية للنشرو التوزيع، عمان، ٢٠٠٤.
- عبدالله زلطة، الإعلام الدولي، دار الفكر العربية، القاهرة ، ٢٠٠٢.
- د. محي محمد سعيد، ظاهرة العولمة الأوهام و الحقائق، دار المطبوعات الجامعية، الأسكندرية، ٢٠٠٤.
- محسن فتحي عبدالصبور، اسرار الترويج في عصر العولمة، مجموعة النيل العربية، القاهرة ، ٢٠٠٢.

- هەندێ ژمارەی رۆژنامەکانی (خەبات، کوردستانی نوێ، کوردستان راپۆرت، چاودێر، ئاسۆ) هەروەها گۆڤارەکانی (رامان، رۆژنامەوان، سەردەم) لەگەڵ هەندێ ماڵپەری ئەلیکترۆنی.